# ڕاڤەی قورئانی پیرۆز

پێشەوای حافز عیمادولدین ئەبولفیدا
ئیسماعیلی کوڕی کەسیری دیمەشقی

## تفسير القرآن العظيم

الإمام الحافظ إسماعيل بن كثير الدمشقي

N
نۆبیا پرێس

٥

# راڤەی قورئانی پیرۆز

## (تفسير القرآن العظيم)

نوسینی

پێشەوای حافز عیمادولدین ئیسماعیل کوڕی کەسیر

بەشی پێنجەم

خانەی نۆبیلیس

ناوی ئینسکلۆپیدیا: ڕافەی قورئانی پیرۆز
بەرگی: پێنجەم
نووسینی: پێشەوای حافز عیمادولدین ئیسماعیل کوڕی کەسیر
وەرگێڕانی: (آل عمران) تاریق نەجیب
(النساء) حەمەمین ئەحمەد بەرزنجی
هەڵەچنینی: هاوڕێ کەمال
قەبارەی پەرتوك: ١٧ ـ ٢٤
ژمارەی لاپەڕەکانی: ٢٩٦
ژمارەی لاپەڕەکانی ئینسکلۆپیدیا: ٦٤٨٠
جێگای بڵاوکردنەوە: بەیروت
خانەی بڵاوکردن و دابەشکردن: خانەی نۆبیلیس
فاکس: ٩٦١ (١) ٥٨٣٤٧٥
تەلەفۆن: ٩٦١ (١) ٥٨١١٢١ ـ ٩٦١ (٣) ٥٨١١٢١
٩٦٤٧٥٠٧٢٨٧٥٠٠
ئیمێل: info@nobilis-int.com
چاپی یەکەم: ٢٠١٢
EAN 9786144031308
ISBN 978-614-403-130-8

## بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## تەواوکەری سورەتی (آل عمران)

﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ
عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ
وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ
وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ
وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾

خوای گەورە ناڕەزایی دەردەبڕێت و بەرپەرچی ئەو کەسە دەداتەوە کە جگە لە ئاینی خوا کە کتێبەکانی پێ ناردووەو پێغەمبەرەکانی پێ ڕەوانەکردووە ئاینێکی تر هەڵدەبژێرێت، ئاینی خواش ئایینی یەك خواپەرستی دوور لە هاوەڵ پەیداکردنە ﴿أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتە هەرهەمووی بە ویست و بەزۆر تەسلیمی خوای گەورەبوون، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ [الرعد: ١٥].

یان دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ يَتَفَيَّؤُا۟ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ [النحل: ٤٨ ـ ٥٠].

ئیماندار بە جەستەو دڵی تەسلیمە بە پەروەردگار، بەڵام بێ باوەڕ بە ناچاری تەسلیمە بە پەروەردگار،کە ئەویش تەسلیم بوونی جەستەیی و ئەو

شتانەیە کە بێ ویستی مرۆڤ خوا ژێرباری کردوون و بە فەرمانی ئەو دەڕۆن بەڕێوەو لێی لانادەن و بەرگری ناکەن.

فەرموودەیەك لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هاتووە کە واتایەکی تری دەخاتەڕوو بەڵام نامۆیە، حافز ئەبو قاسمی تەبەرانی دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی نەرزی عەسکەری بۆی گێڕاینەوە، لە سەعیدی کوڕی حەفسی نوفەیلیەوە، لە موحەممەدی کوڕی موحسینی عوکاشیەوە، لە ئەوزاعیەوە، لە عەتای کوڕی ئەبی ڕەباحەوە، لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێ بێت) دەربارەی ﴿وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾: کە فەرموویەتی: (سەبارەت بەوەی لە ئاسمانەکاندایە ئەوە فریشتەیە، ئەوەشی لەسەر زەویدایە ئەو کەسەیە لەسەر ئیسلامەتی لەدایکبووە، ئەوەشی کە بەنا بەدڵی و ناچاری تەسلیمە بریتییە لەو کەنیزەکانەی لە نەتەوەکانی ترەوە دەهێنرێن و لە کۆت و پێوەندان، دەبرێن بۆ بەهەشت و ئەوان ناڕازی و نابەدڵن).

لە سەحیحدا هاتووە: (پەروەردگارت پێی سەیرە کۆمەڵێك دەبرێن بۆ بەهەشتلە کۆت و پێوەندا) شاهیدی بۆ ئەم بۆچوونە لە ڕوویەکی ترەوە باس دەکەین، بەڵام تەفسیری یەکەمی ئایەتەکە بەهێز ترە.

وەکیع لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: سوفیان لە مەنسورەوە، ئەویش لە موجاهیدەوە بۆی گێڕاینەوە کە ﴿وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾: ئەوە وەك ئەو فەرموودەیەی خوا وایە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ﴾ [لقمان: ٢٥]. هەروەها وتویەتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە، لە ئەعمەشەوە، لە موجاهیدەوە، لە ئیبن عەباسەوە: ﴿وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾ کە وتوویەتی: لەکاتی وەرگرتنی پەیمان و بەڵێنەکەدا، ﴿وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ﴾، واتە لە ڕۆژی قیامەتدا کە خوای گەورە هەرکەس بەپێی کردارەکانی پاداشت دەداتەوە، پاشان فەرمووی ﴿قُلۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا﴾ واتـە قـورئـان، ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ واتە ئەو کتێب و نیگایانەی بۆیان هاتووە ﴿وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ کە بریتین لە نەوە پەرش و بڵاوەکانی یەعقوب کە بە بەنی ئیسرائیل ناسراون و دوانزە کەس بوون ﴿وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ واتە تەورات

و ئینجیل ﴿وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ ئەوەش هەموو پێغەمبەران دەگرێتەوە ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ واتە: بڕوامان بە هەرهەموویان هەیە ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ ئیماندارانی ئەم ئوممەتە بڕوایان بە هەموو پێغەمبەرێکی نێراو، بەهەموو کتێبێکی دابەزێنراو هەیە، بەهیچ شتێکی کافرو بێ بڕوا نین، بەڵکو ئیمانمان بە هەموو شتێك هەیە لای پەروەردگارەوە نێرابێتە خوارەوە، بە هەموو پێغەمبەرێك کە خوا ناردبێتی.

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ﴾، واتە: هەرکەس ڕێگایەکی تر جگە لەوەی خوای گەورە دایناوە هەڵبژێرێت ئەوە لێی وەرناگیرێت ﴿وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾. وەك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە فەرموودەیەکی سەحیحدا فەرموویەتی: (هەرکەس کردارێك ئەنجام بدات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە بەرپەرچدراوەتەوەو وەرناگیرێت) هەروەها ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو سەعیدی مەولای بەنی هاشم بۆی گێڕاینەوە، لە عوبادی کوڕی ڕاشیدەوە، لە حەسەنەوە، لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەو و ئێمە لە مەدینە بووین، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کردارەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێن، نوێژ دەهێنرێت و دەڵێت: ئەی پەروەردگار، من نوێژم، دەفەرموێت تۆ باشیت، پاشان بەخشین دەهێنرێت و دەڵێت: من بەخشینم و خوا دەفەرموێت تۆ باشیت، پاشان ڕۆژو دەهێنرێت و دەڵێت: ئەی پەروەردگار من ڕۆژوم، دەفەرموێت: تۆ باشیت، پاشان هەموو کردارەکان دەهێنرێن و خوای گەورە دەفەرموێت: تۆ باشیت، پاشان ئیسلام دەهێنرێت و دەڵێت: ئەی پەروەردگار تۆ (السلام)یت و، منیش (الإسلام)م، خوای گەورە دەفەرموێت: تۆ باشیت، ئەمڕۆ بەهۆی تۆوە دەبەخشم و بەهۆی تۆوە سزا دەدەم، ئەوەتە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا دەفەرموێت ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾. تەنها ئەحمەد هێناویەتی، ئەبو عەبدولڕەحمانی کوڕی ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عوبادی کوڕی ڕاشید جێگەی متمانەیە، بەڵام حەسەن لە ئەبی هورەیرەی نەبیستووە.

﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ
وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ
أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا
يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ
ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾

ئیبن جورەیر دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی یەزیغی بەسەری بۆی گێڕاینەوە، لە داودی کوڕی ئەبی هیندەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتویەتی: پیاوێك لە پشتیوانەکان مسوڵمان بوو، دواتر پاشگەز بوویەوەو پەیوەندی کردەوە بە بت پەرستیەوە، دواتر پەشیمان بویەوەو ناردی بەدوای هۆزەکەیدا کە لای پێغەمبەری خوا پرسیاری بۆ بکەن ئایا دەتوانێت تەوبە بکات و بگەڕێتەوە؟ ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ ـ تاکو دەگاتە ـ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئیتر هۆزەکەی ناردیان بە دوایداو مسوڵمان بویەوە، هەر بەمشێوەیە نەسائی و حاکم و ئیبن حەبان لە ڕێگەی داودی کوڕی ئەبی هیندەوە گێڕاویانەتەوە، ئیسنادەکەی سەحیحەو، بوخاری و موسلیم ئیخراجیان نەکردووە.

عەبدولڕەزاقیش دەڵێ: جەعفەری کوڕی سولەیمان هەواڵی پێداین، کە حەمیدی ئەعرەج لە موجاهیدەوە بۆی گێڕاینەوە، وتی: حاریسی کوڕی سوەید هات بۆلای پێغەمبەری خواو (دروودی خوای لێ بێت) مسوڵمان بوو، پاشان کافوربویەوەو گەڕایەوە بۆناو هۆزەکەی، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ ـ تاکو دەگاتە ـ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ دەڵێ: پیاوێك لە هۆزەکەی خۆی ئەم ئایەتەی لەبەرکردوو هەڵی گرت و ڕۆشت بەسەریدا خوێندیەوە، حارس دەڵێ: سوێند بەخوا نەمزانیوە تۆ ڕاستگۆیت و، پێغەمبەری خوا لە تۆ ڕاستگۆترە و، خوای گەورەش ڕاستگۆترینی ئەم سیانەیە، دەڵێ: ئیتر حارس گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر و زۆر بەچاکی مسوڵمان بویەوە.

ئەوەشی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟

﴿بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ﴾ واتە بەڵگەکانیان بۆ خراوەتەڕو، هەموو راستیەکانیان بۆ سەلمێنراوە کە پێغەمبەر و ئەوەی بۆی هاتوە راست و حەقە، هەموو شتەکەیان بۆ رونکراوەتەوە بەڵام ئەوان پاشگەز دەبنەوە بۆ ناو تاریکی و بت پەرستی، ئیتر چۆن ئەو کەسانە شایەنی هیدایەتی خوان پاش ئەوەی خۆیان بەرامبەر راستیەکان چاوکوێرکرد و راستیەکانیان بەدرۆدا خستەوە، لەبەرئەوە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾. پاشان دەفەرموێت : ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾﴾ واتە خوای گەورە نەفرەتیان لێ دەکات و، بەدیهێنراوەکانی خواش نەفرەتیان لێ دەکەن، ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَا﴾ واتە لەناو نەفرەتەکەدا، ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ واتە ئەشکەنجەیان لێ دوور ناکەوێتەوە و بۆ ساتێکیش لە سەریان ئاسان نابێت، پاشان دەفەرموێت ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾ ئەمەش لە میهرەبانی و چاکەو بەزەیی و رەحمەتی پەروەردگارەوەیە بۆ بەدیهێنراوەکەی کە هەرکەس بگەڕێتەوەو تەوبە بکات لێی خۆش دەبێت و وەری دەگرێت.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٩١﴾﴾

خوای گەورە بەڵێن دەدات و هەڕەشە دەکات لەو کەسەی پاش بڕواهێنان بێ بڕوا دەبێتەوەو، دواتر بێ باوەڕیەکی زیاتر دەکات، واتە لەسەری بەردەوام دەبێت تاکو دەمرێت، خوای گەورە پێمان رادەگەیەنێت کە ئەو کەسانە لەکاتی سەرەمەرگدا تەوبەیان لێ وەرناگیرێت، وەك دەفەرموێت : ﴿وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ [النساء: ١٨]. لەبەرئەوە لێرەدا فەرموویەتی : ﴿لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ﴾ واتە لە رێڕەوپڕۆگرامی حەق و راستی بەرەو رێگەی گومڕایی دەرچوون.

حافز ئەبوبەکری بەزاز دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی

یەزیغ بۆی گێڕاینەوە، لە یەزیدی کوڕی زەریعەوە، لە داودی ئەبی هیندەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، کە کۆمەڵێك مسوڵمان بوون و دواتر کافربوونەوە، ئەمجا مسوڵمان بوون و جارێکی تر کافرو بێ باوەڕ بوونەوە، ئەوانیش ناردیان بەدوای قەومەکەیاندا تاکو بچن بۆلای پێغەمبەری خوا و پرسیاریان بۆ بکەن، ئەوانیش ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا گێڕایەوە، ئەم ئایەتەی لەسەر هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ﴾. بەم شێوەیە ریوایەتی کردووەو ئسنادەکەی جەیدە.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾ واتە هەرکەس لەسەر بێ باوەڕی مرد هەرگیز هیچ کارێکی چاکەی لێ وەرناگیرێت، ئەگەر چی پڕ بەزەوی ئاڵتون ببەخشێت و واش بزانێت ئەمە لە خوای نزیك دەکاتەوە، هەروەك پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) سەبارەت بە عەبدوڵلای کوڕی جورعان کەرێزی میوانی دەگرت و هاوکاری نەدارانی دەکرد و خواردنی دەبەخشی ئایا ئەو کارانەی سودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: (نەخێر، چونکە ئەو ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیوتوە: خوایەگیان لە ڕۆژی قیامەتدا لە تاوانەکانم خۆش ببە) لەبەرئەوە بێ باوەڕ ئەگەر پڕ بە زەوی ئاڵتون ببەخشێت لێی وەرنەگیراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ﴾ [البقرة: ١٢٣] وقال: ﴿لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ﴾ [إبراهيم: ٣١]،

یان دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [المائدة: ٣٦]. لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾ فعطف ﴿وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾ لەسەر یەکەم، بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەوە ئەو نیە. ئەوەی ئێمە باسمان کرد باشترە لەوەی بوترێت: (واو)ە کە زیادەیە، خوازاناترە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت یان ئەوە دەخوازێت کە هیچ شتێك لە ئاگری دۆزەخ رزگاری ناکات ئەگەر چی هێندەی زەوی ئاڵتون ببەخشێت، واتە بیەوێ بیکاتە فیداو قوربانی رزگاربوونی خۆی با هێندەی کێشی چیاکان و دۆڵەکان و دەشتەکان و بیابانەکانی و دەریاکانی زەوی بێت.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: حەجاج بۆی گێڕاینەوە، لە شوعبەوە، لە ئەبی عیمرانی جونیەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا بە پیاوێکی دۆزەخی دەوترێت: ئایا ئەگەر هەموو ئەوەی لەسەر زەویە هی تۆ بوایە دەتبەخشی لەپێناوی ڕزگارکردنی خۆتدا؟ دەڵێت: بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێ: بەڕاستی من شتێکی لەوە ئاسانترم لەتۆ دەویست، لەپشتی ئادەمی باوکتدا پەیمانم لێ وەرگرتی کە بەهیچ جۆرێك هیچ هاوەڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت، بەڵام تۆ هەر سەرپێچیت کردو هاوەڵت بۆ بڕیاردام) بوخاری و موسلیمیش بەمشێوەیە ئیخراجیان کردووە.

ڕێگەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: روح بۆی گێڕاینەوە، لە حەمادەوە، لە سابتەوە، لە ئەنەسەوە، کە وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (پیاوێکی بەهەشتی دەهێنرێت و خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد، شوێن و ڕێی خۆت بەلاوە چۆن بوو لە بەهەشتدا؟ دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگار بەڕاستی باشترین شوێن و ڕێیە، خوای گەورە دەفەرموێت: داوا بکەو ئاوات بخوازە، دەڵێت: نە داوای شتی تر دەکەم و نە ئاواتیش دەخوازم تەنها ئەوە نەبێت کە بمگێڕیتەوە بۆ دنیا تاکو دەجار لەسەریەك لە پێناوی تۆدا بکوژرێم، ئەمەش پاش ئەوەی پاداشتی شەهیدی بینی. دواتر پیاوێکی دۆزەخی دەهێنرێت و خوای گەورە پرسیاری لێ دەکات: شوێن و ڕێی خۆتت لە دۆزەخدا بەلاوە چۆنە؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگار بەڕاستی خراپترین شوێنە، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا هێندەی ئەوەی لەسەر زەویە ئاڵتون دەبەخشیت لە پێناوی ڕزگارکردنی خۆتدا؟ دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت: درۆت کرد، بەڕاستی من لەمە کەمترو لەمە ئاسانترم داوا لێکردیت بەڵام نەتکرد، ئیتر دەیگێڕێتەوە بۆ دۆزەخ).

لەبەرئەمە دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ واتە هیچ کەسێکیان نیە کە لە ئەشکەنجەو سزای خوا ڕزگاریان بکات و پەنایان بدات لە ئاگری دۆزەخە سەختەکەی

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾﴾

وەکیع لە تەفسیرەکەیدا لە شەریکەوە گێڕاویەتیەوە لە ئیبن ئیسحاقەوە، لە عەمری کوڕی مەیمونەوە کە ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ﴾ واتە: بەهەشتی دەست ناکەوێت، ئیمام ئەحمەد وتویەتی: روح بۆی گێڕاینەوە، لە مالیکەوە، لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو تەڵحەوە، گوێی لە ئەنەسی کوڕی مالیك بوە، وتویەتی: ئەبو تەڵحەی ئەنساری دەوڵەمەندترین پیاوی مەدینەبوو لەسەروەت و ساماندا، خۆشەویسترین سەروەتی لەلای باخی (بیرحاء) بوو، کە لەبەردەمی مزگەوتەکەدابوو، پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لێ بێت) لە ئاوەکەی دەخواردەوەو دەڕۆشتە ناوی و تیایدا دڵخۆش و ئاسودە دەبوو، ئەنەس دەڵێ: کاتێ ئایەتی: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾ هاتە خوارەوە، ئەبو تەڵحە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾ خۆشەویسترین ماڵ و موڵك لای من باخەکەی (بیرحاء)ە، ئەوە صەدەقەو خێرە لەپێناوی خوادا، چاوەڕوانی پاداشت و خێرەکەی لای پەروەردگار دەکەم، کەواتە چۆنت دەوێت وای لێ بکە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بەخ بەخ ئەوە سامانێکی پڕ لە قازانجە، من بیستم تۆ چیت وت لەبەرئەوە پێم باشە بەسەر خزم و کەسوکاردا دابەشی بکەیت) ئەو تەڵحە وتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر هەستا بە دابەشکردنی بەسەر خزمەکانی و ئامۆزاکانیدا. بوخاری و موسلیم ئیخراجیان کردووە.

لە سەحیحەیندا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) بە پێغەمبەری خوای وت (درووودی خوای لێ بێت): ئەی پێغەمبەری خوا هیچ سەروەت و سامانێکم دەست نەکەوتووە لەلام بەنرختر و خۆشەویستر بێت لەو پشکەی لە خەیبەردا بەرم کەوت، فەرمانم پێدەکەیت چی لێ بکەم؟ فەرمووی: (ڕەگ و ئەصڵەکە بێڵەرەوەو بەروبوومەکەی بکە بەخێر).

هەروها حافز ئەبوبەکری بەزاز دەڵێ: ئەبو خەتاب زیادی کوڕی یەحیای

حەسانی بۆی گێڕاینەوە، لە یەزیدی کوڕی هاروونەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەمرەوە، لە ئەبی عەمری کوڕی حەماسەوە، لە حەمزەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە، وتی: عەبدوڵلا وتی: ئەم ئایەتە هاتەوە یادم: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ بیری ئەو شتانەم کەوتەوە کە خوا پێی بەخشیبووم، هیچ شتێکم تێدا نەبینی کە لام خۆشەویستر بێت لەو کەنیزەکە ڕومیەی کە هەمبوو، ئەو ئیتر ئازادە لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار، خۆ ئەگەر من لەشتێك بگەڕامایەتەوە کە بەخوام بەخشی بوو ئەوە ئەو کەنیزەکەم مارە دەکرد، واتە دەمکردە هاوسەری خۆم.

﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُواْ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾﴾

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: هیشامی کوڕی قاسم بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولحەمیدەوە، لە شەهرەوە، وتی: ئیبن عەباس وتی: کۆمەڵێك جولەکە هاتنە لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) و وتیان: سەبارەت بە هەندێك شت قسەمان بۆ بکە کە ئێمە دەربارەیان پرسیارت لێ دەکەین و هیچ کەس ئەو شتانە نازانێت جگە لە پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (دەربارەی هەرشتێك ئارەزوتان بوو پرسیارم لێ بکەن، بەڵام لەبەردەم خوادا پەیمانم پێبدەن، ئەو پەیمانەی یەعقوب لە کوڕەکانی وەرگرت، لەسەرئەوەی ئەگەر دەربارەی شتێك قسەم بۆ کردن و زانیتان و ناسیتانەوە (پێشتر زانیاریتان هەبوو دەربارەی) پێویستە شوێنم بکەون لەسەر ئایینی ئیسلام؟ وتیان: بەڵێ ئەم پەیمانەت دەدەینێ، فەرمووی: کەواتە سەبارەت بەهەر شتێك دەتانەوێت پرسیارم لێ بکەن، وتیان: سەبارەت بە چوار شت هەواڵمان بدەرێ: هەواڵمان پێبدە چ خواردنێك بوو بەنی ئیسرائیل لەسەر خۆیان حەرامیان کردبوو؟ ئاوی ئافرەت و

ئاوی پیاو چۆنە ونێرو مێی چۆن لێ دەبێت؟ هەروەها پێمان بڵێ ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە لە خەودا چۆنەو، چ فریشتەیەك سەرپەرستیاری دەكات؟ ئەویش پەیمانی لێ وەرگرتن كە ئەگەر شتەكانی پێ وتن شوێنی بكەون، فەرمووی : سوێندتان دەدەم بەو كەسەی تەوراتی نارده خوارەوە بۆ سەر موسا، كە ئیسرائیل نەخۆشیەكی سەختی گرت و نەخۆشیەكەی درێژی خایاند، ئەویش نەزری كرد بۆ پەروەردگار ئەگەر خوا شیفای بدات لە نەخۆشیەكەی خۆشترین خواردن و خواردنەوە بەلایەوە واز لێ بێنێت، لەكاتێكدا خۆشترین خواردن بەلایەوە گۆشتی وشتر بوو، خۆشترین خواردنەوەش شیری وشتر بوو) وتیان: سوێند بەخوا بەڵێ، فەرمووی: (خوایەگیان تۆ شاهیدبە بەسەریانەوە) پاشان فەرمووی : (سوێندتان دەدەم بەو پەروەردگارەی كە هیچ خوایەك نیە جگەلەو، ئەو خوایەی كە تەوراتی نارده خوارەوە بۆ سەر موسا، ئایا دەزانن كە ئاوی پیاو سپیەكی تەڵخەو چڕەو، ئاوی ئافرەت زەردێكی ناسكە، هەركامیان سەركەوت بەسەر ئەوی تریاندا منداڵەكە لەوە دەبێت، لەیەك چونیش بە ڕەزامەندی خوایە، ئەگەر ئاوی پیاوەكە سەركەوت بەسەر ئەوی ئافرەتەكەدا ئەوە منداڵەكە نێر دەبێت بە ویستی خوا، وە ئەگەر ئاوی ئافرەتەكە سەركەوت بەسەر ئاوی پیاوەكەدا ئەوە منداڵەكە مێ دەبێت بە ویستی خوا) وتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی : (خوایەگیان تۆ شاهیدبە لەسەریان) پاشان فەرمووی : (سوێندتان دەدەم بەو كەسەی تەوراتی نارده خوارەوە بۆسەر موسا، ئایا دەزانن ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە چاوەكانی دەخەون بەڵام دڵی ناخەوێت؟) وتیان : سوێند بەخوا وایە، فەرمووی : (خوایە گیان تۆ شاهید بە) وتیان : كەواتە تۆ ئێستا باسی سەرپەرشتیارەكەتمان بۆ بكە لە فریشتەكان، ئەگەر ئەمەشت پێ وتین ئیتر یان لەگەڵت كۆ دەبینەوە یان لێت جیا دەبینەوە، فەرمووی: (سەرپەرشتیاری من جیبریلە، وە هەرگیز خوای گەورە پێغەمبەرێكی نەناردووە كە جبریل سەرپەرشتیاری نەبێت) وتیان : ئالێرەدا لێت جیا دەبینەوە، چونكە ئەگەر جگە لە جبریل فریشتەیەكی تر سەرپەرشتیارت بوایە شوێنت دەكەوتین، لەوكاتەدا خوای گەورە ئایەتی : ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ﴾ [البقرة: ٩٧]ی نارده خوارەوە.

بەهەمان شێوە ئەحمەد لە حسەینی کوڕی موحەممەدەوە لە عەبدولحەمیدەوە گێڕاویەتیەوە.

ڕێگەیەکی تر: ئەحمەد دەڵێ: ئەبو ئەحمەدی زوبەیری بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی وەلیدی عیجلیەوە، لە بەکری کوڕی شیهابەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: جولەکەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) و وتیان: ئەی باوکی قاسم، ئێمە سەبارەت بە پێنج شت پرسیارت لێ دەکەین، ئەگەر هەواڵت پێداین سەبارەت بەو شتانە ئەوە زانیومانە کە تۆ پێغەمبەریت و شوێنت کەوتووین، پێغەمبەریش (درودی خوای لێ بێت) ئەوەی ئیسرائیل لە کوڕەکانی وەرگرت ئەمیش لە جولەکەکانی وەرگرت، ئیسرائیل بە کوڕەکانی وت: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ [یوسف: ٦٦]. فەرمووی: (پرسیارەکانتان بکەن) وتیان: سەبارەت بە نیشانەکانی پێغەمبەر هەواڵمان بدەرێ؟ فەرمووی: (چاوەکانی دەخەون، بەڵام دڵی ناخەوێت) وتیان: پێما بڵێ منداڵ چۆن کچ دەردەچێت و چۆن کوڕ دەردەچێت؟ فەرمووی: (هەردوو ئاوەکە بەیەك دەگەن، ئەگەر ئاوی پیاوەکە سەرکەوت بەسەر ئاوی ئافرەتەکەدا نێرینە دەردەچێت، ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە سەرکەوت مێینە دەردەچێت) وتیان: پێمان بڵێ ئیسرائیل چی لەسەرخۆی حەرام کرد؟ فەرمووی: (ئەو نەخۆشی هەبوو، هیچ شتێکی نەبینی بۆی گونجاو بێت جگە لە شیری ئەوەو ئەوەنەبێت)، ئەحمەد دەڵێ: هەندێکیان وتویانە واتە: وشتر - ئەویش گۆشتەکەی حەرام کرد، وتیان: ڕاستت کرد، پێمان بڵێ ئەم هەورە بروسکەیە چییە؟ فەرمووی: (فریشتەیەکە لە فریشتەکانی پەروەردگار و ڕاسپێراوە بە هەورەکان، بە دەستیەوە یان لە دەستیدا شمشێرێك لە ئاگر هەیە پێی دەدات لە هەورەکان و بەرەو ئەو شوێنە دەیان بات کە خوا فەرمانی پێکردووە) وتیان: ئەی ئەو دەنگە چییە کە دەبیسترێت؟ فەرمووی: (ئەوە دەنگی ئەوە) وتیان: ڕاستت وت، ئێستا یەك پرسیار ماوەتەوە، ئەویش ئەو پرسیارەیە ئەگەر هەواڵت پێدان دەربارەی شوێنت دەکەوین، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە فریشتەیەك هەواڵی بۆ نەهێنێت، پێمان بڵێ کێ هەواڵ بۆ تۆ دێنێت و هاوەڵتە؟ فەرمووی: (جبریل (درودی خوای لێ بێت))، وتیان:

جبريل، ئەو فريشتەيەى كە جەنگ و كوشتارو ئەشكەنجە دادەبەزێنێت، ئەوە دوژمنی ئێمەیە، ئەگەر بتوتایە میکائیل کە باران و رەحمەت و روەك دادەبەزێنێت، ئەوە شوێنت دەکەوتین، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾﴾. لەگەڵ ئایەتی دوای ئەم.

ترمزی و نەسائیش لە عەبدوڵلای کوڕی وەلیدی عیجلیەوە بەهەمان شێوەیان گێڕاوەتەوە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی غەربیە، ئیبن جورەیج و عەوفی لە ئیبن عەباسەوە دەڵی ترمزی و نەسائیش لە عەبدوڵلای کوڕی وەلیدی عیجلیەوە بەهەمان شێوەیان گێڕاوەتەوە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی غەربیە.

ئیبن جورەیج و عەوفی لە ئیبن عەباسەوە دەڵێن: ئیسرائیل - یەعقوب (دروودی خوای لێ بێت) بەشەودا نەخۆشی (عرق النسا) (جۆرێکە لە نەخۆشیەکانی پشت) زۆر نارەحەتی دەکرد، نەیدەهێشت خەوی لێ بکەوێت، بەڵام بەڕۆژدا ئازاری دەشکانەو نەدەما، ئەویش نەرزی کرد بۆ خوای گەورە ئەگەر خوا شیفای بدات گۆشتی حوشتر نەخوات.

سەدی و زوحاك بەهەمان شێوەیان وتووە، بەهەمان شێوە ئیبن جەریر لە تەفسیرەکەیدا ریوایەتی کردووەو گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: کوڕەکانیش شوێنی باوکیان کەوتن لە حەرامکردنی دا وەك شوێنکەوتن و چاولێکەری بۆ رێبازەکەی باوکیان، دەڵێ، کە خوا دەفەرموێت: ﴿مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ واتە پێش هاتنە خوارەوەی تەورات ئەمەی لەسەر خۆی حەرام کرد.

وتم: بۆ ئەم بازنەیە پاش ئەوەی کە پێشکەشکرا دوو بۆنە هەیە، یەکەمیان: یەعقوب (دروودی خوای لێ بێت) خۆشەویسترین شتی لە خۆی حەرامکرد لەبەر رەزامەندی خوای گەورە وازی لێهێنا، ئەمەش باوبوە لە شەریعەتی ئەواندا بۆنەی خۆی هەیە لە دوای ئەم وتەیەی خوا کە دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ [البقرة: ٩٢]. ئەمە لەلای ئێمە رەوایە، کە بریتییە لە بەخشین لە گوێڕایەڵی خوادا لەو شتانەی کە بەندە خۆشی دەوێن و حەزیان لێ دەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ [البقرة: ١٧٧]، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ [الإنسان: ٨].

بۆنەی دووەم: کاتێك پێشتر بەرپەرچی گاورەکان درایەوە سەبارەت بەو بیروباوەڕە چەوت و پڕوپوچەی دەربارەی عیسا (دروودی خوای لێ بێت) هەیانبوو، هەروەها حەق و راستی و دڵنیایی لە چیرۆکی عیسا و دایکیدا رون بویەوە، کە چۆن خوای گەورە بەهێزو دەسەڵاتی خۆی و بە ویستی خۆی بەدیهێنا و ناردی بۆ نەوەکانی ئیسرائیل تاکو بانگیان بکات بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنها، عیسا (دروودی خوای لێ بێت) کەوتە بەرپەرچدانەوەی جولەکە - خوا ریسوایان کات - و رونکردنەوەی ئەو بابەتەی کە ئەو سڕینەوە (نسخ)ی کە ئەوان ئینکاریان لەسەر دروستی و رەوایی دەکرد رویدا، چونکە خوای گەورە لە کتێبەکەیاندا کە تەورات بوو تۆماری ئەوەی کردبوو کە نوح (دروودی خوای لێ بێت) پاش ئەوەی لە پاپۆڕەکە هاتە دەرەوە، خوای گەورە هەموو ئاژەڵەکانی سەر زەوی بۆ حەڵاڵ کرد کە لێیان بخوات، پاش ئەمە ئیسرائیل گۆشتی وشترو شیرەمەنیەکانی لەسەر خۆی حەرامکردو کوڕەکانیشی شوێنی باوکیان کەوتن، تەورات هات ئەمەی حەرام کرد، هەندێ شتی زیادەی تری حەرام کرد، پێشتریش خوای گەورە روخسەتی دابوو بە ئادەم (دروودی خوای لێ بێت) کە کچەکانی لە کوڕەکانی مارە ببڕێت، پاشتر ئەمەی حەرام کرد، لە شەریعەتی ئیبراهیمیشدا ژنهێنان بەسەر ژنی یەکەمدا رێ پێدراوبوو، ئیبراهیم (دروودی خوای لێ بێت) ئەم کارەی کرد کاتێك ژنی بەسەر سارەخاتن دا هێنان بەڵام کاری بەمشێوەیە حەرامکرا لەسەریان لە تەوراتدا، بەهەمان شێوە مارەبڕینی دوو خوشك لەیەك کاتدا باوبوو، یەعقوب (دروودی خوای لێ بێت) دوو خوشکی مارە بڕیبوو پێکەوە کۆی کردبوونەوە، پاشان ئەمە لە تەوراتدا لەسەریان حەرام کرا، هەموو ئەمانەش لە تەوراتەکەی خۆیاندا نوسراوە، ئەمەش بریتییە لە نەسخ و سڕینەوەی تەواو، بەهەمان شێوەی تەورات با بۆ مەسیحیش رەوابێت کە خوا ئەم شەرعەی بۆ داناوە لە حەڵاڵکردنی هەندێك لەو شتانەی لە تەوراتدا حەرام کرابوون، ئەی ئیتر بۆچی شوێنی ئینجیل ناکەون، بەڵکو ئەوان بە درۆیان خستەوەو پێچەوانەی جوڵانەوە؟ بەهەمان شێوە ئەو ئاینە تۆکمەو تەواوەی خوای گەورە ناردویەتی بۆ موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) و، ئەو رێبازە راست و دروستەی و، ئەوەی لە ئیبراهیمی باوکیەوە بۆی مابویەوە، ئەی بۆچی

شوێنی ئەمە ناکەون و ئیمان ناهێنن؟ لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ﴾ واتە حەڵاڵ بوو بۆیان، هەموو خواردنەکان، پێش هاتنە خوارەوەی تەورات جگە لەوەی کە ئیسرائیل لەسەرخۆی حەرامی کردبوو، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەم ئایەتە بە ئاشکرا ئەو ڕاستیە دەڵێت کە ئێمە وتمان ﴿فَمَنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩٤﴾﴾ واتە هەرکەس درۆی بەناوی خواوە کرد و بانگەشەی ئەوەی کرد کە خوا ڕێگەی پێداون و داوای لێکردون بەردەوام پابەندبن بە تەوراتەوە، هەروەها بڕوا نەهێنان بەو موحەممەدەی کە بە بەڵگەو سەلماندنەوە بانگەواز دەکات بۆلای خوای گەورە، هەروەها پاش ئەوەی کە لە پێشتردا سەبارەت بە سڕینەوە باسمانکرد، ئەوە ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾. پاشان خوای گەورە فەرمووی ﴿قُلْ صَدَقَ اللَّهُ﴾ واتە ئەی موحەممەد بڵێ خوای گەورە ڕاستی فەرمووە لەوەی کە هەواڵی پێداوەو لە هەموو ئەوەی لە قورئاندا کردوویەتیە یاسا، ﴿فَاتَّبِعُوا مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ واتە شوێنی میللەتی ئیبراهیم بکەون کە خوای گەورە لە قورئاندا لەسەر زوبانی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) ڕەوایی پێداوە، چونکە ئەو ڕێبازە حەق و ڕەوایەو هیچ گومان و دوودڵیەکی تێدا نییە، هەروەها ئەو ڕێبازەیە کە هیچ پێغەمبەرێك بە ڕێبازێکی لەو تەواوتر و ڕون و تۆکمەترەوە نەهاتووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ [الأنعام: ١٦١]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ [النحل: ١٢٣].

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ
آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ
الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ
الْعَالَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾

خوای گەورە هەواڵی ئەوەمان پێدەدات یەکەم ماڵ کە خوای گەورە دانیا

بۆ خەڵکی بەگشتی کە بەندایەتی تێدا بکەن و پەرستشی تێدا ئەنجامبدەن و بە دەوریدا بسوڕێنەوەو، روەو ئەو نوێژ بکەن و، ئیعتیکاف بکەن لەلایدا ﴿لَلَّذِى بِبَكَّةَ﴾ واتە کەعبەیە، کە ئیبراهیمی خەلیل دروستی کرد (دروودی خوای لێ بێت)، کە هەریەك لە کۆمەڵی گاورو جولەکە وا حیساب دەکەن لەسەر ئایینی ئەون و رێبازی ئەو پەیڕەو دەکەن، بەڵام حەجی ئەوماڵە ناکەن کە بە فەرمانی خوا دروستی کردو بانگەوازی هەموو خەڵکی کرد تاکو بێن بۆ حەجکردن، لەبەرئەوە خوا دەفەرموێت: ﴿مُبَارَكًا﴾، واتە کردوویەتیە پیرۆز ﴿وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴾.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: سوفیان لە ئەعمەشەوە بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبراهیمی تەیمیەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، یەکەم مزگەوت کە لەسەر زەویدا دروستکرا چ مزگەوتێك بوو؟ فەرمووی (مزگەوتی حەرام (کەعبە)) بوو، وتی: ئەی دوای ئەوە؟ فەرمووی: (مزگەوتی ئەقسا) وتم: چەندە نێوانیان بووە؟ فەرمووی: (چل ساڵ) وتم: ئەی دوای ئەو؟ فەرمووی: (پاشان لەهەر کاتێك کاتی نوێژ هات نوێژ بکە چونکە هەموو زەوی مزگەوتە) هەروەها بوخاری و موسلیم لە فەرموودەی ئەعمەشەوە گێڕاویانەتەوە.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێ: حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەباح بۆی گێڕاینەوە، لە سەعیدی کوڕی سولەیمانەوە، لە شەریکەوە، لە موجاهیدەوە، لە شەعەبیەوە، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە کە سەبارەت بە فەرموودەی خوا ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا﴾ وتویەتی: پێش ئەو خانوو هەبووە، بەڵام کەعبە یەکەم خانوو بوو کە خوای گەورە بۆ بەندایەتی داینا.

هەروەها باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە حەسەنی کوڕی رەبیعەوە، لە ئەبو ئەحوەسەوە، لە سەماکەوە، لە خالیدی کوڕی عەرعەرەوە، وتی: پیاوێك هەستاو چوو بۆلای عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت)و وتی: ئایا دەربارەی بەیت قسەم بۆ ناکەیت؟ ئایا ئەوە یەکەم خانوو بوە لەسەر زەویدا دروست کراوە؟ وتی: نەخێر، بەڵکو یەکەم خانوو دروستکرا مەقامی ئیبراهیمە کە بەرەکەتی تێدایە، هەرکەسیش چووەتە ناوی پارێزراوو دڵنیا بووە، باسی هەموو هەواڵەکە کراوە لە

باسی چۆنیەتی دروستکردنی کەعبەوە لەلایەن ئیبراهیمەوە (درووودی خوای لێ بێت) و لە سەرەتای سورەتی (البقرە)دا بە دووروودرێژی باسمان کردووەو پێویست ناکات ئێستە لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، بەڵام سەدی پێی وایە کەعبە یەکەم خانووە کەلەسەر زەویدا دروست کرابێت و پێش ئەو خانوو نەبووە، بەڵام قسەکەی پێشەوا عەلی ڕاست و دروستە. بەڵام ئەو فەرموودەیەی بەیهەقی لە کتێبی (دلائل النبوە)دا لە ڕێگەی ئیبن لەهیعەوە گێڕاویەتیەوە، لە یەزیدی کوڕی حەبیبەوە، لە ئەبی خەیرەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە بە مەرفوعی ئەوە فەرمودەیەکی زەعیفە، ئەمەش دەقی گێڕانەوەکەیە: (خوای گەورە جبریلی نارد بۆلای ئادەم و حەوا، فەرمانی پێکردن بە دروستکردنی بینای کەعبە، ئادەمیش دروستی کرد و، پاشان فەرمانی پێکرد بە چواردەوریدا تەواف بکات، پێی وترا: تۆ یەکەم ئینسانیت و، ئەمەش یەکەم خانووە بۆ خەڵکی دروستکراوە).

وەك دەبینیت ئەم فەرموودەیە لە موفرەداتی ئیبن لەهیعەدایەو زەعیفە، خوا زانا ترە. کە ئەمە بەهۆی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە مەوقوف بێت کە لە ڕۆژی یەرموکدا دوو حوشتری گرت بە بارە کتێب و نوسراوی جولەکەکانەوەو دەڵێن ئەمەش لەو نوسراوەی جولەکەکاندا خوێندویەتیەوە.

ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت یەککە یەکێکە لەناوە بەناوبانگەکانی مەککە، وتراوە: بۆیە ناوی نراوە بەککە چونکە گەردنی ستەمکارو خۆبەزلزانەکان دەشکێنێت، بەو واتایەی لەلای کەعبەدا گەردن کەچ و سەرنەوی دەکەن. هەروەها وتراوە: چونکە خەڵکی تیایدا قەرەباڵغی دەکەن و کۆدەبنەوە، قەتادە دەڵێت: خوای گەورە بەهۆی کەعبەوە هەموو خەڵکی پێکەوە کۆ دەکاتەوە، ئافرەتان لە بەردەمی پیاواندا نوێژ دەکەن و ئەمەش لە هیچ شوێن و وڵاتێکی تر ناکرێت، بەهەمان شێوە لە موجاهید و عەکرەمەو سەعیدی کوڕی جوبیرو عەمری کوڕی شوعەیب و موقاتیلی کوڕی حەیانەوە ریوایەت کراوە. حەمادی کوڕی سەلەمەش لە عەتائی کوڕی سائیبەوە باسی کردووە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە وتویەتی: مەککە لە (فج)ەوە بۆ (تنعیم)ە، بەککەش لە (بیت)ەوە بۆ (بطحاء)ە، شوعبە لە موغەیرەوە، لە ئیبراهیمەوە دەڵێت: بەککە بریتییە لە ماڵەکەو لە مزگەوتەکە.

زوهەریش هەروای وتووە. عەکرەمە لە گێڕانەوەیەکداو، مەیمونی کوڕی میهرانیش دەڵێن: کەعبەو ئەوەی لە چواردەوریدایە بەککەیە، ئەوەشی لە پشتی ئەمەوەیە مەککەیە. ئەبو سالح و ئیبراهیمی نەخەعی و عەتییەی عەوفی و موقاتیلی کوڕی حەیان دەڵێن: بەککە شوێنی کەعبەیە، جگە لەو شوێنە هەمووی مەککەیە، زۆر ناویشیان بۆ مەککە داناوە لەوانە: (البکه، البیت العتیق، بیت الحرام، البلد الامین، المأمون، أم رحم، أم القری، صلاح، العرش علی وزن البدر، القاوس)، چونکە مرۆڤ لە تاوان پاك دەکاتەوە، (المقدسه، الناسه، الحاطمه، النساسه، الرأس، الباسه کوثا و، البلده، البینه، الکعبة).

کە دەفەرموێت: ﴿فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٌ﴾ واتە بەڵگەی ئاشکرای تێدایە لەسەرئەوەی کە ئیبراهیم (دروودی خوای لێ بێت) دروستی کردووە، خوای گەورەش رێزو پلەوپایەی لێناوە، پاشان دەفەرموێت ﴿مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ واتە ئەو جێگەیەی لەکاتی بەرزبوونەوەی دیواری کەعبەدا دەچووە سەری و بەردەکانی لە ئیسماعیل وەردەگرت و دایدەنا، ئەو بەردەش نوسابوو بە دیواری کەعبەوە تاکو عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا لێی جیا کردەوەو بردیە لای ڕۆژهەڵاتەوە بەجۆرێك بتوانرێت تەوافی بکرێت و، لەدوای تەواف لەلای مەقامدا جەنجاڵی بۆ نوێژکەران دروست نەبێت، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێکردووین بە نوێژکردن لەلای مەقامی ئیبراهیمەوە (دروودی خوای لێ بێت) و دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البقرة: ١٢٥]. پێشتر لەم بارەیەوە چەند فەرمودەمان پێشکەشکرد کە ئێستا پێویست بە دووبارەکردنەوەیان ناکات، سوپاس و منەت بۆ پەروەردگاری باڵا دەست.

عەوفی لە ئیبن عەباسەوە سەبارەت بە ﴿فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ دەڵێ: واتە لەو بەڵگەو نیشانانە مەقامی ئیبراهیم و مەشعەرە، موجاهیدیش وتویەتی: جێ پێکانی لە مەقامدا ئایەت و نیشانەیەکی ئاشکران، هەر بەمشێوەیە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو حەسەن و قەتادەو سەدی و موقاتیلی کوڕی حەیان و کەسانی تریشەوە ریوایەت کراوە.

ئەبو تالیبیش لە چامە (لامي)یە بەناوبانگە درێژەکەیدا دەڵێ:

وَمَوْطيء إبراهيم فِي الصَّخر رَطْبةٌ
عَلَى قَدَمَيهِ حافيًا غَيْرَ ناعلِ

ئیبن حاتەمیش وتویەتی: ئەبو سەعیدو عەمری ئەودی بۆیان گێڕاوەتەوە، وتیان: وەکیع بۆی گێڕاینەوە، لە سوفیانەوە، لە ئیبن جورەیجەوە، لە عەتائەوە، لە ئیبن عەباسەوە دەربارەی ﴿مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ وتویەتی: حەرەمی کەعبە هەرهەمووی مەقامی ئیبراهیمە، بەڵام دەربرینی عەمر بەمشێوەیە: حیجر هەر هەمووی مەقامی ئیبراهیمە، لە سەعیدی کوڕی خوبەیریشەوە ریوایەت کراوە کە وتویەتی: حەج بریتییە لە مەقامی ئیبراهیم، بەمشێوەیە لە نوسخەکەیدا بینیم، دەشگونجێت حیجر هەرهەمووی مەقامی ئیبراهیم بێت، موجاهیدیش ئەمەی وتووە.

﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾ مەبەست لە حەرەمی مەککەیەو ئەگەر کەسێکی ترساو رۆشتە ناویەوە ئیتر پارێزراو و ئەمینە لە هەموو خراپەیەك، لە سەردەمی نەفامیشدا ئەمە هەر بەمشێوەیە بوو، هەروەك حەسەنی بەسری وجگە لەویش وتویانە: پیاوێك کەسێکی دەکوشت، پاشان دەسماڵێکی خوری دەخستە ملی و دەچوو ناو کەعبەوە، کوڕی کوژراوەکە دەیبینی و قسەی پێ نەدەوت تاکو لە مەککە دەچووە دەرەوە.

ئیبن ئەبی حاتەمیش دەڵێ: ئەبو سەعیدی ئەشبەح بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو یەحیای تەمیمەوە، لە عەتاوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە کە دەربارەی ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾ وتویەتی: هەرکەس پەنا بەکەعبە بگرێت کەعبە پەنای دەدات، بەڵام نە کەس پۆشتە دەکاتەوەو نەکەس تێر دەکات و نەتینوێتی کەس دەشکێنێت، لەگەڵئەوەدا ئەگەر چووە دەرەوە تاوانەکانی بردووە ـ نەیهێشتووە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ﴾ [العنكبوت: ٦٧] هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلْيَعْبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾﴾ [قريش: ٣ ـ ٤]. تەنانەت لە ریزی حەرامکراوەکانی ناو کەعبە حەرامکردنی راوی هەرشتێکە لەناویدا بێت یان بچێتە ئەوێ، هەروەها حەرامی برینی درەخت و هەڵکێشانی گژوگیاکانی، ئەمەش چەندین فەرمودە چەسپاندویانەو لە ژمارەیەك هاوەڵەوە بە (مرفوع)ی و (موقوف)ی گێڕراوەتەوە،

لە سەحیحی بوخاری و موسلیم داو بە لەفزی موسلیم هاتووە کە ئیبن عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا فەرمووی: (ئیتر کۆچکردن نیە بەڵکو جیهاد و نیەت هەیە، ئەگەر داواکران بچن بۆ جیهاد بڕۆن بەدەمیەوە) هەر لە ڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا لە مەککە فەرمووی: (ئەم شارە لەو ڕۆژەوەی خوای گەورە ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوە حەرامی کردووە، ئەم شارە بە حەرامکردنی پەروەردگار حەرامکراوە تا ڕۆژی قیامەت، پێش منیش بۆ هیچ کەس حەلاڵ نەبوو جەنگی تیا بکات، بۆ منیش حەلاڵ نیە تەنها لە ساتێکی ڕۆژدا نەبێت، ئەم شارە بە حەرامکردنی پەروەردگار حەرامە تا ڕۆژی قیامەت).

هەروەها لە بوخاری و موسلیمەوە بە لەفزی موسلیم دەگێڕنەوە لە ئەبی شوریحی عەدویەوە، وتوویەتی بە عەمری کوڕی سەعید کە وەفدی ڕەوانە دەکرد بۆ مەککە: ئەی ئەمیر ڕوخسەتم بدە قسەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە پێغەمبەر لە سبەینێی ڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا فەرمووی و منیش بەر هەدوو گوێم بیستم و دڵم لێی تێگەیشت و چاوم لێی بوو کاتێك قسەکانی فەرموو، ئەوەبوو پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و، پاشان فەرمووی: (بەڕاستی مەککە، خوای گەورە حەرامی کردووە، وە خەڵکی حەرامیان نەکردووە، ڕەوانییە بۆ هیچ مرۆڤێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت خوێنی تێدا بڕێژێت و، درەختی تێدا ببڕێتەوە، هەرکەسیش ویستی چاو لە پێغەمبەر بکات و ڕوخسەت بەخۆی بدات تیایدا بجەنگێت ئەوە پێی بڵێن کە خوای گەورە ڕوخسەتی بە پێغەمبەرەکەی داوەو ڕوخسەتی بە ئێوە نەداوە، بەڵکو خوا لە ساتێکی ڕۆژدا ڕوخسەتی منی داوە، ئەمڕۆ وەك دوێنێ و رابردوو حورمەت و حەرامی خۆی بۆ گەڕایەوە، جا ئەوکەسەی حازرە بەو کەسە بگەیەنێت کە لێرە نییە) وترا بە ئەبی شورەیح: ئەی عەمر چی پێ وتیت؟ وتی: من لە تۆ شارەزاترم بەوە ئەی ئەبی شورەیح، بەڕاستی کەعبە (حەرەم) سەرپێچی کار پەنا نادات و، هەڵاتو لە خوێن پەنا نادات و، ئەو کەسەش پەنا نادات کە بە تاوانێکی ئابڕوبەرانەوە رایکردووە و هەڵاتووە.

لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بۆ هیچ یەکێك لە ئێوە حەڵاڵ نییە چەك لە مەککەدا هەڵگرێت) موسلیم ریوایەتی کرد.

هەروەها لە عەبدوڵلای کوڕی عەدی کوڕی حەمرای زوهەریەوە دەگێڕنەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لێ بێت) لە (الحزورە)داو لە بازاڕی مەککەدا راوەستا بوو دەیفەرموو: (سوێند بەخوا ئەی مەککە ـ تۆ باشترین زەوی خوایت، خۆشەویسترین زەویت لای خوا، وە ئەگەر منیان دەرنەکردایە لەناوتدا هەرگیز لەتۆ نەدەچوومە دەرەوە). ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووەو، ئەمەش لەفزەکەیەتی، ترمزی و نەسائی و ئیبن ماجەش ریوایەتیان کردووە، ترمزی دەڵی: حەسەنی سەحیحە. بەهەمان شێوە لە ئیبن عەباسەوە فەرموودەیەکی هاوشێوەی سەحیح گێڕراوەتەوە ئەحمەدیش لە ئەبو هورەیرەوە بەهەمان شێوە ریوایەتی کردووە.

ئیبن حاتەم دەڵێ: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە بیشری کوڕی ئادەمی کوڕی بنت ئەزهەری سیمانەوە، لە ئەبو عاسمەوە، لە زورەیقی کوڕی موسلیمی نابینای مەولای بەنی مەخزومەوە، لە زیادی کوڕی ئەبی عیاسەوە، لە یەحیای کوڕی جوعرەی کوڕی هوبەیرەوە سەبارەت بە ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًاۗ﴾ وتویەتی: پارێزراوە لە ئاگر.. لە واتای ئەم قسەیەدا فەرموودەیەك هەیە کە بەیهەقی ریوایەتی کردووەو دەڵێ: ئەبو حەسەن عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدان بۆی گێڕاینەوە، لە ئەحمەدی کوڕی عوبەیدەوە، لە موحەممەدی کوڕی سولەیمانی واسیتیەوە، لە سەعیدی کوڕی سولەیمانەوە، لە ئیبن موئەمەلەوە، لە ئیبن موحەیسنەوە، لە عەتاوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەرکەس چووە ناو کەعبەوە چووەتە ناوچاکەوەو لە خراپە چووەتە دەرەوە،وە لە تاوانەکانی بەخشراوە کاتێك لێی دەچێتە دەر). پاشان وتی: تەنها عەبدوڵلای کوڕی موئەمەل گێڕاویەتیەوە، بە هێز نییە.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ﴾. بەلای کۆی زانایانەوە ئەمە ئایەتی واجب کردنی حەجە،

وتراویشە ئایەتی واجب کردنی حەج ﴿وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ [البقرة: ١٩٦]، بەڵام یەکەمیان ئاشکرا ترە. چەندین فەرمووده هاتوون سەبارەت بە حەج کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام و راگرو بناغەکانی، هەموو موسڵمانان کۆ دەنگن لەسەر ئەوە کۆ دەنگیەکی پێویست، کەواتە پێویستە لەسەر مرۆڤی پێگەیشتوو کە لە ژیانیدا یەك جار حەج بکات بەپێی کۆ دەنگی زانایان و موسڵمانان.

ئیبن ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: یەزیدی کوڕی هارون بۆی گێڕاینەوە، لە رەبیعی کوڕی موسلیمی قەرەیشەوە، لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) وتاری بۆ دەداین و فەرمووی: ئەی خەڵکینە بەڕاستی حەجتان لەسەر فەرز کراو حەج بکەن پیاوێك وتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو تا سێ جار پیاوەکە ئەم پرسیارەی کردەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەگەر بموتایە بەڵێ واجب دەبوو لەسەرتان و ئێوەش نەتاندەتوانی ساڵانە حەج بکەن) پاشان فەرمووی: (وازم لێ بێنن و پابەندبن بەوەی لەناوتاندا جێم هێشتووە، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی زۆر پرسیارکردن و ناکۆکیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان تیاچوون، جا ئەگەر فەرمانم بەشتێك پێکردن هێندەی دەتوانن جێبەجێی بکەن، ئەگەر قەدەغەی شتێکیشم لێکردن وازی لێ بێن و لێی دووربکەونەوە). موسلیم لە زوهەیری کوڕی حەرب و ئەویش لە یەزیدی کوڕی هارونەوە هاوشێوەی ئەمەی ریوایەت کردووە.

هەروەها سوفیانی کوڕی حسەین و سولەیمانی کوڕی کەسیرو عەبدولجەلیلی کوڕی وەحید و موحەممەدی کوڕی ئەبی حەفسە لە زوهەریەوە دەگێڕنەوە، لە ئەبی سینانی دەئولیەوە کە ناوی یەزیدی کوڕی ئومەیە بووە، لە ئیبن عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) وتاری بۆ دەداین، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە خوای گەورە حەجی لەسەر نوسیون) ئەقرەعی کوڕی حابس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لە هەموو ساڵێکدا؟ فەرمووی: (ئەگەر بموتایە واجب دەبوو، ئەگەر واجبیش بوایە نەتان دەتوانی و کارتان پێ نەدەکرد و نەتان دەتوانی کاری پێ بکەن، حەجکردن یەك جارە، هەرکەس زیاتری کرد ئەوە سوننەتە) ئەحمەد و ئەبو

داودو نەسائی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە، حاکمیش لە حەدیسی زوهەریەوە گێڕاویەتیەوە، هەروەها شەریك لە سەماك و ئەمیش لە عەکرەمەوە لە ئیبن عەباسەوە بەهەمان شێوە ریوایەتی کردووە. وەلە فەرموودەی ئوسامەی کوڕی زەیدیشەوە ریوایەت کراوە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: مەنسوری کوڕی وەردان لە عەلی کوڕی عەبدولئەعلاوە، بۆی گێڕاینەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو بەختەریەوە، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە وتوویەتی: کاتێك ئەمە هاتە خوارەوە ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هەموو ساڵێك واجبە؟ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بێدەنگ بوو، وتیانەوە: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هەموو ساڵێك؟ فەرمووی: (نەخێر، چونکە ئەگەر بموتایە بەڵێ، ئەوە واجب دەبوو) خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ [المائدة: ١٠١].

هەر بەم شێوەیە ترمزی و ئیبن ماجەو حاکم لە مەنسوری کوڕی وەردانەوە ریوایەتی کردووە، پاشان ترمزی وتویەتی: فەرموودەکە حەسەنی غەریبە، ئەوەشی ترمزی وتویەتی قسەی لەسەرە، چونکە بوخاری وتویەتی: ئەبو بەختەری لە عەلی نەبیستووە.

ئیبن ماجەش دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای نەمیر بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئەبو عوبەیدەوە، لە باوکیەوە، لە ئەعمەشەوە، لە ئەبو سوفیانەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا حەج لە هەموو ساڵێکدا بکەین؟ فەرمووی: (ئەگەر بموتایە بەڵێ واجب دەبوو، ئەگەر واجبیش ببوایە پێی هەڵنەدەستان، ئەگەر پێی ئەڵنەستانایە سزا دەدران)

وە لە سەحیحی بوخاری و موسلیم داو لە فەرموودەی ئیبن جورەیجەوە، لەو عەتاوە، لە جابرەوە، لە سوراقەی کوڕی مالیکەوە دەڵێ، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەجی ئەمساڵ هەر بۆ ئەم ساڵە یان لەبری هەموو تەمەنە؟ فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو بۆ هەموو تەمەنە) لە گێڕانەوەیەکی تردا: (بەڵکو بۆ هەتا هەتایە) هەروەها لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەد و سونەنی ئەبو داودا لە

فەرموودەیەکدا کە واقدی کوڕی ئەبی وافیدی لەیسی لە باوکیەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە کە لەم حەجەیەیدا بە هوسەرەکانی فەرموو (پاشان دەرکەوتنی سنورداره - واتە پاشان کات و زەمەنی دەرکەوتنی سنورداره - ئێوەش لە ماڵەکان ناچنە دەرەوە).

سەبارەت بە توانای حەجکردن چەند بەشێکە: یەکەمیان دەبێت کەسەکە بۆ خۆی حەج بکات و، جارێکی تر توانای دابینکردنی هۆکارەکانی حەجکردنی هەبێت وەك لە کتێبەکانی ئەحکامدا باسکراوە، ئەبو عیسای ترمزی وتویەتی: عەبدی کوڕی حەمید بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولرەزاقەوە، لە ئیبراهیمی کوڕی یەزیدەوە، وتویەتی: بیستم لە موحەممەدی کوڕی عوبادی کوڕی جەعفەر لە ئیبن عومەرەوە دەیگێڕایەوەو کە وتویەتی: پیاوێك هەستا بۆلای پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)و وتی: کێ حاجیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ( ئەوەی تەپوپۆزاوی دەبێت و قژی دەزرکێ و،بۆن لە خۆی نادات) یەکێکی تر هەستاو وتی: کام حەج باشترینە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (ئەوەی زۆرترین لبیك اللهم لبیکی تێدا دەکرێت و زۆرترین خوێنی قوربانی تێدا دەرژێت) کەسێکی تر هەستاو وتی: مەبەست لە (السبیل) چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (بریتیيە لە توێشو لەگەڵ ولاغی سواری) هەر بەمشێوەیە ئیبن ماجە لە فەرموودەی ئیبراهیمی کوڕی یەزیدەوە کە حوزیە ریوایەتی کردووە. ترمزی دەڵێت: نایناسین لە فەرموودەکەیەوە نەبێت، هەندێك لە شارەزاو زانایانی بواری زانستیش قسەیان سەبارەت بە لەبەرکردن و لەبیرنەچوونەوەی کردووە، لێرەدا بەمشێوەیەی وتوە وە لە کتێبی حەجدا وتویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنەو گومان لەوەدانیە کە پیاوەکانی هەرهەموویان متمانە پێکراون جگە لە ئەم حوزیە نەبێت، ئەوان لە پێناوی ئەم فەرموودەیەدا قسەیان تیا کردووە، بەڵام کەسی تری جگە لە م بەدوایدا هاتووە کە قسەی لەسەر کردووە.

ئیبن ئەبی حاتەمیش وتویەتی باوکم بۆ گێڕاینەوە، لە عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵای عامریەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە، وتویەتی: دانیشتم لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، وتی: پیاوێك

هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) و پێی وت: (السبيل) چیە؟ فەرمووی: (توێشووی ڕێگاو وڵاغی سواریە) هەر بەمشێوەیە ئیبن مەردەویە لە گێڕانەوەی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە گێڕاویەتیەوە، پاشان ئیبن ئەبی حاتەم وتویەتی: بەهەمان شێوە لە ئیبن عەبباس و ئەنەس و حەسەن و موجاهید و عەتاو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادەوە هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە ریوایەت کراوە. هەر ئەم فەرموودەیە لە ڕێگەی ترەوە لە فەرمودەی ئەنەس و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئیبن مەسعودو عائیشەوە بە مەرفوعی گێڕراوەتەوە، بەڵام لە ئیسنادەکانیدا قسە هەیە و ئەمەش لەکتێبی ئەحکامدا هاتووە، خوای گەورەش زاناترە. حافز ئەبو بەکری مەردەویەش گرنگی بە کۆکردنەوەی ڕێگەکانی ئەم فەرموودەیەداوە.

هەروەها حاکم لە فەرموودەی قەتادەوە لە حەمادی کورشی سەلەمەوە، لە قەتادەوە، ریوایەتی کردووە، ئەویش لە ئەنەسەوە، کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا (دروودی خوای لێ بێت) سەبارەت بە ﴿مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ﴾ وترا: مەبەست چیە لە (السبيل)؟، فەرمووی: (توێشوو لەگەڵ وڵاغی سواری) حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لەسەر مەرجی موسلیم سەحیحە، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە.

هەروەها ئیبن جورەیج دەڵی: یەعقوب بۆی گێڕامەوە، لە ئیبن عەلییەوە، لە یونسەوە، لە حەسەنەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ئەمەی خوێندەوە ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ﴾ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (السبيل) چییە؟ فەرمووی: (توێشوو لەگەڵ وڵاغی سواری) وەکیعیش لە تەفسیرەکەیدا لە سوفیانەوە، ئەویش لە یونسەوە گێڕاویەتیەوە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەبدولڕەزاق بۆی گێڕاینەوە، کە سەوری هەواڵی پێداین لە ئیسماعیلەوە کە ئەبو ئیسرائیلی مولائیە، ئەویش لە فوزەیلەوە، واتە ئیبن عەمر، ئەویش لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لەئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پەلە بکەن بۆ حەج ـ واتە حەجی فەرز ـ چونکە کەسێ: لە ئێوە نازانێت شتێك ڕووبەڕووی دەبێتەوەو دێتە ڕێگەی).

هەروەها ئەحمەد دەڵێ: ئەبو معاویە بۆی گێڕاینەوە، لە حەسەنی کوڕی

عەمری فەقیمیەوە، لە مەهرانی کوڕی ئەبی سەفوانەوە، لە ئیبن عەباسەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس دەیەوێت حەج بکات با پەلە بکات) هەروەها لە موسەدەدەوە، لە ئەبی معاویەی زەریرەوە ریوایەتی کردووە، هەروەها ئیبن جوبەیر لە ئیبن عەباسەوە سەبارەت بە ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًاۚ﴾ ریوایەتی کردووەو وتویەتی: هەرکەس سێ سەد درهەمی هەبێت ئەوە توانای حەجی هەیە. هەروەها لە عەکرەمەی مەولایەوە دەڵێت: توانا (السبیل) مەبەست پێی تەندروستیە. هەروەها وەکیعی کوڕی جەراح لە ئەبی جەنابەوە واتە ئەلکەلەبیەوە، لە زوحاکی کوڕی موزاحیمەوە، لە ئیبن عەباسەوە ریوایەتی کردووەو وتویەتی ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًاۚ﴾ واتە: (توێشوو لەگەڵ وشتر).

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئیبن عەباس و موجاهید و لە کەسێك زیاتر وتویانە: واتە هەرکەس بڕوای بە حەج نەبوو ئەوە بێ باوەڕ بووەو خوای گەورە هیچ پێویستی بەو نییە.

سەعیدی کوڕی مەنسور لە سوفیانەوە، لە ئیبن ئەبی نەجیمەوە، لە عەکرەمەوە، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ [آل عمران: ٨٥].. جولەکەکان وتیان ئێمە موسڵمانین. خوای گەورە فەرمووی: رکەبەرایەتیان بکەو داوای بەڵگەیان لێ بکە، واتە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموون (خوای گەورە حەجی ماڵەکەی خۆی لەسەر موسڵمانان فەرزکردووە بۆ هەرکەسێك لە توانایدا هەبێت) ئەوانیش وتیان: حەج لەسەر ئێمە فەرز نەکراوەو رازی نەبوون کە حەج بکەن،خوای گەورەش فەرمووی: ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئیبن ئەبی نەجیح لە موجاهیدەوە هاوشێوەی ئەمەی ریوایەت کردووە.

ئەبو بەکری کوڕی مەردەویە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە، لە موسلیمی کوڕی ئیبراهیم و شانازی کوڕی فەیازەوە، وتویانە: هیلالی ئەبو هیشامی خۆراسانی بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو ئیسحاقی هەمەدانیەوە، لە حاریسەوە، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)

فەرمووی: (هەرکەس توێشووی ڕێگاو ولاغی هەبوو بەڵام حەجی ماڵی خوای نەکرد، ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت ئەگەر بە جولەکەیی یان گاوری مرد، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾. بەهەمان شێوە ئیبن جورەیر لە موسلیمی کوڕی ئیبراهیمەوە گێڕاویەتیەوەو، ئیبن ئەبی حاتەمیش لە ئەبی زەرعەی رازیەوە ریوایەتی کردووە کە وتویەتی: هیلالی کوڕی فەیاز بۆی گێڕاینەوە، لە هیلالی ئەبو هیشامی خۆراسانیەوە، بە ئیسنادی خۆی و هەمان شێوەی پێشوو گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ترمزی لە موحەممەدی کوڕی یەحیای قەتعیەوە، لە موسلیمی کوڕی ئیبراهیمەوە، لە هیلالی کوڕی عەبدوڵڵای مەولای رەبیعەی کوڕی عەمری کوڕی موسلیمی باهیلیەوە، گێڕاویەتیەوەو، وتویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی غەریبەو، لەم ڕێگەیەوە نەبێت نایناسین، وە لە ئیسنادەکەیدا قسەو رەخنە هەیە، چونکە هیلال نەناسراوەو حارسیش لە فەرمووده گێڕانەوەدا بە لاواز دادەنرێت، بوخاریش وتویەتی: ئەم هیلالە فەرموودەی لێ وەرناگیرێت. ئیبن عەدی دەڵێ: ئەم فەرموودەیە پارێزراو نییە.

ئەبو بەکری ئیسماعیلی حافز لە فەرموودەی ئەبی عەمری ئەوزاعیەوە ریوایەتی کردووەو دەڵێ: ئیسماعیلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موهاجیر بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی غەنەمەوە، کە گوێی لە عومەری کوڕی خەتاب بووە وتویەتی: هەرکەس توانای حەجکردنی هەبێت و حەج نەکات، بۆ ئەو وەك یەك وایە بە جولەکەیی بمرێت یان بەگاوری. ئەم ئیسنادە بۆلای عومەری کوڕی خەتاب سەحیحە.

هەروەها سەعیدی کوڕی مەنسور لە سونەنەکەی خۆیدا لە حەسەنی بەسریەوە ریوایەتی کوردووە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: بیرم لەوە کردەوە کۆمەڵێك پیاو بنێرم بۆ ناوچە جیاجیاکان تا بڕوانن بزانن کێ توانای هەیەو حەج ناکات، تاکو سەرانەیان لەسەر بسەپێنن چونکە ئەوانە موسڵمان نین، ئەوانە موسڵمان نین.

﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ
٩٨ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا
عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٩٩﴾

ئەمە توڕەبوونی خوای گەورەیە لە گاورو جولەکەکان بەهۆی کەللەرەقیان بەرامبەر بە حەق، وە بەهۆی بێ باوەڕیان بە ئایەتەکانی پەروەردگار و، ڕێگریان لە ئاینی خوا بۆ هەرکەسێك ویستبێتی شوێنی بکەوێت بە تواناو هێزیان، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە چاك دەیانزانی ئەوەی پێغەمبەری هێناویەتی حەق و ڕاستیەو، ئەم شارەزاییەیان لە پێغەمبەرانی پێشووەوە دەزانی، ئەوان مژدەی ئەو پێغەمبەرانەیان دەزانی سەبارەت بەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی کە دێت و لە نەوەی هاشمەو عەرەبی مەککەیەو گەورەی نەوەکانی ئادەمەو، کۆتا پێغەمبەری خوایەو، نێردراوی بەدیهێنەری زەوی ئاسمانەکانە، لەبەرئەوە خوای گەورە لەسەر ئەم بێ باوەڕی و حەق شاردنەوەیەیان هەڕەشەی لێکردن، هەواڵی پێدان کە خوا شاهیدە لەسەر ئەو ڕەفتارانەیان و دەزانێت و ئاشکرای دەکات کە ئەوان بەدەستی ئەنقەست سەرپێچی پێغەمبەران دەکەن و بەو شێوە خراپە ڕەفتار لەگەڵ پێغەمبەری مژدە پێدراودا دەکەن کە بەدرۆیدا دەخەنەوەو بڕوای پێ ناهێنن، خوای گەورە ئاشکرای کرد کە بێ ئاگا نییە لەو کارو ڕەفتارانەی ئەوان و، تۆڵەیان لێ دەکاتەوە لە ڕۆژێکدا کە نەماڵ و نە مناڵ هیچ سودێك بە مرۆڤ ناگەیەنن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم
بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ١٠٠ وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ
وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٠١﴾

خوای گەورە هۆشداری بە موسڵمانان دەدات لەوەی گوێڕایەڵی کۆمەڵێك لە جولەکەکان بکەن، ئەوانەی کە ئیرەیی بە موسڵمانان دەبەن لەسەر ئەو ئاینەی کە بە فەزڵ و بەخشندەیی خۆی بۆی ڕەوانە کردون و ئەو پێغەمبەرەی کە بۆی ناردوون، وەك دەفەرموێت: ﴿وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ

بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ [البقرة: ١٠٩].

بەمشێوەیە لێرەشدا دەفەرموێت ﴿إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ﴾، دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ﴾، واتە بێ باوەڕی دوورە لە ئێوەو ئێوە دوورن لە بێ باوەڕی، چونکە ئایەتەکانی پەروەردگار بەشەوو بە ڕۆژ دادەبەزنە سەر پێغەمبەرەکەی، ئەویش بۆ ئێوەی دەخوێنێتەوەو ئێوەی پێ ئاگادار دەکاتەوە، ئەمەش وەك ئەو وتەیەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۙ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَـٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾﴾ [الحديد: ٨] هەروەهت لە فەرمودەشدا هاتووە کە پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) بە هاوەڵەکانی فەرموو: (کام ئیماندار ئیمانەکەی جێگەی سەرسوڕمانە لای ئێوە؟) وتیان: فریشتەکان. فەرمووی (ئەوان چۆن ئیمان ناهێنن لە کاتێکدا لای پەروەردگاریانن؟) وتیان: پێغەمبەران. فەرمووی (ئەوان چۆن ئیمان ناهێنن لە کاتێکدا وەحی دادەبەزێتە سەریان؟) وتیان: کەوتە ئێمە. فەرمووی (ئێوە چۆن ئیمان ناهێنن لە کاتێکدا من لە نێوانتاندام؟) وتیان: ئەی کەواتە کێ ئیمانەکەی جێگەی سەرسوڕمانە؟ فەرمووی (کۆمەڵێك دوای ئێوە دێن تەنها چەندلاپەڕەیەك - کتێبێك - دەبینن و بڕوا بەوە دێنن کە لەناو ئەو لاپەڕانەدایە). پێشتر باسی سەنەدی ئەم فەرمودەیەم کردووە و لەسەرەتای شەرحی بوخاریدا قسەم لەسەر کردووە، سوپاس بۆ خوا.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە لەگەڵ ئەمەشدا پشت بەستن بە خواو خۆدانە دەستی پەروردگار کۆڵەکەی هیدایەتە، هۆکاری بنەڕەتی دوورکەوتنەوەیە لە گومڕایی، هۆکارە بەرەو ژیری و کاری دروست، ڕێگەی ڕاست و گەشتنە مەبەست.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ
﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ
إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا

حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠٣﴾

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی سینان بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولڕەحمانەوە، لە سوفیان و شوعبەوە، لە زوبەیدی یامیەوە، لە موڕەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەربارەی ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾، وتوویەتی: ئەوەیە کە گوێڕایەڵی بکرێت و سەرپێچی نەکرێت، یاد بکرێت و لەبیر نەکرێت، سوپاس بکرێت و بەد نمەکی نەکرێت، ئەمەش ئیسنادێکی سەحیحی مەوقوفە. جارێکیشیان عەمری کوڕی مەیمون لە ئیبن مەسعودەوە بەدوای کەوتووە. هەروەها ئیبن مەردەویە لە فەرموودەی یونسی کوڕی عەبدولئەعلاوە، ڕیوایەتی کردووە، لە ئیبن وەهەبەوە، لە سوفیانی سەوریەوە، لە زوبەیدەوە، لە موڕڕەوە، لە عەبدوڵڵاوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾، ئەوەیە کە گوێڕایەڵی بکرێت و سەرپێچی نەکرێت، یادی بکرێت و سوپاس بکرێت و لەبیر نەکرێت و بەدنمەکی نەکرێت). هەربەمشێوەیە حاکم لە موستەدرەکەکەیدا لە فەرموودەی موسەعەرەوە گێڕاوییەتیەوە، لە زوبەیدەوە، لە موڕڕەوە، لە ئیبن مەسعودەوە بە مەرفوعی، باسی کردووەو، پاشان وتوویەتی: فەرموودەکە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم سەحیحە، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە، ئابەمشێوەی وتووە، بەڵام دیارترو ئاشکراتر ئەوەیە کە فەرموودەکە مەوقوفە، خوای گەورە زاناترە.

پاشان ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێ: هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە لە موڕەڕەی هەمەدانی و ڕەبیعی کوڕی خوسەیم و عەمری کوڕی مەیمون و ئیبراهیمی نەخەعی و تاووس و حەسەن و قەتادەو ئەبی سینان و سەدیەوە ڕیوایەت کراوە، هەروەها لە ئەنەسەوە ڕیوایەت کراوە، وتوویەتی: بەندە بە تەواوی مافی لەخواترسانی نەداوە تاکو زوبانی نەخاتە کۆگاوەو نەیگرێت.

سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبوعالیەو، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەیان و زەیدی کوڕی ئەسلەم و سەدی و کەسانی تریش بیروڕایان وایە کە ئەم ئایەتە مەنسوخە بە ئایەتی: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾ [التغابن: ١٦].

عەلی کوڕی ئیبن تەڵحەش لە ئیبن عەباسەوە سەبارەت بە ﴿اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ وتوویەتی: نەسخ نەبووەتەوە، بەڵام ﴿حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ ئەوەیە لە پێناوی خوادا بە تەواوی واتا جیهاد و تێکۆشان بکەن و لۆمەی هیچ لۆمەکەرێك لە کارکردن بۆ خوا لاتان نەدات، هەستن بە دادپەروەری ئەگەر لەسەر حسابی خۆتان و باوباپیرانتان و نەوەکانیشتان بێت.

پاشان کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ واتە لەباری سەلامەتی و تەندروستیتاندا پارێزگاری لە ئیسلام بکەن تاکو لەسەری بمرن، چونکە خوای گەورە و بەخشندە بەخشندەییەکەی بەردەوام دەکات بۆ کەسێك کە لەسەر ڕێبازەکەی ژیا بێتە، وای لێ دەکات هەر لەسەر ئەو ڕێبازە بمرێت، هەرکەسیش لەسەر هەرشتێك مرد، هەر لەسەر ئەوە زیندوو دەکرێتەوە، پەنا بەخوا لە پێچەوانەی ئەمە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: روح بۆی گێڕاینەوە، لە شوعبەوە، وتی: گوێم لە سولەیمان بوو لە موجاهیدەوە گێڕایەوەو وتی: خەڵکی بەچواردەوری کەعبەدا تەوافیان دەکرد و ئیبن عەباسیش دانیشتبوو موحەجەنی لەلا بوو، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾،.. ئەگەر تەنها یەك دڵۆپ لە (زەقوم) بکەوتایەتە سەر زەوی ژیانی هەموو خەڵکی سەرزەوی تاڵ دەکرد، ئەی ئەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە جگە لە زەقوم هیچ خواردنێکی تری نییە؟) هەر بەمشێوەیە ترمزی و ئیبن ماجەو ئیبن حەبان لە سەحیحەکەیداو حاکم لە موستەدرەکەیدا لە شوعبەوە ریوایەتیان کردووە، ترمزیش وتوویەتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە، حاکم دەڵێ: لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە.

هەروەها ئیمام ئەحمەد دەڵێ: وەکیع بۆی گێڕاینەوە، لە ئەعمەشەوە، لە زەیدی کوڕی وەهبەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدولکەعبەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس پێی خۆشە لە ئاگری دۆزەخ بپەڕێتەوەو بچێتە ناو بەهەشتەوە با کاتێك مردن یەخەی پێ دەگرێت بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێت و، ئەوە بۆ خەڵکی بەرێت کە پێی خۆشە بۆی بهێنرێت).

هەروەها ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو معاویە بۆی گێڕاینەوە، لە ئەعمەشەوە، لە ئەبو سوفیانەوە، لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوابوو (دروودی خوای لێ بێت) پێش وەفاتکردنی سێ جار ئەمەی فەرموو: (با هیچ یەکێك لە ئێوە نەمرێت تاکو گومانی چاکەی بە پەروەردگاری نەبێت) موسلیمیش لە ڕێگەی ئەعمەشەوە گێڕاویەتیەوە.

هەر ئیمام ئەحمەد دەڵێ: حەسەنی کوڕی موسا بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی لەهیعەوە، لە ئەبو یونسەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (خوای گەورە فەرموویەتی: من بەوشێوەم کە بەندەکەم گومانم پێ دەبات، ئەگەر گومانی چاکی پێبردم ئەوە چاکە بۆ ئەوە، وە ئەگەر گومانی خراپی پێبردم ئەوە خراپە بۆ ئەوە) ئەسڵی ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا چەسپیوە.بەشێوەیەکی ترو لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێت: من بەو شێوەیەم کە بەندەکەم گومانم پێ دەبات).

حافز ئەبوبەکری بەزازیش دەڵێ: موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیکی قەرەشی بۆی گێڕاینەوە، لە جەعفەری کوڕی سولەیمانەوە، لە سابتەوە، واحساب دەکەم ئەویش لە ئەنەسەوە گێڕابێتیەوە، وتی: پیاوێك لە پشتیوانەکان نەخۆش بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هات بۆلای و تاسەردانی بکات، لە بازاڕ پێی گەشت و سڵاوی لێکردو، پێی فەرموو: (فلانەکەس حاڵت چۆنە؟) وتی: زۆرباشم ئەی پێغەمبەری خوا. ئومێدم بەخوا هەیە و لە تاوانەکانم دەترسم، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کۆنابنەوە لەو جێگەیەدا لە دڵی بەندەیەکدا ئەو دوانە، ئەوە بەڵنیاییەوە خوای گەورە ئەوەی پێ دەبەخشێت کە ئومێدی دەکات و دەیپارێزێت لەوەی لێی دەترسێت). پاشان وتی: نازانین، لە سابتەوە جیا لە سولەیمان ریوایەتی کردووە، هەر بەمشێوەیە ترمزی و نەسائی و ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەکەیەوە، پاشان ترمزی وتوویەتی: فەرموودەیەکی غەریبە، هەندێکی تریان لە سابتەوە بە مورسەلی ریوایەتیان کردووە.

بەڵام ئەو فەرموودەیەی ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە دەڵێ: موحەممەدی کوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە، لە شوعبەوە، لە ئەبی بیشرەوە، لە یوسفی کوڕی ماهیکەوە، لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە، وتی: پەیمانم بە پێغەمبەری خوا دا (دروودی خوای لێ بێت) کە دوانەکەوم بە راوەستاوی نەبێت، هەروەها نەسائی لە سونەنەکەیدا لە ئیسماعیلی کوڕی مەسعودەوە، لە خالیدی کوڕی حاریسەوە، لە شوعبەوە ریوایەتی کردووە و واتاکەی بەمشێوەیە لێك داوەتەوە: (چۆن مرۆڤ دەچێتە کڕنوشەوە - کڕنوش دەبات) وتوویەتی، واتاکەی ئەوەیە کە نامرم بە موسڵمانی نەبێت، هەروەها وتراوە: هەرگیز کەسێك ناکوژم کە پشتی لەمن بێت و بگەڕێتەوە بۆ یەکەم.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾ وتراوە ﴿بِحَبۡلِ ٱللَّهِ﴾ واتە بە پەیمانی خواوە، هەروەك لە ئایەتی دوای ئەودا دەفەرموێت: ﴿ضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبۡلٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ [آل عمران: ١١٢] واتە بە پەیمان و بەڵێنی پەروەردگارەوە، هەروەها وتراوە، ﴿بِحَبۡلِ ٱللَّهِ﴾ واتە قورئان. هەروەك لە فەرموودەی حاریسی ئەعوەرەوە لە عەلیەوە بەمەرفوعی هاتووە لە سیفەتی قورئاندا کە (بریتیە لە پەتی خوای بەهێزو، رێگە راستەکەی ئەو). سەبارەت بەم بیروڕایە فەرموودەی تایبەت بەم مانایە هاتووە، ئیمام حافز ئەبو جەعفەری تەبەری دەڵێ: سەعیدی کوڕی یەحیای ئەمەوی بۆی گێڕاینەوە، لە ئەسباتی کوڕی موحەممەدەوە، لە عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو سولەیمانی عەرزەمیەوە، لە عەتییەوە، لە ئەبو سەعیدەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کتێبی خوا بریتیە لە پەتی درێژکراوەی پەروەردگار لە ئاسمانەوە بۆ زەوی).

هەروەها ئیبن مەردەویە لە رێگەی ئیبراهیمی کوڕی موسلیمی هیجریەوە، لە ئەبی ئەحوەسەوە، لە عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بەڕاستی ئەم قورئانە بریتیە لە پەتی بەهێزی خوای گەورە، بریتیە لە نورێکی ئاشکراو، شیفایەکی سودبەخش، ئەم قورئانە پارێزەرە بۆ ئەو کەسەی دەستی پێوە گرتووە، رزگارکەرە بۆ ئەو کەسەی شوێنی کەوتووە). لە فەرموودەی حەزەیفەو زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاوشێوەی ئەمە گێڕراوەتەوە،

وەکیع دەڵێ: ئەعمەش لە ئەبی وائیلەوە بۆی گێڕاینەوەو وتی: عەبدوڵلا وتی: بەڕاستی ئەم ڕێگەیە ئامادەیەو شەیتانەکان ئامادەی دەبن. ئەی عەبدوڵلا ئەمە ڕێگەکەیە، وەرە بۆ ڕێگەکەو دەست بگرن بە پەتی خواوە، بەڕاستی پەتی خوا بریتیە لە قورئان.

کە دەشفەرموێت: ﴿وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾ ئەوە فەرمانی پێکردوون بە کۆمەڵیء، پەرتەوازەیی لێ قەدەغە کردوون، دەبینین زۆر فەرموودە هاتوون کە بەرگری لە ناکۆکی و دوویەرەکی دەکەنء، فەرمان بە یەکبوون و کۆمەڵبوون دەکەن، وەك ئەم فەرموودەیەی لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، لە سوهەیلی کوڕی ئەبی سالحەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوای گەورە بە سێ شت رازیە بۆ ئێوە، سێ شتیشی پێ ناخۆشە بۆتان، رازیە بۆ ئێوە کە بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ پەیدا نەکەنء، هەرهەمووتان دەست بگرن بە پەتی بەهێزی پەروەردگارەوەو پەرتەوازە نەبنء، ئامۆژگاری ئەوکەسە بکەن خوای گەورە دەیکاتە فەرمانڕەواتان، ئەم سێ شتەشی بۆ ئێوە پێ ناخۆشە و دەیڕەنجێنێت: وتیان و وترا، زۆر پرسیار کردنء، بە فیڕۆدانی سامان). هەروەها خوای گەورە زەمانەتی دووربوون لە هەڵەی بۆ کردوون بە مەرجێك ئەوان یەکگرتووبن و ڕێ بکەون، لەم بارەشەوە فەرموودەی زۆر هاتووە کە مەترسی دوویەرەکی و ناکۆکي دەخەنە روو، ئەمەش بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا هات و بەسەر حەفتاو سێ گروپ و دەستەدا دابەشبوون، یەك گروپیان رزگارە و بەرەو بەهەشت دەڕوات و لە دۆزەخ پارێزراوە، ئەویش ئەو گروپەیە کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵەکانیەتی.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَا﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، ئەم ئایەتە سەبارەت بە ئەوس و خەزرەج هاتە خوارەوە، چونکە لە رابردوودا جەنگ و کوشتاری زۆریان لە نێواندابوو، رق و قینی زۆریان بەرامبەر یەکتر هەبوو، کە بەهۆیەوە جەنگ لە نێوانیاندا بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ بوویەوە، بەڵام کاتێك ئاینی ئیسلام هات، لە هەردوولا ژمارەیەکیان موسڵمان بوون و بەمشێوەیە بوون بە براو خۆشەویستی یەکتر،

لەبەرخوا یەکتریان خۆش دەویست و، پەیوەندیەکانیان بەهۆی خواوە بەردەوام بوو، لەسەر خێرو چاکە هاوکاری یەکترییان دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ﴾ [الأنفال ٦٢، ٦٣] ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان بەهۆی بێ باوەڕیەوە لە قەراغی ئاگردا بوون، خوای گەورە هیدایەتی دان و ڕزگاری کردن لە تیاچوون، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگی حونەین دا ئەم فەزڵ و ڕەحم و منەتەی خوای بیر خستنەوەو، سزای هەرکەسێکیانی دا کە مەبەستی بوو، ئەمەش بەوەی بەشی کۆچکردووەکانی زیاتردا لەپشتیوانەکان و، وای بەباش انی بەشی پشتیوانەکان کەم بێت، ئەوەبوو ڕوی تێکردن و فەرمووی: (ئەی گرۆی پشتیوانان: ئایا ئێوەم بە گومڕایی نەبینی و خوای گەورە بەهۆی منەوە هیدایەتی دان، ئایا ئێوە ناکۆك و پەرتەوازە نەبوون خوای گەورە بەهۆی منەوە دڵەکانی پێکەوە بەستنەوە، ئایا ئێوە هەژار و نەدار نەبوون و خوای گەورە بەهۆی منەوە دەوڵەمەندی کردن؟) هەرکات یەکێك لەو شتانەی دەفەرموو پشتیوانەکان دەیان وت: خواو پێغەمبەرەکەی منەتی زۆریان هەیە بەسەرمانەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسارو کەسانی تریش باسی ئەوەیان کردووە کە: ئەم ئایەتانە سەبارەت بە ئەوس و خەزرەج هاتنە خوارەوە، ئەوەبوو پیاوێکی جولەکە بەلای کۆمەڵێك لە ئەوس و خەزرەجیەکاندا ڕۆشت و زۆری پێ ناخۆش بوو کە بەو شێوەیە تەباو خۆشەویست و یەك ڕیزن، فەرمانی بە کەسێك کرد کە لە گەڵیدابوو تا بڕواتە نێویانەوەو باسی ئەو ناکۆکی و جەنگ و کوشتارە بکات کە لە ڕۆژی (بعاث)دا لە نێوانیاندا ڕوویدا بەمەبەستی ناکۆکی نانەوە، ئەویش ڕۆشت و فەرمانەکەی جێبەجێ کرد، بەردەوام ئەو ناکۆکی و جەنگەی بیرخستنەوە تاکو دەروونی ئامادەبوان گەرم بوو، هەندێکیان لە هەندێکی تریان توڕەبوونە، دەنگیان بەرز کردەوە و هەڵچون و دەستیان کرد بە هەڵبڕینی دروشمە نەفامیەکانی پێشوویان، داوای چەکەکنیان کرد و وادەی جەنگیان دانا لە (الحره)، ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) گەشت، پێغەمبەر هات بۆ لایان و ئارامی کردنەوەو دەیفەرموو: (ئایا

بانگەوازی نەفامی زیندو دەکەنەوە لەکاتێکدا من لەنێوانتاندام) وە ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە، ئەوانیش پەشیمان بوونەوە لەو کارەیان و سوڵحیان کرد و دەستیان لە ملی یەکتر کردەوەو چەکەکانیان فڕێدا، خوای گەورە لە هەموویان رازی بێت.

بەڵام عەکرەمە باسی ئەوەی کردووە کە ئەم ئایەتە لە رووداوی تۆمەت هەڵبەستنەکەی دایکی ئیمانداراندا هاتە خوارەوە کاتێك ناکۆکی و هەڵچوون کەوتە نێوانیان. خوای گەورە زاناترە.

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ
ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ (١٠٤) وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟
مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٠٥) يَوْمَ تَبْيَضُّ
وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ
فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ (١٠٦) وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى
رَحْمَةِ ٱللَّهِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (١٠٧) تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا
ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ (١٠٨) وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى
ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ (١٠٩)﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ﴾ کۆمەڵێك کاری سەرەکیان هەستان بە جێبەجێکردنی فەرمانی خوا لە بانگەوازکردن بۆ خێرو فەرمانکردن بە چاکەو بەرگریکردن لە خراپە ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، زوحاك دەڵێ: ئەوانە بریتین لە هاوەڵە تایبەت و فەرمووده گێڕەرەوە تایبەتەکان، واتە بریتین لە موجاهیدەکان و زاناکان. ئەبو بەکر جەعفەری باقر دەڵێ: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ﴾ پاشان فەرمووی: (خێر بریتیە لە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەتی من) ئیبن مەردەویە ریوایەتی کردووە.

مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە، کۆمەڵێك لەم ئوممەتە هەبن خۆیان بۆ ئەم

کارە یەکلایی کردبێتەوەو شانیان دابێتە ژێری، ئەگەرچی بانگەواز بۆ خێرو چاکە ئەرکی سەرشانی هەموو تاکێکی ئەم ئوممەتەیە بەپێی توانای خۆی، وەك لە سەحیحی موسلیمدا چەسپیوەو، ئەبی هورەیرە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بە زوبانی بیگۆڕێت، وە ئەگەر نەیتوانی ئەوە بە دڵی پێی ناخۆش بێت، ئەوەش لاوازترین بڕوایە) لە گێڕانەوەیەکی تردا: (لەپاش ئەمە ناخۆشبوونی دڵەوە میسقاڵە خەردەلێك لە ئیمان بوونی نیە).

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: سولەیمانی هاشمی بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەرەوە، لە عەمری کوڕی ئەبی عەمرەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەبدولڕەحمانی ئەشهەلیەوە، لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، یان دەبێت فەرمان بە چاکە بکەن و بەرگری لە خراپە بکەن، یاخود نزیکە خوای گەورە لای خۆیەوە ئەشکەنجەیەکتان بۆ بنێرێت، ئەوکاتە لە خوا دەپاڕێنەوەو ئەویش پاڕانەوەکانتان لێ وەرناگرێت) ترمزی و ئیبن ماجەش لە عەمری کوڕی ئەبی عەمرەوە ریوایەتیان کردووە، هەروەها ترمزی دەڵێ: فەرموودەکە حەسەنە، دیارە کە فەرموودەو ئایەت لەم بارەیەوە زۆرن،کە لە شوێنی خۆیاندا تەفسیر دەکرێن.

دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ﴾ خوای گەورە قەدەغەی دەکات لەم ئوممەتە کە وەك ئوممەت و گەلانی پێشوو وابن. لە دووبەرەکی و پەرتەوازەییء، وازهێنان لە فەرمان کردن بە چاکەو بەرگریکردن لە خراپەدا، لەگەڵ هەبوونی ئیقامە حوجە لەسەریان کە هەموو شتێکیان بۆ روون کراوەتەوە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو موغیرە بۆی گێڕاینەوە، لە سەفوانەوە، لە ئەزهەری کوڕی عەبدوڵلای هۆزنیەوە، لە ئەبی عامر عەبدوڵلای لوحەییەوە، کە وتوویەتی: لەگەڵ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان حەجمان کرد، کاتێك گەیشتینە مەککەو لەوکاتەی نوێژی نیوەڕۆی کرد هەستایەوەو وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (شوێنکەوتەی دوو کتێبەکە لە

ئاینەکەیاندا پەرتەوازەبوون بەسەر حەفتاو دوو دەستەدا، وە ئەم ئوممەتە پەرتەوازەو دابەش دەبێت بەسەر حەفتاو سێ دەستەدا - واتە دەستەی نارەزوباز، هەرهەموویان لە ئاگردان تەنها یەکێکیان نەبێت - کە کۆمەڵی موسڵمانانە، هەروەها لە ئوممەتەکەی من چەند دەستەو کۆمەڵێك دەردەچن هەواو ئارەزو دەیان سوڕێنێتەوە وەك چۆن سەگ بەدەوری خاوەنەکەیدا دەسوڕێتەوە.) سوێند بەخوا ئەی جەماوەری عەرەب، ئەگەر ئێوە هەڵنەستن بە ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی ئەوەی پێغەمبەرەکەتان بۆی هێناون ئەوە خەڵکانێکی ناعەرەب ئەگەری ئەوەیان زۆرترە هەڵنەسن بەوکارە. هەر بەمشێوەیە ئەبو داودوو لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و موحەممەدی کوڕی یەحیاوە ریوایەتی کردووە، هەردوکیشیان لە ئەبی موغەیرەوە کە ناوی عەبدول قودوسی کوڕی حەجاجی شامیە. وە ئەم فەرموودەیە لەچەند ڕێگەیەکەوە هاتووە.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ واتە ڕۆژی قیامەت، کاتێك دەموچاوی شوێنکەوتوانی سوننەت و کۆمەڵی موسڵمانان سپی دەبێت و، دەمووچاوی شوێنکەوتوانی بیدعەو دوبەرەکی ڕەش دەبێت، وەك ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت.

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾ حەسەنی بەسری دەڵێ: ئەوانە دوڕووەکانن ﴿فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ ئەم وەسفە هەموو بێ بڕواکان دەگرێتەوە ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾﴾ واتە بەهەتا هەتایی و بێ دابڕان و دورکەوتنەوە لە بەهەشتدا دەمێننەوە.

ئەبو عیسای ترمزی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: ئەبو کورەیب بۆی گێڕاینەوە، لە وەکیعەوە، لە ڕەبیعی کوڕی سەبیح و حەمادی کوڕی سەلەمەوە، لە ئەبی غالبەوە، وتوویەتی: ئەبو ئومامە هەندێك کەللەسەری هەڵواسراوی بینی بەسەر قادرمەکانی مزگەوتی دیمەشقەوە، ئەبو ئومامە وتی: سەگەکانی ئاگر خراپترین کوژراوەکانن لەژێر پانتایی ئاسماندا، باشترین کەسیش ئەوانەن ئەمانەیان کوشتووە، پاشان ئەمەی خوێندەوە ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. منیش بە ئەبی ئومامەم وت: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) بیستووە؟ وتی: ئەگەر جارێك و دووجارو سێ جارو

چوارجار م - تا حەوتی ژمارد - نەبیستبێت بۆم نەوتوون. پاشان دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنە، ئیبن ماجەش لەفەرموودەی سوفیانی کوڕی عەیینەوە، لە ئەبی غالبەوە ریوایەتی کردووەو، ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا لە عەبدولرەزاقەوە، لە موعەممەرەوە، لە ئەبی غالبەوە هاوشێوەیئەمەی ریوایەت کردووە، ئیبن مەردەویەش لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموودەیەکی دووردرێژی زۆر سەیری لە ئەبی زەڕەوە گێڕاوەتەوە.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ﴾ واتە ئەم ئایەتانەی پەروەردگارو بەڵگەو رونکردنەوەکانی بەسەر تۆدا دەخوێنینەوە ﴿نَتْلُوهَا عَلَيْكَ﴾ ئەی موحەممەد ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ واتە ئەوە دەخەینە روو کە لە دنیاو قیامەتدا چ فەرمانێکی لەسەرە ﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە خوای گەورە ستەم لەوان ناکات بەڵکو دادوەریان دەکات، خوا دادوەری دادپەروەرەو هەرگیز ستەم ناکات، چونکە باڵادەست و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، زانایە بەهەموو شتێك و هەرگیز پێویستی بەوەنیە ستەم لە هیچ بەدیهێنراوێکی خۆی بکات، لەبەرئەمە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە هەرهەموویان موڵك و بەندەی خوان ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ واتە بەتەنها ئەو پادشای فەرمانڕەوایە لە دنیاو قیامەتدا.

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَـٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾﴾

خوای گەورە سەبارەت بە ئوممەتی موحەممەد هەواڵ دەدات کە ئەوان چاکترین ئوممەتن، دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ بوخاری دەڵێ: موحەممەدی کوڕی یوسف بۆی گێڕاینەوە، لە سوفیانەوە، لە

مەیسەرەوە، لە ئەبی حازمەوە، لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ وتوویەتی: چاکترین کەسن بۆ خەڵکی، ئەوخەڵکە دەهێنن کاتێ ئەوان کۆت و زنجیر لە گەردنیاندایە، ڕزگاریان دەکەن و دەیان هێننە ناو ئیسلامەوە، ئیبن عەباس و موجاهید و عەتییەی عەوفی و عەکرەمەو عەتاو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەمان شتیان وتووە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ واتە باشترین خەڵکی بۆ خەڵکی، مەبەست پێی ئەوەیە کە ئوممەتی ئیسلام باشترین ئوممەتن بۆ سودگەیاندن و خزمەتکردن بە خەڵکی، لەبەرئەمە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی عەبدولمەلیك بۆی گێڕاینەوە، لە شورەیکەوە، لە سەمماکەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەمیرەوە، لە هاوسەرەکەی دوڕەی کچی ئەبو لەهەبەوە، لە دوڕەوە، وتوویەتی: پیاوێك هەستایەوەو چو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لەکاتێکدا کە لەسەر مینبەر بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چ جۆرە کەسێك چاکترینە؟ فەرمووی: (چاکترین کەس خوێنەوارترینیان و لەخوا ترساوترینیانە، ئەوەیانە کە فەرمانیان بەچاکە پێ دەکات و، لە خراپە بەرگریان دەکات و، لە هەموویان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی ئەگەیەنێت)

هەروەها ئەحمەد لە مەسنەدەکەیداو، نەسائی لە سونەنەکەیداو، حاکم لە موستەدرەکەکەیدا، لە فەرموودەی سەماکەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە، سەبارەت بە: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ ڕیوایەتیان کردووە کە وتوویەتی: بریتین لەو کەسانەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لێ بێت) لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە.

بەڵام ڕاسترینی ئەوەیە کە ئەم ئایەتە گشتیە بۆ هەموو گەل و نەتەوەکان لە هەموو سەردەمەکاندا بەپێی خۆیان، باشترین سەردەمیش ئەو سەردەم و نەتەوەیە بوو کە پێغەمبەر لەکاتی ئەوان و لەناو ئەواندا هات، دوای ئەوان ئەوانەن کە بەدوایاندا هاتن، وەك لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ واتە هەڵبژێراو ﴿لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ [البقرة: ١٤٣].

هەروەها لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەد و جامیعی ترمزی و سونەنی ئیبن ماجەو موستەدرەکی حاکمدا لە ریوایەتی حەکیمی کوڕی معاویەی کوڕی حیدەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ئێوە لە بەرامبەر حەفتا ئوممەتدان، ئێوە چاکترینیانن وە ئێوە بەرێزترینن بەلای پەروەردگارەوە) ئەمە فەرموودەیەکی بەناوبانگەو، ترمزی بە حەسەنی داناوە، وە لە فەرموودەی موعازی کوڕی جەبەل و ئەبی سەعیدەوە هاوشێوەی ئەمە ریوایەت کراوە.

بەڕاستی ئەم ئوممەتە پلەی یەکەمین و بڕاوەی بەدەست هێناوە لە پێشبڕکێی چاکە کردندا بەهۆی موحەممەدی پێغەمبەریەوە (دروودی خوای لێ بێت)، چونکە موحەممەد بەرێزترین و شکۆدارترین بەدیهێنراوی پەروردگارە، رێزدارترین پێغەمبەرە لای خوا، خوای گەورە بەشەرع و یاسایەکی تەواو مەزنەوە رەوانەی کردووە کە بە هیچ پێغەمبەرێك و هیچ رەوانەکراوێکی پێشووی نەداوە، کارکردن لەسەر رێبازو بەرنامەکەی موحەممەد با بڕێکی کەمیش بێت جێگەی بڕێکی زۆری کارکردنی ئوممەتەکان و شوێنکەوتەی ئاینەکانی تر دەگرێت. وەك ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەبدولڕەحمن بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبن زوهەیرەوە، لە عەبدوڵلاوە واتە ئیبن موحەممەدی کوڕی عەقیلەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەلیەوە کە ئیبن حەنەفیەیە دەڵێ: گوێی لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەوەم پێ بەخشراوە کە بەهیچ پێغەمبەرێکی تر نەبەخشراوە)، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چیە؟ فەرمووی: (بە ترساندنی دوژمن سەرخراوم و، کلیلەکانی زەویم پێدراوەو، بە ئەحمەد ناونراوم و، خۆڵ بۆمن بە پاك دانراوەو، ئوممەتەکەشم کراوەتە باشترین ئوممەت). ئا بەم شێوەیە تەنها ئەحمەد ریوایەتی کردووەو، ئیسنادەکەی حەسەنە.

هەروەها ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو عەلا و حەسەنی کوڕی سوار بۆی گێڕاینەوە، لە لەیسەوە، لە معاویەوە، لە ئەبی حەلبەس یەزیدی کوڕی مەیسەرەوە، وتی: لە ئوم دەردائم بیست (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیوت: گوێم لە ئەبو دەردا و بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لێ بێت) وە

ئەوەی گوێم لێی بوو مەبەستی پێش خۆی بوو نەك دوای خۆی دەیفەرموو: (خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی عیسا من پاش تۆ ئوممەتێ دەنێرم ئەگەر شتێکیان هاتەڕێ کە پێیان خۆش بوو سوپاس و ستایش دەکەن، وە ئەگەر شتێکیان بەسەرهات کە پێیان ناخۆش بوو چاوەڕوانی پاداشت لەخوا دەکەن و ئارام دەگرن، نە دانایی هەیەو نە زانایی، وتی: ئەی پەروەردگار ئەمە چۆن بۆ ئەوانە لەکاتێکدا نە دانایی هەیەو نەزانایی؟ فەرمووی: لە دانایی و زانایی خۆمیان پێدەبەخشم) چەندین فەرموودەی تر هاتوون کە واباشە لێرەدا باس بکرێن.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: هاشمی کوڕی قاسم بۆی گێڕاینەوە، لە مەسعودیەوە، لە بەکیری کوڕی ئەخنەسەوە، لە پیاوێکەوە، لە ئەبوبەکری سدیقەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (حەفتا هەزار کەسم پێ بەخشراوە کە بەبێ لێپێچینەوە دەچنە بەهەشتەوە، دەموچاویان وەك مانگی چواردە وایە، دڵەکانیان لەسەر دڵی یەك پیاوە، داوای زیاترم لە پەروەردگارم کرد، خوای گەورەش بۆی زیاد کردم و لەگەڵ هەریەکێکیاندا حەفتا هەزاری پێ بەخشیم) ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: بینیم ئەمە رویا لە دانیشتوانی گوندەکان و ئەوانەی نیشتەجێی دۆڵ و نشێوەکان بوون.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی بەکری سەهمی بۆی گێڕاینەوە، لە هیشامی کوڕی حەسانەوە، لە قاسمی کوڕی مەهرانەوە، لە موسای کوڕی عوبەیدەوە، لە مەیمونی کوڕی مەهرانەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پەروەردگارم حەفتا هەزاری پێ بەخشیم کەبێ لێپێچینەوە دەچنە بەهەشتەوە) عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەدەکرا داوای زیاترت بکردایە؟ فەرمووی: (داوای زیاترم کرد و خوای گەورە لەگەڵ هەر پیاوێکدا حەفتا هەزاری پێ بەخشیم) عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر لە نێو هەردوو دەستیەوە رزگاری بوو، عەبدوڵلا دەڵێ: هەردوو دەستی درێژ کردو، هانی عەبدوڵلای دا، هاشم دەڵێ: ئەمە لەخواوەیەو نازانرێت ژمارەکەی چەندە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو یەمان بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، لەزەمزەمی کوڕی زەرعەوە، وتی: شورەیحی کوڕی عوبەید وتی: سەوبان لە حیمس نەخۆش کەوت، عەبدوڵلای کوڕی قەرتی ئەزدی لەسەر بوو، بەڵام سەری لێ نەدایەوە، پیاوێك لە (کەلاعین) گەڕابویەوە چووە لای سەوبان، سەوبان پێی وت: ئایا دەنوسیت؟ وتی بەڵێ، وتی: بنووسە، نامەیەکی بۆ ئەمیر عەبدوڵلای کوڕی قەرت نووسی (لە سەوبان خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) لە پاشاندا، ئەگەر خزمەتکارێکی عیسا یان موسات لە خزمەتدا بووایە سەردانت دەکرد) پاشان نوسراوەکەی پێچایەوەو بە پیاوەکەی وت: ئەیگەیەنیت بە ئەمیر؟ وتی: بەڵێ، پیاوەکە بە نوسراوەکەوە رۆشت و دای بە ئیبن قەرت، کاتێك نامەکەی بینی، لە ترسانا هەستایەوە، خەڵکەکە وتیان: ئەوە چییەتی ئایا شتێك رویداوە؟ هات تاکو چووە ژوورەوە بۆلای سەوبان و سەعاتێك - ماوەیەکی زۆر - لای دانیشت، پاشان هەستاو سەوبانیش دەستی بە عەباکەیەوە گرت و، وتی: دانیشە تاکو فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) بیستومە، دەفەرموێت: (لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار دەچنە بەهەشتەوە کە نە حسابیان لەسەرەو نە ئەشکەنجەو ئازار، لەگەڵ هەر هەزارێکدا حەفتا هەزار کەسە) لەم رووەوە بەتەنها ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، ئیسنادی گێڕەرەوەکانیشی هەموویان جێی متمانەن و خەڵکی شام و حیمسن، ئەمە فەرموودەیەکی سەحیحە، سوپاس و منەت بۆ پەروەردگاری مەزن.

ڕێگەیەکی تر: تەبەرانی دەڵێ: عەمری کوڕی ئیسحاقی کوڕی زیبریقی حیمسی بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل واتە ئیبن عەیاشەوە، لە باوکمەوە، لە زەمزەمی کوڕی زەرعەوە، لە سەوبانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوای گەورە پەیمانی پێدام کە حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت، لەگەڵ هەر هەزارێکدا حەفتار هەزار هەیە) ئەمە لەبەرئەوەی دەگونجێت ئەو بە زیادکردنی ناوی ئەبی ئەسمای رەحەبیەوە لە نێوان شورەیح و سەوباندا لەبەری کردبێ. خوای گەورەش زاناترە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد ئەڵێ: عەبدولڕەزاق بۆی گێڕاینەوە، لە حەسەنەوە، لە عیمرانی کوڕی حسینەوە، لە ئیبن مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: شەوێکیان قسەی زۆرمان کرد لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لێ بێت)، پاشان سبەینێ ڕۆشتینەوە خزمەتی، فەرمووی: (ئەمشەو هەموو پێغەمبەرانم بە ئوممەتەکانیانەوە نیشان درا، پێغەمبەر هەبوو کە دەرۆشت و سێ کەسی لەگەڵدابوو، پێغەمبەر هەبوو کۆمەڵێکی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر هەبوو یەك کەسی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر هەبوو هیچ کەسی لەگەڵدا نەبوو، تاکو موسا بەلامدا تێپەڕی و کۆمەڵێکی زۆری لە بەنی ئیسرائیلی لەگەڵدا بوو، جێگەی سەرسوڕمانم بوون و وتم: ئەمانە کێن؟ وتی: ئەمە موسای براتەو بەنی ئیسرائیلی لەگەڵدایە، فەرمووی: وتم ئەی ئوممەتەکەی من لەکوێن؟ وترا: بڕوانە بەلای ڕاستتدا، ڕوانیم بینیم چیا تەخت و ڕاکشاوەکە داخراوە دەموچاو بەری گرتووە، پاشان پێم وترا: بڕوانە بەلای چەپتدا، ڕوانیم بینیم ئاسۆ داخراوە بەهۆی دەمووچاوی خەڵکەوە، پێم وترا: ئایا ڕازی بوویت؟ وتم: ڕازی بووم ئەی پەروەردگار، فەرمووی پاشان پێم وترا: لەگەڵ ئەم کەسانەدا حەفتا هەزار کەس دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە) پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (دایك و باوکم بە قوربانتان بن، ئەگەر توانیتان لەو حەفتا هەزارەبن وا بکەن، ئەگەر کەم توانا بوون و کورتتان هێنا با لە ئەهلی چیا تەخت و ڕاکشاوەکە بن، خۆ ئەگەر لە مانیش کورتتان هێنا با لە ئەهلی ئاسۆ بن، چونکە بەڕاستی من بینیم کە خەڵکانێك بەیەکدا تێکەڵ بوون) عەکاشەی کوڕی موحسین هەستایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوا لە خوای گەورە بکە من بکاتە یەکێك لەوانە، واتە لەو حەفتا هەزارە، ئەویش دوعای بۆ کرد، پیاوێکی تر هەستایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعا بۆ منیش بکە تا لەوان بم، فەرمووی: (عەکاشە بۆ ئەم کارە پێش تۆ کەوت) دەڵێ: پاشان گفتوگۆمان کرد و وتمان: پێتان وایە ئەو حەفتا هەزارە کێن؟ ئایا کۆمەڵێکن لەناو ئیسلامدا لە دایك بوون و هیچ هاوەڵێکیان بۆ خوا پەیدا نەکردووە؟ ئەم پرسیارو قسەیەمان بە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) گەشتەوەو فەرمووی: (ئەوانە کەسانێکن نوشتەناکەن و، داوا لە خەڵکی ناکەن

داخیان بکەن و بڕوایان بە شومی نییە، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن) ئا بەم شێوەیە ئەحمەد بەم سەندو چوارچێوەیە ڕیوایەتی کردووە.

بەهەمان شێوە لە عەبدولسەمەدەوە لە هیشامەوە لەقەتادەوە بە ئیسنادێکی هاوشێوە ڕیوایەتی کردووە، لەدوای وتەکەی ئەمەی بۆ زیاد کردووە (ڕازی بووم ئەی پەروەردگار، ڕازی بووم ئەی پەروەردگار، خوای گەورە فەرمووی: ڕازی بوویت؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی بڕوانە بۆلای چەپت - دەڵێ - ڕوانیم بینیم ئاسۆ بە دەموچاوی خەڵك داپۆشراوەو گیراوە، فەرمووی: ڕازی بویت؟ وتم: ڕازی بووم) ئەمەش ئیسنادێکی سەحیحەو بە تەنها ئەحمەد بەمشێوەیە ڕیوایەتی کردووە، ئیخراجیشیان نەکردووە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی مونیع بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولعەزیزەوە، لە حەممادی کوڕی عاسمی کوڕی زەرعەنەوە، لە ئیبن مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لەو بۆنەدا هەموو ئەومەتەکانم نیشاندرا، ئەممەتەکەی خۆیشم نیشاندرا، پاشان بینیمن و زۆری ژمارەو شێوەیان تووشی سەرسوڕمانی کردم، ئەوان دەشت و شاخیان پڕکردبوو، خوایگەورە فەرمووی: ئایا ڕازی بویت ئەی موحەممەد؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: لەگەڵ ئەمانەدا حەفتا هەزار دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە ئەوانیش ئەوانەن کە نوشتە ناکەن و داوا لە خەڵك ناکەن داخیان بکەن و تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن) عەکاشەی کوڕی موحسین هەستایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەخوا بپاڕێرەوە کە من بکاتە یەکێك لەوانە، پێغەمبەر فەرمووی: (تۆ لەوانیت) پیاوێکی تر هەستایەوەو وتی: لەخوا بپاڕێرەوە بۆ منیش تاکو منیش بکاتە یەکێك لەوان؟ فەرمووی: (عەکاشە بۆ ئەو داوایە پێشی تۆ کەوت) حافزی زیائی مەقدیسی ڕیوایەتی کردووەو، وتوویەتی: ئەمە لای من لەسەر مەرجی موسلیمە.

فەرموودەیەکی تر: تەبەرانی دەڵێ: موحەممەدی کوڕی موحەممەدی جەزوعی قازی بۆی گێڕاینەوە، لە عوقبەی کوڕی موکریمەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئەبی عەدیەوە، لە هیشامی کوڕی حەسانەوە، لە موحەممەدی کوڕی

سیرینەوە، لە عیمرانی کوڕی حسینەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوەو ئەشکەنجەدان) وترا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: (ئەوانە ئەو کەسانەن کە داوا لە خەڵکی ناکەن داخیان بکەن و نوشتە ناکەن و، بڕوایان بە شومی و بەخت گرتنەوە نیە، تەنها پشت بەخوای خۆیان دەبەستن) موسلیمیش لە ڕێگەی هیشامی کوڕی حەسانەوە ریوایەتی کردووە، لای ئەو ناوهێنانی عوکاشەی تێدایە.

فەرموودەیەکی تر: لە هەردوو سەحیحەکەداو لە گێڕانەوەی زهریەوە لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە هاتووە کە ئەبو هورەیرە قسەی بۆ کردووە، وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە کە حەفتا هەزارن، دەموچاویان دەردرەوشێتەوە وەك درەوشانەوەی مانگی چواردە) ئەبو هورەیرە وتی: عوکاشەی کوڕی موحسنی ئەسەدی هەستایەوەو داوایەکی لەسەری پێشکەش کردو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لەخوا بپاڕێرەوە من بکاتە یەکێك لەوان، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوایە گیان ئەو بکەرە یەکێك لەوان) پاشان پیاوێکی ئەنساری هەستایەوەو هەمان قسەی عوکاشەی کرد، پێغەمبەر فەرمووی: (عوکاشە بۆ ئەو داوایە پێشی دایەوە).

فەرموودەیەکی تر: ئەبو قاسمی تەبەرانی دەڵێ: یەحیای کوڕی عوسمان بۆی گێڕاینەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبی مەریەمەوە، لە ئەبو غەسانەوە، لە ئەبی حازمەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار دەچنە بەهەشتەوە - یان حەوت سەد هەزار - هەندێکیان دەستیان بە هەندێکی تریانەوە گرتووە، تاکو یەکەم و کۆتا کەسیان دەچنە بەهەشتەوە، دەموچاویان لەسەر شێوەی مانگی چواردەیە) بوخاری و موسلیم هەرهەموویان لە قوتەیبەوە، لە عەبدولعەزیزی کوڕی حازمەوە، لە باوکیەوە، لە سەهلەوە گێڕاویانەتەوە.

فەرموودەیەکی تر: موسلیمی کوڕی حەجاج لە سەحیحەکەیدا دەڵی: سەعیدی کوڕی مەنسور بۆی گێڕاینەوە، لە هەشیمەوە، لە حسینی کوڕی

عەبدولڕەحمانەوە، وتی: من لای سەعیدی کوڕی جوبەیر بووم وتی: کامتان ئەو ئەستێری بینی کە دوێنێ نەماو ون بوو؟ وتم: من، پاشان وتم: بەڵام من لە نوێژەکەدا نەبووم، چونکە گەزرا بووم، وتی: ئەی چیت کرد. وتم: نوشتەم کرد، وتی: چی وای لێکردیت نوشتە بکەیت؟ وتم: فەرموودەیەك کە شەعبی بۆی گێڕاینەوە، وتی: شەعبی چی بۆ گێڕاونەتەوە؟ وتم: لە بورەیدەی کوڕی موسەیبی ئەسلەمیەوە بۆی گێڕاینەوە کە وتوویەتی: (نوشتەکردن نیە تەنها بۆ چاو و تا نەبێت) وتی: بەڕاستی ئەو کەسە چاکی کرد کە بە تەواوی گوێی گرت. بەڵام ئیبن عەباس لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) بۆ ئێمەی گێڕایەوە کە فەرموویەتی: (نەتەوەکانم نیشاندراو بینیم کە پێغەمبەرێك کۆمەڵێکی لەگەڵدایە و پێغەمبەرێك پیاوێك یان دوو پیاوی لەگەڵدایەو، پێغەمبەرێکی تر هیچ کەسێکی لەگەڵدا نییە، ئەوەبوو کۆمەڵێکی زۆر گەورم بۆ بەرز کرایەوەو گومانم برد کە ئەوە ئوممەتەکەی من بن، پێم وترا: ئەوە موساو قەومەکەیەتی، بەڵام بڕوانە بۆ ئاسۆ، ڕوانیم بینیم کۆمەڵێکی زۆر گەورەن، پێم وترا: بڕوانە بۆ ئاسۆکەی تر، لەوێشەوە کۆمەڵێکی زۆر گەورەم بینی، پێم وترا: ئەوە ئوممەتەکەی تۆیەو لەگەڵیاندا حەفتا هەزار کەس هەیە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوەو ئەشکەنجەدان)، پاشان هەستایەوەو ڕۆشتە ماڵەکەیەوە، خەڵکەکەش دەستیان کرد بە قسەکردن سەبارەت بەو حەفتا هەزارەی بێ لێپێچینەوەو ئەشکەنجە دەچنە بەهەشتەوە، هەندێکیان وتیان: دەگونجێت ئەوانە ئەو کەسانە بن کە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوایان کردووە، هەندێکی تریان وتیان: دەگونجێت ئەو کەسانەبن کە لە ئیسلامدا لە دایك بوون و هیچ هاوەڵێکیان بۆ خوا پەیدا نەکردووە، باسی شتی تریشیان کرد، پێغەمبەری خوا ڕۆشتە دەرەوە بۆناویان و فەرمووی: (ئەوە چییە ڕۆچوونەتە ناوباسەکەوەو باسءخواسی دەکەن؟) ئەوانیش هەواڵیان دایە، فەرمووی: (ئەوانە ئەو کەسانەن نە نوشتە بۆخۆیان دەکەن و نە نوشتە بۆ خەڵك دەکەن، نە بڕوایان بە شومی هەیەو، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن) عوکاشەی کوڕی موحسن هەستایەوەو وتی: لەخوا بپاڕێرەوە من بکاتە یەکێك لەوانە، فەرمووی: (تۆ لەوانیت) پاشان پیاوێکی تر هەستایەوەو وتی: دوعا بۆ منیش بکە خوا بمکاتە یەکێك لەوان،

فەرمووی: (عوکاشە بۆ ئەو داوایە پێشت کەوت) بوخاری لە ئوسەیدی کوڕی زەیدەوە، لە هەشیمەوە ئیخراجی کردووە بەڵام (نوشتە ناکەن)ی تیا نیە.

فەرموودەیەکی تر: ئەحمەد دەڵێ: رومی کوڕی عوبادە بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبن جورەیجەوە، لە ئەبو زوبەیرەوە کە گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا بووە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی، فەرموودەکەی گێڕایەوە، ئەمەشی تیا بوو، (یەکەم کۆمەڵ کە رزگاریان دەبێت دەموچاویان وەك مانگی چواردە وایەو حەفتا هەزارن کە لێپێچینەوەیان لێ ناکرێت، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن وەك درەوشاوەترین ئەستێرە وان لە ئاسماندا) پاشان بەمشێوەیە باسی پاشماوەی فەرموودەکەی کرد. موسلیم لە فەرموودەی رومەوە ریوایەتی کردووە، بەڵام ئەو ناوی پێغەمبەری نەهێناوە (دروودی خوای لێ بێت).

فەرموودەیەکی تر: حافز ئەبوبەکری کوڕی عاسم لە کتێبی (السنن)ی خۆیدا دەڵێ، ئەبوبەکری کوڕی ئەبی شەیبە بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە، لە ئەبی ئومامەی باهیلی بیستووە کە وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوابوو (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (پەروەردگارم بەڵێنی پێدام کە حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە، لەگەڵ هەر هەزارێکدا حەفتا هەزار نە لێپێچینەوەیان لەسەرەو نە ئەشکەنجە، لەگەڵ سێ مشت لە مشتەکانی پەروەردگاری باڵادەست و مەزنم) وە بەمشێوەیە تەبەرانی لە رێگەی هیشامی کوڕی عەممارەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە گێڕاویەتیەوە، ئەمەش ئیسنادێکی جەیدە.

رێگەیەکی تر : لە ئەبی ئومامەوە، ئیبن ئەبی عاسم وتوویەتی: دوحەیم بۆی گێڕاینەوە، لە وەلیدی کوڕی موسلیمەوە، لە سەفوانی کوڕی عەمرەوە، لە سەلیمی کوڕی عامرەوە، لە ئەبی یەمانی هەوزنیەوە کە ناوی عامری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی لوحەییە، لە ئەبی ئومامەوە، لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (خوای گەورە بەڵێنی پێدام لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار بخاتە بەهەشتەوە بێ لێپێچینەوە) یەزیدی کوڕی ئەخنەس دەڵێ: سوێند بەخوا ئەوانە لەناو ئەوممەتەکەتداهیچ نین جگە لوێنەی مێشە سوورەیەك

نەبێت لەناو مێشەکاندا، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بەڕاستی خوای گەورە بەڵێنی حەفتا هەزاری پێداوم، لەگەڵ هەر هەزارێکدا حەفتا هەزار، سێ مشتیشی بۆ زیاد کردم) بەهەمان شێوە ئەمە ئیسنادێکی حەسەنە.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو قاسمی تەبەرانی دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی خولەید بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو تەوبەوە، لە معاویەی کوڕی سەلامەوە، لە زەیدی کوڕە سەلامەوە کە لە باوکی سەلامی بیستووە وتوویەتی: عامری کوڕی زەیدی بوکالی بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە عوتبەی کوڕی عەبدولسەلما بووە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پەروەردگاری گەورەو مەزنم بەڵێنی پێدام حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە، پاشان هەر حەفتا هەزارێك شەفاعەت بۆ حەفتا هەزار دەکات، پاشان پەروەردگار سێ مشت بە مشتەکانی خۆی دەپێوێت) عومەری کوڕی خەتاب الله اکبری کرد وتی: حەفتای یەکەم خوای گەورە دەیانکاتە تکاکار بۆ باوباپیران و نەوەکان و هۆزو تیرەکانیان، ئومێدەوارم خوای گەورە بمکاتە یەکێك لە مشتەکانی کۆتایی، حافز زیا و ئەبو عەبدوڵلای مەقدیسی لە کتێبەکەیدا (صفه الجنه) دەڵێ: وانازانم ئەم ئیسنادە گرفتی هەبێت، خوا زانا ترە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: یەحیای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە، لە هیشام واتە دەستەوائیەوە، لە یەحیای کوڕی ئەبی کەسیرەوە، لە هیلالی کوڕی ئەبی مەیمونەوە، لە عەتای کوڕی سەیارەوە کە ڕیفاعەی جەهەنی قسەی بۆ کردووە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێ بێت) ڕۆشتین تا چوینە (کەدید) یان وتی قەدید، فەرموودەیەکی گێڕایەوەو، لەو فەرموودەیەدا ئەمەی تیابوو، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: (پەروەردگاری باڵا دەست و مەزنم بەڵێنی پێدام کەلە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار بخاتە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە، وەمن ئومێدەوارم ئەوان نەچنە ناوبەهەشتەوە تاکو ئێوەو ئەو کەسانەی چاکن لە هاوسەرەکانتان و نەوەکانتان لە ماڵەکانی بەهەشتدا جێگیر نەبن) زیا و وتی: ئەمە لای من لەسەر مەرجی موسلیمە.

فەرموودەیەکی تر: عەبدولڕەزاق وتی: موعەمەر لە قەتادەوە هەواڵی پێداین لە نەزری کوڕی ئەنەسەوە، لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پەروەردگارم بەڵێنی پێدام لە ئوممەتەکەم چوار سەد هەزار بخاتە بەهەشتەوە) ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: داوای زیاترمان بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (سوێند بەخوا هەربەوجۆرەیە) عومەر وتی: بەستە ئەی ئەبوبەکر، وتی: وازم لێ بێنە تۆ چ زیانێك دەکەیت ئەگەر خوا هەموومان بخاتە بەهەشتەوە، عومەر وتی ئەگەر خوا بیەوێت هەموو بەدیهێنراوەکانی بەیەك مشت دەخاتە بەهەشتەوە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (عومەر ڕاستی کرد) ئەم فەرموودەیە بەم ئیسنادە تەنها عەبدولڕەزاق هێناویەتی.

زیا و دەڵێ: حافز ئەبو نەعیمی ئەسبەهانیش ریوایەتی کردووەو، دەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موخەلەد بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبراهیمی کوڕی هەیسەمی بەلەدیەوە، لە سولەیمانی کوڕی حەربەوە، لە ئەبو هیلالەوە، لە قەتادەوە، لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (پەروەردگارم بەڵێنی پێدام لە ئوممەتەکەم سەد هەزار بخاتە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە) ئەبو بەکر وتی: داوای زیاترمان بۆ بکە، فەرمووی: (هەر بەمشێوەیەیە) سولەیمانی کوڕی حەرب بەهەمان شێوە ئاماژەی بە دەستی کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، داوای زیاترمان بۆ بکە، عومەر وتی: خوای گەورە توانای هەیە بەیەك مشت هەموو خەڵك بخاتە بەهەشتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (عومەر ڕاستی کرد) ئەم فەرموودەیە لەم ڕووەوە غەریبە، ئەبو هیلالیش کە ناوی موحەممەدی کوڕی سەلیمی ڕاسبیە خەڵکی بەسرەیە.

ڕێگەیەکی تر لە ئەنەسەوە: حافز ئەبو یەعلا وتی: موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولقادری کوڕی سەری سلمیەوە، لە حەمیدی کوڕی ئەنەسەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار دەچنە بەهەشتەوە) وترا: داوای زیاترمان بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (بۆ هەرپیاوێك حەفتا هەزار هەیە) وتیان: داوای

زیاترمان بۆ بکە، لەوکاتەدا پێغەمبەر لەسەر گردۆڵکەیەکی لم بوو، فەرمووی: (هەر بەمشێوەیە) مشتی گرتەوەو ئاماژەی پێکرد، وتیان: ئەوەی پاش ئەمە دەچێتە ئاگرەوە خوای گەورە دووری بخاتەوە. ئەمە ئیسنادێکی جەیدە، پیاوەکانی هەموویان متمانە پێکراون جگە لە عەبدولقاهیری کوڕی سیری، لە ئیبن موعین دەربارەی پرسیار کراوە وتوویەتی پیاوێکی چاکە.

فەرموودەیەکی تر: تەبەرانی لە فەرموودەی قەتادەوە لە ئەبی بەکری کوڕی ئەنەسەوە ریوایەتی کردووە، لە ئەبی بەکری کوڕی عومەیرەوە، لە باوکیەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (خوای گەورە بەڵێنی پێداوم لە ئوممەتەکەم سێ سەد هەزار بخاتە بەهەشتەوە) عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوای زیاترمان بۆ بکە، فەرمووی: (بەمشێوەیە، بەدەستی) عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوای زیاترمان بۆ بکە عومەر وتی: بەسە، خوای گەورە ئەگەر بیەوێت هەموو خەڵکی بەیەك مشت دەخاتە بەهەشتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (عومەر راستی کرد).

فەرموودەیەکی تر: تەبەرانی دەڵی، ئەحمەدی کوڕی خولەید بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو تەوبەوە، لە معاویەی کوڕی سەلامەوە، لە زەیدی کوڕی سەلامەوە کە لە باوکیەوە واتە لەئەبو سەلامی بیستووە وتوویەتی: عەبدوڵلای کوڕی عامر بۆی گێڕامەوە کە قەیسی کندی قسەی بۆ کردووە کە ئەبا سەعیدی ئەنساری بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بەڕاستی پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم کە لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار بخاتە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە، هەر هەزارێکیش تکاو شفاعەت بۆ حەفتا هەزار دەکات، پاشان پەروەردگارم سێ مشت بە هەردوو دەستی خۆی دەپێوێت) قەیس بەمشێوەی وت، منیش بە ئەبی سەعیدم وت: تۆ ئەمەت لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە؟ وتی: بەڵێ بەگوێی خۆم، دڵیشم بە باشی وەری گرت و ئاگای لێی بوو، ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەمەش ئەگەر خوا ویستی لێ بێت موهاجیرەکانی ئوممەتەکەم دەگرێتەوەو ئەوانی تریشی خوای گەورە دەیپەخشێتە عەرەبەکانمان) ئەم فەرموودەیە موحەممەدی کوڕی سەهلی کوڕی عەسکەریش لە ئەبی تەوبەو

ڕەبیعی کوڕی نافیعەوە بە ئیسنادێکی هاوشێوەی ئەمە گێڕاویەتیەوە، ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: ئەبو سەعید وتی: ئەمەی لای پێغەمبەری خوا حساب کرد و هەمووی کردیە چوارسەد هەزار هەزارو نوسەد هەزار هەزار.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو قاسمی تەبەرانی دەڵێ: هاشمی کوڕی مەرسەدی تەبەرانی بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، باوکم بۆی گێڕامەوە، لە زەفرەی کوڕی زەرعەوە، لە شورەیحی کوڕی عوبەیدەوە، لە ئەبی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پاشان، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئێوە کۆمەڵێك بەرەو بەهەشت دەنێرێن هەرهەموویان بە توندی پێ بەزەویدا دەنێن، فریشتەکان دەڵێن: بۆچی ئەوەی لەگەڵ موحەممەددا هاتووە زیاترە لەوەی لەگەڵ پێغەمبەراندا هاتووە؟) ئەمە ئیسنادێکی حەسەنە.

جۆرێکی تر: لەو فەرموودانەی ئاماژە بە ڕێزو پلەو پایەی ئەم ئوممەتەو حورمەتی بەلای پەروەردگارەوە دەکەن و بەڵگەن لەسەر ئەوەی باشترین ئوممەتە لە دنیاو لە قیامەتدا.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: یەحیای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی جورەیجەوە، وتی ئەبو زوبەیر لە جابرەوە بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (من ئومێدەوارم ئەوانەی شوێنم دەکەون لە ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا چواریەکی بەهەشت بن) دەڵێ: ئێمەش (الله اکبر)مان کرد، پاشان فەرمووی: (ئومێدەوارم ببنە سێ یەکی هەموو خەڵکی) دەڵێ: (الله اکبر)مان کرد، پاشان فەرمووی: (ئومێدەوارم ببنە نیوە). ئا بەمشێوەیە لە رومەوە ئەویش لە جورەیجەوە گێڕاویەتیەوە، ئەوەش لەسەر مەرجی موسلیمە.

لە هەردوو سەحیحەکەشداو لە فەرموودەی ئەبی ئیسحاقی سوبەیعیەوە، لە عەمری کوڕی مەیمونەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە چەسپاوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووین: (ئایا ڕازی نابن چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن؟) ئێمەش (الله اکبر)مان کرد و پاشان فەرمووی: (ئایا هەر ڕازی نابن ئەگەر سێ یەکی خەڵکی بەهەشت بن؟) ئێمە

(الله اكبر)مان کردو، پاشان فەرمووی: (بەڕاستی من ئومێدەوارم ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن).

ڕێگەیەکی تر: لە ئیبن مەسعودەوە، تەبەرانی دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی قاسمی کوڕی مساور بۆی گێڕاینەوە، لە عەفانی کوڕی موسلیمەوە، لە عەبدولواحیدی کوڕی زیادەوە، لە حارسی کوڕی حەسیرەوە، لە قاسمی کوڕی عەبدولرەحمانەوە، لە باوکیەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە، وتی: پێغەمبەر خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئێوەماڵتان چۆن دەبێت ئەگەر چواریەکی بەهەشت بۆ ئێوە بێت و سێ بەشەکەی تری بۆ هەموو خەڵکانی تر بێت؟) وتیان: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترین. فەرمووی: (چۆنە بەلاتانەوە ئێوە سێ یەکی بەرن؟) وتیان: ئەوە زۆرترە، فەرمووی: (بەلاتانەوە چۆنە ببنە نیوە ئەهلی بەهەشت؟) وتیان: ئەوە زۆر ترە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەهلی بەهەشت سەد و بیست ریزن، لەو سەد و بیست ریزە هەشتای بۆ ئێوەیە) تەبەرانی دەڵێ بە تەنها حارسی کوڕی حەسیرە هێناویەتی بە غەریبی داناوە

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەبدولسەمەد بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولعەزیزی کوڕی موسلیمەوە، لە زیراری کوڕی موڕەی ئەبو سینانی شەیبانیەوە، لە موحاریبی کوڕی دیسارەوە، لە ئیبن بورەیدەوە، لە باوکیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ئەهلی بەهەشت سەد و بیست ریزن، ئەم ئوممەتە لەوسەدوبیستە هەشتا ریزن). هەروەها لە عەفانەوە، لە عەبدولعەزیزەوە ریوایەتی کردووەو، ترمزی لە فەرموودەی ئەبی سینانەوە ئیخراجی کردووە، وتوویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنە، وە ئیبن ماجە لە فەرموودەی سوفیانی سەوریەوە، لە عەلقەمەی کوڕی مەرسەدەوە، لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە ریوایەتی کردووە.

فەرموودەیەکی تر: تەبەرانی لە فەرموودەی سولەیمانی کوڕی عەبدولڕەحمانی دیمەشقیەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: موسای کوڕی غەیلان بۆی گێڕاینەوە، لە سوفیانەوە، لە ئەبی عەمرەوە، لە باوکیەوەو ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، وتوویەتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ۝٣٩﴾

وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ ﴾ [الواقعة ٣٩، ٤٠]. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشتن، ئێوە سێ یەکی بەهەشتن، ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشتن، ئێوە دو سێ یەکی خەڵکی بەهەشتن).

عەبدولڕەزاقیش دەڵی: موعەمەر لە ئیبن تاوسەوە هەواڵی پێداین، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئێمە دواهەمین و یەکەمینەکانی خەڵکی بەهەشتین لە ڕۆژی قیامەتدا، ئێمە یەکەم کەسین دەچینە ناو بەهەشتەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەوان پێش ئێمە کتێبیان بۆ هاتووەو ئێمە پاش ئەوان بۆمان هاتووە، بەڵام خوای گەورە ئێمەی هیدایەت دا بۆ ئەو شتەی ئەوان ناکۆکیان هەبوو تیایدا لە حەق و ڕاستی، ئەمە ئەو ڕۆژەیە ئەوان ناکۆکیان هەبوو لەسەری، بەڵام خەڵکی بۆ بڕواهێنان بەم ڕۆژە شوێنی ئێمە کەوتن، سبەینێ بۆ گاورو جولەکە لە پاش سبەنێوە). بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە لە فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی تاووسەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) بە مەرفوعی بەهەمان شێوە.

هەروەها بوخاریش لە ڕێگەی ئەعمەشەوە، لە ئەبی سالحەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، ریوایەتی کردووە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئێمە دواهەمین یەکەمینەکانین لە ڕۆژی قیامەتدا، وە ئێمە یەکەمین کەسین کە دەچینە بەهەشتەوە) هەموو فەرموودەکەی باس کردووە.

فەرموودەیەکی تر: دار ئەلقوتنی لە (الأفراد)دا لە فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیلی زەهریەوە دەگێڕێتەوە، لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە، لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بەهەشت حەرام کراوە لەسەر هەموو پێغەمبەران تاکو من تێی دەچم، وە حەرامکراوە لەسەر ئوممەتەکان تاکو ئوممەتی من تێی دەچێت) پاشان وتی: بەتەنها ئیبن عەقیل لە زەهریەوە گێڕاویەتیەوە، جگە لەو کەسی تر لێوەی نەیگێڕاوەتەوە، زوهەیری کوڕی ئیبن موحەممەد بە تەنها لە ئیبن عەقیلەوە گێڕاویەتیەوە، عەمری کوڕی ئەبی سەلەمەش بە تەنها لە زوهەیرەوە گێڕاویەتیەوە. ئەبو ئەحمەدی کوڕی عودەی

حافزیش گێڕاویەتیەوەو، وتوویەتی: ئەحمەدی کوڕی حسەینی کوڕی ئیسحاق بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو بەکری ئەعیون موحەممەدی کوڕی ئەبی عەتتابەوە، لە ئەبو حەفسی تەنیسیەوە واتە عەمری کوڕی ئەبی سەلەمەوە، لە سەدەقەی دیمەشقیەوە، لە زوهەیری کوڕی موحەممەدەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیلەوە، لە زەهریەوە.

هەروەها سەعلەبی گێڕاویەتیەوە لە: ئەبو عەباسی موخلیدیەوە، لە ئەبو نەعیم عەبدولمەلیکی کوڕی موحەممەدەوە، لەئەحمەدی کوڕی عیسای تەنیسیەوە، لە عەمری کوڕی ئەبی سەلەمەوە، لە سەدەقەی کوڕی عەبدوڵلاوە، لە زوهەیری کوڕی موحەممەدەوە، لە ئیبن عەقیلەوە، هەموو ئەم فەرموودانەش لە واتای ئەم ئایەتەدا بوون کە خوای گەورە فەرمووی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾، هەرکەس لەم ئوممەتەدا رازاوەبێت بەم سیفەتانە ئەوە لەگەڵ ئوممەتەکەدا دەچێتە ژێر سێبەری ئەم ستایشەی پەروەردگارەوە، وەك قەتادە وتویەتی: پێمان گەشتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب لە حەجێك لەو حەجانەدا کردی، پەلەپەلی لە خەڵکەکە بینی، ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾، پاشان وتی: هەرکەس ئەوە دڵخۆشی دەکات کە لەو ئوممەتە بێت، با مەرجەکانی خوا لەسەر ئەو ئوممەتە جێبەجێ بکات، ئیبن جەریر ریوایەتی کردووە. هەرکەسیش بەو سیفەتانە خۆی نەڕازێنێتەوە ئەوە هاوشێوەی ئەهلی کیتابە کە خوای گەورە بەخراپە ناوی هێناون و دەفەرموێت: ﴿كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ﴾ [المائدة: ٧٩] لەبەرئەمە کاتێك خوای گەورە وەسفی ئەم ئوممەتەی کرد بەو سیفەتانە، چووە ناو زەمکردن و بە خراپە ناوهێنانی گاورو جولەکەو سەرزەنشت کردنیانەوە، فەرمووی: ﴿وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ﴾، واتە ئیمان بەوەی بۆ سەر موحەممەد دابەزیوە ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ واتە کەسێك لەوان بڕوای بەخواو بەوە هەیە کە بۆ ئێوەو بۆ خۆیان دابەزیوە، بەڵکو زۆربەیان لەسەر گومڕایی و بێ باوەڕی و تاوان و سەرکەشین.

دواتر خوای گەورە هەواڵ و مژدە بە بەندە ئیماندارەکانی خۆی دەدات بەوەی سەرکەوتن و بردنەوە بۆ ئەوانە بەسەر گاورو جولەکە بێ باوەڕەکاندا،

خوای گەورە فەرمووی: ﴿لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًىۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾﴾ هەر بەمشێوەیەش بوو، ئەمە روویدا، ئەوەبوو لە ڕۆژی خەیبەردا خوای گەورە سەرشۆڕی کردن و لوتی شکاندن، بەهەمان شێوە لەپێش خەیبەر هەمان شکست و سەرشۆڕی بەسەر جولەکەکانی بەنی قەینوقاع و بەنو نەزیر و بەنو قورەیزەدا هات، خوای گەورە هەموویانی سەرشۆڕ کرد، بەهەمان شێوە گاورەکانیش لە شام لە زیاد لە جێگەیەکدا لەلایەن هاوەڵانەوە تێك شکێنران، موڵك و دەسەڵاتی شامیان بۆ هەتا هەتایە لێ سەنرایەوە، تا ئەمڕۆش دڵسۆزانی ئیسلام لەشام راوەستاوو ئامادەن تا ئەوکاتەی عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێتە خوارەوە هەر وا دەبن، ئەوکاتە فەرمان بە دەستووری ئیسلام دەکەن و شوێنی رێبازی موحەممەدی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەکەون، خاچ دەشکێنرێت و بەراز دەکوژرێت و سەرانە هەڵدەگیرێت و جگە لە ئیسلام هیچ ئایینێکی تر وەرناگیرێت.

دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتە خوای گەورە سەرشۆڕی و نزمی و بچوکی پێوە لکاندن و ئەوان لە هەرکوێ بن و هەرچۆن بن بڕوا ناهێنن ﴿إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، واتە مەگەر بە ئەستۆی پەروەردگار بێت، کە بریتیە لە بەڵێنی لە ئەستۆگرتنیان و دانانی سەرانە لەسەریان و فەرزکردنی حوکمی یاسا بەسەریاندا ﴿وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتە دڵنیاییەك لە خەڵکەوە بۆ ئەوان، هەروەك چۆن لە ئاگر بەست و رێکەوتننامەو بەدیل گرتندا، ئەمە هەیە کە بەدیل گیراوێك لەلایەن موسڵمانێکەوە پەنا بدرێت، ئەگەر ئافرەتیش بێت، تەنانەت ئەگەر ئەو موسڵمانە کۆیلەش بێت، لەسەر یەکێك لە وتەکانی زانایان، ئیبن عەباس دەڵێ ﴿إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتە پەیمانێك لە خواوەو پەیمانێك لە خەڵکەوە، موجاهیدو عەکرەمەو عەتاو زوحاك و حەسەن و قەتادەو سەدی و رەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەروایان وتووە.

کە دەشفەرموێت: ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، واتە پابەندبن ئەوان چەسپ دەبن بە غەزەب و تووڕەییەکەوە لەلایەن پەروەردگارەوە کە شایستەی ئەوەن ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ﴾، واتە فەرزکراوە لەسەریان بەقەدەرو بەشەرع کە

ئەبێ وابن، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾، واتە ئەوەی وای لێکردن بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن خۆ بەزلزانین و لە یاسا دەرچوون و حەسودیان بوو، کە سەرشۆڕی و ریسوابوون و بچوکبوونەوەو هەژاری بەسەردا هێنان، ئەمەش بەشێوەیەکی بەردەوام و پەیوەستە بەهەمان حاڵی خراپیانەوە لە قیامەتدا، دواتر خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ﴾ واتە ئەوەی وای لێکردن بڕوا بە ئایەتەکانی خوا نەهێنن و پێغەمبەرانی خوا بکوژن ئەوەبوو کە ئەوان سەرپێچی زۆریان لە فەرمانەکانی خوا دەکرد و بەگوڕ بەرەو سەرپێچی خوا دەڕۆشتن، دەستدرێژیان دەکردە سەر شەرع و بەرنامەی پەروەردگار، پەنا بەخوا لەو ڕەفتارانەیان، خوای گەورە پشت و پەنامانە.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێ: یونس بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو داودی تەیالیسەوە، لە شوعبەوە، لە سولەیمانی ئەعمەشەوە، لە ئیبراهیمەوە، لە ئەبی موعەمەری ئەزدیەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: بەنی ئیسرائیل لەیەك ڕۆژدا سێ سەد پێغەمبەریان دەکوشت و، پاشان لە کۆتایی ڕۆژەکەدا بازاڕێکیان بە کوشتنیان دادەنا.

﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ
وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ
بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ
الصَّالِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ
بِالْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا
أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ
مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ
قَوْمٍ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ
﴿١١٧﴾﴾

ئیبن ئەبی نەجیح دەڵێ: حەسەنی کوڕی یەزیدی عیجلی بڕوای وایە، کە ئیبن مەسعود دەربارەی ئەم وتەیەی خوا: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ﴾ وتویەتی: ئەهلی کیتاب - گاورو جولەکە - و ئوممەتی موحەممەد وەك یەك نین، سەدیش هەرواى وتووە، ئەو فەرموودەیەشی کە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە مەسنەدەکەیدا ریوایەتی کردووە پشتیوانی لەم قسەیە دەکات: ئەبو نەزرو حەسەنی کوڕی موسا بۆی گێڕاینەوە، وتیان: شەیبان لە عاسمەوە بۆی گێڕاینەوە، لە زورەوە، لە ئیبن مەسعودەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) نوێژی خەوتنانی دواخست و، پاشان ڕۆشتە دەرەوە بۆ مزگەوت، بینی خەڵکەکە چاوەڕوانی نوێژ دەکەن، فەرمووی: (بەڵام لە شوێنکەتووی ئەم ئاینانەی تر کەسێك نییە جگە لە ئێوە کە لەم کاتەدا یادی خوا بکات) وتی ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ تا دەگاتە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾.

ئەوەی باوە لای زۆرێك لە موفەسیرەکان وەك موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و کەسانی تر باسیان کردووە، هەروەها عەوفی لە ئیبن عەباسەوە ریوایەتی کردووە - کە ئەم ئایەتانە - سەبارەت بەو زانایانەی ئەهلی کیتاب هاتنە خوارەوە کە بڕوایان هێنابوو، وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و ئەسەدی کوڕی عوبەید و سەعلەبەی کوڕی سەعیەو ئوسەیدی کوڕی سەعیەو جگە لە مانیش، مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە ئەمانەی بڕوایان هێناوە وەك ئەو گاورو جولەکانە نین کە پێشتر ناویان بەخراپە هاتووە، ئەم بڕوادارانەو ئەوانی تر هەر هەموویان وەك یەك نین و لەیەك ئاستدا نین، بەڵکو تیایاندایە ئیماندارەو تیایاندایە ستەمکارە، لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ﴾ هەستاوە بە جێبەجێکردنی فەرمانی خواو گوێڕایەڵی ڕێبازەکەیەتی و شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەیەتی، ئەو کەسە ڕاوەستاوە، واتە لەسەر ڕاستە شەقامەو ڕاست ڕێ دەکات ﴿يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ واتە شەو هەڵدەستن و زۆر بە ئاگادەبن و یادی خوا دەکەن و، لە نوێژەکانیاندا قورئان دەخوێنن ﴿يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٤﴾﴾ ئەم کەسانە ئەو

کەسانەن کە لە کۆتایی سورەتەکەدا باسکراون: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَـٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾ [آل عمران: ١٩٩] لەبەرئەوەیە خوای گەورە لێرەدا فەرمووی ﴿وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ﴾ واتە لای خوا ون نابێت و بەفیڕۆ ناچێت، بەڵکو پاداشتیان دەداتەوە بە فراوانترین پاداشت ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ﴾ واتە کاری هیچ کارکەرێکی لا ون نابێت و، پاداشتی هیچ کردەوەیەکیشی لا زایە نابێت.

پاشان خوای گەورە دەربارەی بت پەرستەکان هەواڵ دەدات و دەفەرموێت: ﴿لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ واتە سزاو تووڕەیی و ئەشکەنجەی خوایان لێ ناگێڕێتەوە ئەگەر خوای بیەوێت لە دژیان بیکات ﴿وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾.

پاشان خوای گەورە نموونەیەك بۆ خەرجی و سەرفی بێ باوەڕان لە ژیانی دنیادا دێنێتەوە، موجاهید و حەسەن و سەدی ئەمەیان وتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ﴾ واتە ساردیەکی توندو سەختی تێدا بێت، ئیبن عەباس و عەکرەمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و قەتادەو زوحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و کەسانی جگە لەمان والێکیان داوەتەوە.

عەتائیش دەڵێ: ساردی و سەهۆڵ، هەروەها لە ئیبن عەباس و موجاهیدەوە بەهەمان شێوە دەڵێن ﴿فِيهَا صِرٌّ﴾ واتە ئاگر، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکەم، چونکە ساردی زۆر بە تایبەتی سەهۆڵ بەندان کشتوکاڵ و بەروبومەکان دەسوتێنێت، هەروەك چۆن ئاگر شتێك دەسوتێنێت ﴿أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ﴾ واتە ئەیسوتێنێت، واتە ئەو بایە ئەگەر بدات لە کشتوکاڵێك کە کاتی چنینەوەی بەروبووم و پێگەشتنی بێت ئەوە خاپوری دەکات و هەر بەروبووم و ڕەگێکی تێدابێت دەیسوتێنێت، لەناوی دەبات و خراپی دەکات و بێ کەڵکی دەکات لەکاتێکدا خاوەنەکەی زۆر پێویستی پێی بێت، بێ باوەڕەکانیش وەك ئەم نموونەیە وان، خوای گەورە پاداشت و بەروبوومی کردەوەکانیان هەر لەم دنیایەدا لەناو دەبات، وەك چۆن ئەو کشتوکاڵەی بە تاوانی خاوەنەکەی سوتاند، بەهەمان شێوە ئەو بێ باوەڕانە کردەوەکانیان بێ بناغەو بنچینە بنیات ناوە ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَـٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا
وَدُّوا۟ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ
قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَـٰٓأَنتُمْ أُو۟لَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا
يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَـٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ عَضُّوا۟
عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ
﴿١١٩﴾ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا وَإِن
تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ
﴿١٢٠﴾﴾

خوای گەورە قەدەغەی دەکات لە بەندەکانی کە دوڕووەکان بکەنە جێگەی ڕازونیازی خۆیان و متمانەیان پێ بکەن، واتە نابێت نهێنیەکانی خۆیان لای دوڕووەکان بدرکێنن و باس لە پلانی خۆیان دژ بەبێ باوەڕەکان لای ئەوان بکەن، دوڕووەکانیش بە هەموو تواناو لێ بڕانێکیانەوە دژ بە ئیمانداران ڕەفتار دەکەن، واتە هەوڵی پێچەوانە ڕەفتار کردن و زیان پێ گەیاندنیان دەدەن هەرچەندێکیان بۆ بکرێت و بە هەرشتێك لە دەستیان بێت لە فروفێڵ و پیلان گێڕان، بەردەوام ئاواتی ئەو شتانە دەخوازن کە ئیمانداران ئیحراج دەکەن و کاریان لەسەر قورس دەکەن، خوای گەورەش کە دەفەرموێت: ﴿لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ﴾ واتە جگە لە خۆتان لە شوێنکەوتوی ئاینەکانی تر، (بطانه)ش بە واتای کەسی نزیك و جێ متمانە دێت کە مرۆڤ نهێنی ناوخۆی بۆ باس دەکات.

بوخاری و نەسائي و جگە لەوانیش ڕیوایەتیان کردووە، لە فەرموودەی کۆمەڵێکەوە لەوانە یونس و یەحیای کوڕی سەعید و موسای کوڕی عەقەبەو ئیبن ئەبی عەتیق لە زوهەریەوە، لەئەبی سەلەمەوە، لە ئەبی سەعیدەوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووەو هیچ خەلیفەیەکی نەکردووە بە خەلیفە کە دوو هاوڕێی نزیکی نەبێت: هاوڕێیەك فەرمانی پێدەکات بە چاکەو هانی دەدات لەسەری،

هاوڕێیەکی تر فەرمانی پێدەکات بە خراپەو هانی دەدات لەسەری، پارێزراویش ئەو کەسەیە خوای گەورە بیپارێزێت) هەروەها ئەوزاعی و معاویەی کوڕی سەلام لە زوهەریەوە گێڕاویانەتەوە، لە ئەبی سەلەمەوە، لە ئەبی هورەیرەوە بە مەرفوعی. دەگونجێت ئەوە لای زوهەری لە ئەبی سەلەمەوە ئەویش لە هەردووکیانەوە گێڕابێتیەوەو نەسائیش بەهەمان شێوە لە زوهەریەوە ئیخراجی کردووە، بوخاریش لە سەحیحەکەیدا هەڵی سپاردووەو وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی جەعەر وتی، لە سەفوانی کوڕی سەلیمەوە لە ئەبی سەلەمەوە، لە ئەبو ئەیوبی ئەنساریەوە باسکردنی دەگونجێت لای ئەبی سەلەمە لە سیان لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە. خوای گەورە زاناترە.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێ: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو ئەیوب موحەممەدی کوڕی وەزانەوە، لە عیسای کوڕی یونسەوە، لە ئەبی حەیانی تەیمیەوە، لە ئەبی زەبناعەوە، لە ئیبن ئەبی دەهقانەوە، وتی: بە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) وترا: لەوێدا منداڵێك لە خەڵکی (حیرە) هەیە پارێزەرو نووسەرە، ئەگەر بتکردایە بە نووسەر باش بوو، وتی: ئەگەر ئەوە بکەم کەواتە لە دەرەوەی ئیمانداران هاوڕێ و کەسی جێ رازو نهێنیم هەڵبژاردووە. جا لەم ئەسەرو لەم ئایەتەدا بەڵگەی لەسەر ئەوە تێدایە کە دروست نییە شوێنکەوتوانی ئاینەکانی تر بەکار بهێنرێن لە نوسینی هەرشتێکدا پەیوەست بێت بە نهێنی و کاروباری ناوخۆی موسڵمانانەوە کە ترسی ئەوەی لێ بکرێت ئەو کەسە ئەو نهێنی و فەرمانە ناوخۆییانە بگەیەنێتە دوژمنان و بڵاوەی پێ بکات. لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ﴾.

حافز ئەبو یەعلا دەڵێ: ئیسحاقی کوڕی ئیسرائیل بۆی گێڕاینەوە، لە هەشیمەوە، لە عەوامەوە، لە ئەزهەری کوڕی راستیرەوە، وتی: ئەوان دەچونە لای ئەنەس و ئەگەر قسەیەکی بۆ بکردنایە نەیان دەزانی چییە، ئەچوونەی لای حەسەن واتە حەسەنی بەسری، ئەویش بۆی تەفسیر دەکردن، دەڵێ، ڕۆژێکیان فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) دەگێڕایەوەو وتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بە ئاگری بت پەرستەکان خۆ رووناك مەکەنەوەو، عەرەبێك لەسەر مستیلەکانتان هەڵمەکۆڵن) ئەوان نەیانزانی واتاکەی

چییه، ڕۆشتن بۆلای حەسەنی بەسری، وتیان: ئەنەس فەرموودەیەکی بۆ گێڕاینەوە وتی، (بە ئاگری بت پەرستەکان خۆتان ڕووناك مەکەنەوەو، عەرەبێك لەسەر موستیلەکانتان هەڵمەکۆڵن) حەسەن وتی: ئەو قسەی کە دەڵێت (عەرەبێك لەسەر موستیلەکانتان هەڵمەکۆڵن) ئەو عەرەبە مەبەستی موحەممەدە (درودی خوای لێ بێت) ئەوەشی کە وتی (بە ئاگری بت پەرستان خۆتان روناك مەکەنەوە) واتە: لە کاروبارەکانتاندا راوێژ بە بت پەرستەکان مەکەن. پاشان حەسەن وتی: پشتگیری ئەمە لە قورئاندایە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ﴾ ئا بەمشێوەیە حافز ئەبو یەعلا بەرەحمەت بێت گێڕاویەتیەوە، هەروەها نەسائی لە موجاهیدی کوڕی موساوە، لە هەشیمەوە گێڕاویەتیەوەو، ئیمام ئەحمەدیش لە هەشیمەوە بە ئیسنادی خۆی بەبێ ناوبردنی حەسەنی بەسری گێڕاویەتیەوە. ئەم تەفسیرە تێبینی و قسەی لەسەرە چونکە واتای دیاری (عەرەبێك لەسەر مستیلەکانتان هەڵمەکۆڵن) واتە بەخەتی عەرەبی مەینوسن، ئەمەش بۆ ئەوەی هاوشێوەی هەڵکۆڵینی مۆرەکەی پێغەمبەری خوا نەبێت (درودی خوای لێ بێت). چونکە هەڵکۆڵراوەکەی سەرمۆرەکەی ئەو بریتی بوو لە (محمد رسول الله)، لەبەرئەمەیە کە لە فەرموودەدا هاتوو پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) قەدەغەی کردوە کەس وەك هاوشێوەی مۆرەکەی ئەو هەڵبکۆڵێت. سەبارەت بە (خۆ روناك کردنەوەش بە ئاگری بت پەرستان) واتاکەی ئەوەیە لە ماڵ و خانوەکاندا لە بت پەرستەکان نزیك مەکەونەوە بەجۆرێك ئێوە لەگەڵ ئەواندابن لە وڵاتەکانیاندا، بەڵکو لێیان دووربکەونەوەو لە وڵاتەکانیان کۆچ بکەن، لەبەرئەوە ئەبو داود گێڕاویەتیەوە بەمشێوەیە (ڕێبینی بە ئاگری ئەوان مەکەن) وە لە فەرموودەیەکی تردا (هەرکەس لەگەڵ بت پەرستێك کۆببێتەوە یاخود لە ماڵێکدا لەگەڵیدا نیشتەجێ بێت ئەوە وەك ئەو وایە) لەبەرئەوە شیکردنەوەی فەرموودەکە لەسەر ئەوەی حەسەنی بەسری (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی و بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتەکە تێبینی و قسەی لەسەرە، خوای گەورە زاناترە.

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾، واتە بەسەر پەڕەکانی دەموچاویانەوە دەرکەوتووە و، لەسەر

لەدەم دەرچوونەکانیان ئاشکرابووە کە چ دوژمنایەتیەك دەکەن و، لەگەڵ ئەو هەموو رق و قینەی لەناو ناخیاندا دژ بە ئیسلام و موسڵمانان شاردویانەتەوە، ئەمە بە جۆرێك ئاشکرا دەبێت و دەردەکەوێت کە لە هیچ هۆشیارو ژیرێك شاراوە نییە. لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾. دواتر فەرمووی: ﴿هَا أَنتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ﴾ واتە ئێوە ئەی ئیمانداران دوڕووەکانتان خۆش دەوێت بەهۆی ئەوەوە کە وا نیشان دەدەن بۆ ئێوە کە بڕواداران و لەسەر ئیمانەکەیان ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوان نە بە ئاشکراو نە لە ناخەوە ئێوەیان خۆش ناوێت .﴿وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾ واتە هیچ گومانێکتان بەرامبەر هیچ شتێکی قورئان نییە، بەڵام ئەوان گومان و دوودڵی و سەرسوڕمانیان هەیە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئەبی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە، لە عەکرەمە یان سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە وتی ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾، واتە بە کتێبەکەی ئێوەو کتێبەکەی ئەوان و هەموو کتێبەکانی پێشوو، بەڵام ئەوان بێ باوەڕن بە قورئانەکەی ئێوەو بەراستی نازانن، لەبەرئەوە هەقە ئێوە رقتان لەوان بێت زیاتر لەوەی ئەوان رقیان لێتانە. ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە ﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾ (أنامل) بریتیە لە سەرپەنجەکان. قەتادە وای وتووە. شاعیریش دەڵێت:

أَوَدُّكَمـا، مـا بَـلَّ حَـلْـقـيَ رِيـقَـتـي
وَمـا حَـمَـلَـتْ كَـفَّـايَ أَنـمُـلي الـعَـشْـرا

ئیبن مەسعود و سەدی و رەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێن: مەبەست سەری پەنجەکانە، ئەمە رەفتارو پیشەی دوڕووەکان بوو کە بڕواداری و خۆشەویستیان بۆ ئیمانداران دەردەبڕی، بەڵام لەناو ناخ و دڵەوە بە هەموو جۆرێك پێچەوانەی روی دەرەوە بوون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾، ئەمەش توندترین رق و قینە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ واتە هەرچەندە ئێوە حەسوودی و ئیرەیی بە ئیمانداران ببەن و بەهۆی ئەمەوە رقتان لێیان بێت،

بزانن کە خوای گەورە نیعمەتەکانی خۆی بۆسەر بەندە ئیماندارەکانی تەواو دەکات، ئاینەکەیان بۆ تەواو دەکات، دینەکەی سەر دەخات و بە هەموو شوێنێکی دەگەیەنێت، کەواتە ئێوە بەهۆی رق و قینەکانتانەوە بمرن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، واتە خوای گەورە زاناو شارەزایە بەوەی دڵ و سینەکانتان گرتوویەتیە خۆی و ویژدانەکانتان شاردویەتیەوە، شارەزایە بە نهێنی ئەو رق و قین و ئیرەییەی لەناو ناختاندا دژ بە ئیمانداران حەشارتان داوە، هەر لە دنیادا پاداشتی ئەو رەفتارەتان دەداتەوە بەوەی پێچەوانەی ئەوەی ئێوە دەیخوازن دێنێتە دی ئاواتەکانیان پوچ دەکاتەوە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە ئەشکەنجەیەکی سەخت ئەشکەنجەیان دەدات و بەهەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەیانهێڵێتەوەو، رزگاربوون و دەرچوونیان نییە لێی.

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ﴾ ئەم حاڵەتە بەڵگەیە لەسەر سەختی دوژمنایەتی ئەوان بۆ ئیمانداران، ئەویش بریتیە لەوەی ئەگەر ئیمانداران بەرەوپێش چون و سەرکەوتن و پشتیوانیان بۆ دروست بێت و ژمارەو پشتیوانەکانیان زیادی بکردایە، دوروەکان حاڵیان تێك دەچوو زۆر پێیان ناخۆش بوو، بەڵام ئەگەر نەبوونی و لاوازی و ناڕەحەتیان بەسەردا بهاتایە یان دوژمنەکانیان زیانیان بە موسڵمانەکان بگەیاندایە بەهۆی هەر حیکمەتێکەوە کە خوای گەورە لەو نارەحەتیانەدا بیبینایە - وەك کارەساتەکەی ڕۆژی بەدر - ئەوا دوڕوەکان زۆر دڵخۆش دەبوون بەوە، خوای گەورەش لەگەڵ ئیماندارانـدا دەدوێ و دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ﴾ خوای گەورە رێنومایی ئیمانداران دەکات بۆ چۆنیەتی خۆپاراستن و پارێزراوی لە شەڕو خراپەو فروفێڵ و ئیرەیی دوڕوەکان و ئامۆژگاریان دەکات بە بەکارهێنانی ئارامگری و پشت بەستن بەو خوا مەزنەی کە شارەزایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەکی دوژمنەکانیان و، هیچ هێزو توانایەك نیە ئەگەر لەخواوە نەبێت، هەر ئەو خوایەیە هەرچیەکی بیەوێت دەیکات و هەرچیەکی نەوێت نابێت و رونادات، هیچ شتێکیش لە گەردووندا رونادات بە تەقدیرو بڕیار و ئیرادەی پەروەردگار نەبێت، هەرکەس پشت بەو خوایە ببەستێت بەسیەتی.

پاش ئەوە خوای گەورە باسی چیرۆکی ئوحود دەکات کە چ تاقیکردنەوەیەکی تێدایە بۆ ئیمانداران و بەندەکانی، چۆن ئەو ڕووداوە جیاکەرەوەی نێوان ئیمانداران و دوڕووەکان و ئارامگرتنی ئارامگران بوو، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ
(١٢١) إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ
فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ (١٢٢) وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٢٣)﴾

مەبەست لەم ڕووداوە جەنگی ئوحودە بەلای جمهوری زانایانەوە، ئیبن عەباس و حەسەن و قەتادەو سەدی و کەسانی تریش هەمان شتیان وتووە.

لە حەسەنی بەسریەوە دەڵێ: مەبەست لەم ڕۆژی ئەحزابە (خەندەق)، ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە، ئەمە ڕایەکی نامۆیەو پشتی پێ نابەسرێت.

ڕوداوی جەنگی ئوحود لە ڕۆژی شەممەی مانگی شەوالی ساڵی سێی کۆچیدا بوو، قەتادە دەڵێ: یانزە شەو لە مانگی شەوال ڕۆشتبوو. عەکرەمە دەڵێ: ڕۆژی شەممەی ناوەڕاستی مانگی شەوال. خوای گەورە زاناترە....

هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو بت پەرستەکان پاش ئەوە ژمارەیەکی زۆر لە گەورەو ناودارەکانیان لە ڕۆژی جەنگی بەدردا کوژران و بەڵام کاروانەکە بە سەلامەتی ڕزگاری بوو لە دەستی موسڵمانان، کوڕانی کوژراوەکانی بەدر کە لەگەڵ ئەبو سوفیاندا بوون لەگەڵ سەرکردەکانی تری قورەیش وتیان بە ئەبو سوفیان: پارەی ئەم کاروانە هەرهەمووی داینێ بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موحەممەدداو لەو پێناوەدا سەرفی بکە، ئەوانیش هەرچیەکیان توانی لە سەربازو ئەحباشەکان کۆیان کردەوە، بە نزیکەی سێ هەزار کەسەوە بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ نزیك لە شاخی ئوحودەوە بەرامبەر مەدینە، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) نوێژی کرد لە ڕۆژی هەینیداو، کاتێك لە نوێژ لێ بوویەوە نوێژی لەسەر تەرمی پیاوێك لە بەنی نەجار کرد کە پێی دەوترا مالیکی کوڕی عەمر،

پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) راوێژی بە خەڵکەکە کرد کە ئایا (لە مەدینە بچنە دەرەوە بۆیان یاخود لەناو شاردا بمێننەوە) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی رای وابوو لە مەدینە بمێننەوە، جا ئەگەر مانەوە ئەوە بە خراپەیەکی زیندانیکراوەوە ماونەتەوە، خۆ ئەگەر هاتنە ناو مەدینەوە ئەوە پیاوان رووبەڕوویان جەنگ دەکەن و، ئافرەتان و منالان لەسەریانەوە بەردبارانیان دەکەن، وە ئەگەر گەڕانەوە بە نائومێدی دەگەڕێنەوە، بەڵام هەندێك لە هاوەڵان کە بەشداری جەنگی بەدریان نەکردبوو رایان وابوو بچنە دەرەوەی مەدینە بۆ رووبەڕو بوونەوەو جەنگ لەدژیان، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) رۆشتە ماڵەوەو جل و بەرگی جەنگی بۆ ئوممەتەکەی لەبەرکرد و پاشان گەڕایەوە ناویان، کاتێك بە ئامادەیی گەڕایەوە ناویان هەندێکیان پەشیمان بوون و وتیان: لەوە دەچێت پێغەمبەرمان ناچارکردبێت بۆ چوونە دەرەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بتەوێت بمێنینەوە دەمێنینەوە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی : (رێگە نەدراوە بە پێغەمبەرێك کە جل و بەرگی جەنگی بۆ ئوممەتەکەی لەبەرکرد بگەڕێتە دواوە تاکو خوای گەورە بڕیاری بۆ دەدات). ئیتر پێغەمبەری خوا بە نزیکەی هەزار لە هاوەڵەکانیەوە رۆشت، کاتێك گەشتنە ناوچەی (الشوط) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە سێ لەسەریەکی سوپاکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینەو تووڕەبوو لەوەی پێغەمبەر بە گوێی ئەوی نەکردووە، خۆی و هاوەڵەکانی وتیان: ئەگەر بمانزانیایە ئەمڕۆ جەنگە شوێنتان دەکەوتین، بەڵام واناتان بینین کە ئەمڕۆ جەنگ بکەن. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە رۆشتن بەردەوام بوو تا گەشتە شیوێك لە ئوحود و لەوێدا سوپاکەی لادا، چونە قەدپاڵی چیای ئوحود و سەربازەکانی ئوحودیان خستە پشتیانەوەو خۆیان بە پێدەشتەکەیەوە بوون، فەرمووی: (هیچ کەس لە خۆیەوە جەنگ ناکات تا فەرمانی پێ نەکەین بە جەنگ کردن) پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگ بە حەوت سەد هاوەڵەکەیەوە، عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری سەربەتیرەی عەمری کوڕی عەوفی کردە فەرماندەی تیرهاوێژەکان، لەو رۆژەدا ژمارەی تیرهاوێژەکان پەنجا پیاو بوون، پێی فەرموون (ئەسپەکانمان لێ دوور بخەنەوەو بالای ئێوەوە هێرشمان بۆ نەکەن و، پابەند بن بە شوێنی خۆتانەوەو چۆڵی مەکەن ئەگەر

بردمانەوە یان شکستمان هێنا، ئەگەر بینیتان باڵندە دەمانفڕێنێت ئێوە جێگەکانی خۆتان چۆڵ مەکەن) پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لەنێوان دوو زرێ پۆشەوە دەرکەوت، ئاڵاکەشی دا بە دەستی موسعەبی کوڕی عومەیری سەربە تیرەی بەنی عەبدولدارەوە، لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر مۆڵەتی هەندێك منالی دا کۆمەڵێکی تریش پاڕانەوەو داوای بەشداریان کرد تا ئەەبوو ڕازی کردن بە بەشداری لە ڕۆژی خەندەقدا بە نزیکەی دوو ساڵ دوای ئەم ڕووداوە، قورەیشیەکانیش خۆیان ئامادەو پڕچەك کردبوو بە سێ هەزار جەنگاوەرەوە، دووسەد ئەسپیشیان پێ بوو کە لایان خستبوون، خالیدی کوڕی وەلید فەرماندەی دەستی ڕاست بوو، عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهلیش فەرماندەی دەستی چەپ بوو، ئاڵاکەشیان دابویە دەستی بەنی عەبدولدار، پاشان ئەوەی لە نێوان هەردوو لادا ڕوویدا لەمەودوا بە دوورودرێژی لە شوێنەکانی خۆیدا لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا باسی دەکەین، إنشاءالله، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ﴾، واتە لە شوێنەکانی خۆیاندا جێگیرت کردن و، کردنت بە بەشی دەستە ڕاست و بەشی دەستە چەپەوە، بەو شێوەیە فەرمانت پێکردن (والله سميع عليم) واتە بیسەری ئەوەیە کە دەیڵێن و، زانایە بە ویژدانەکانتان.

لێرەدا ئیبن جەریر پرسیارێکی هێناوە کە کرۆکەکەی ئەمەیە: چۆن دەڵێن پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی هەینی داو پاش نوێژ ڕۆشت بەرەو ئوحود لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ﴾،؟ پاشان وەڵامەکەی لەبری ئەو: دەرچوونەکەی بۆ ئەوەبوو تاکو لە شوێنەکانی خۆیاندا جێگیریان بکات لە سەرەتای ڕۆژی شەممەدا. وە فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموێت ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾ بوخاری دەڵێ: عەلی کوڕی عەبدوڵلا لە سوفیانەوە بۆی گێڕاینەوە وتی: عومەر وتی: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵلا بوو کە وتی: سەبارەت بە ئێمە ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾ دەڵێ: ئێمە دوو تاقمەکە بووین بەنوحاریسەو بەنو سەلەمە، وە پێمان خۆش نەبوو - سوفیان جارێك وتی دڵخۆشی نەکردم - کە ئەو ئایەتە دانەبەزیایە لەبەر ئەو وتەی خوا

کە فەرمووی: ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ بەهەمان شێوە موسلیم لە فەرموودەی سوفیانی کوڕی ئیبن عەیینەوە گێڕاویەتیەوە. بەهەمان شێوە لە کەسێك زیاتر لە سەلەف وتریانە کە ئەو دو تاقمە: بەنو حاریسەو بەنو سەلەمە بوون.

کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾﴾ واتە ڕۆژی بەدر، ڕۆژی هەینیش بەرامبەر بوو لەگەڵ حەڤدەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووی کۆچی کە ڕۆژی جیابوونەوەی حەق بوو لە پڕوپوچی، ئەو ڕۆژە بوو کە خوای گەورە تیایدا ئیسلام و شوێنکەوتوەکانی سەربەرزو غیرەتدار کردو، بت پەرستی تێدا ریسوا کردو، شوێن و پێگەو شوێنکەوتوەکانی تێك شکاند لەکاتێکدا ژمارەی موسڵمانان لەو ڕۆژەدا کەم بوو، ئەوان سێ سەد و سیانزە پیاو بوون، تەنها دوو ئەسپ و حەفتا وشتریان پێ بوو، ئەوانی تریان هەموو پیادە بوون و ژمارەیان بەقەدەر پێویست نەبو، دوژمنەکەشیان لەو ڕۆژەدا لەنێوان نۆسەد تا هەزار پیاودا دەبوون بە خواردن و تفاق و ئەسپ و حوشترو خشڵ و سامانی زۆرەوە، بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەرخست و پەیام و نیگاکەی ئاشکرا کرد، دەموچاوی پێغەمبەرو شوێنکەوتوەکانی سپی کردو، شەیتان و نەوەکانی ریسوا کرد، لەبەرئەمە خوای گەورە وەك منەت کردن بەسەر بەندە ئیماندارەکانی و شوێنکەوتوانی ئاینەکەیەوە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ واتە ژمارەتان کەم بوو، تاکو بزانن کە سەرکەوتن لەلایەن پەروەردگارەوەیەو بەزۆری ژمارەو تفاق نیە، لەبەرئەمەیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا﴾ تا دەگاتە ﴿غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [التوبة: ٢٥ - ٢٧]. ئیمام ئەحمەد دەڵێ: موحەممەدی کوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە، لە شوعبەی کوڕی سەماکەوە، وتی: بیستم لە عەیازی ئەشعەری وتی: بەشداری یەرموکم کردو پێنج فەرماندە سەرکردایەتیان دەکردین: ئەبو عوبەیدەو، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان و، ئیبن حەسەنەو، خالیدی کوڕی وەلید و، عەیاز، عەیاز ئەو عەیازە نیە کە فەرموودەکەی بۆ سەماك گێڕاوەتەوە، دەڵێ: عومەر وتی: ئەگەر جەنگ ڕوویدا ئاگاتان لە ئەبو عوبەیدە بێت یان پەنا بۆ ئەو بەرن، وتی: ئێمەش بۆمان نووسی کە بەڕاستی

مردن بەرەو رومان دێت و، داوای هاوکاریمان لێکرد، ئەویش بۆی نووسین: نوسراوەکەتانم بەدەست گەشت کە داوای هاوکاریتان لێ کردبووم، بەڵام من کەسێکی ترتان نیشان دەدەم کە بە دەسەڵات ترە بۆ سەرخستن و بەخشینی سەرکەوتن و، پارێزەرترە بۆ سەربازەکان: ئەویش پەروەردگاری باڵا دەستە، لەبەرئەوە داوای سەرکەوتن لەخوا بکەن، چونکە موحەممەد(درودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی بەدردا بە ژمارەیەکی کەمتر لە ژمارەکەی ئێوەوە لە ڕۆژی بەدردا سەرکەوت، ئەگەر ئەم نوسراوەی منتان بەدەست گەشت بجەنگن لەگەڵیانداو مەگەڕێنەوە بۆلای من، وتی: ئێمەش جەنگاین لە دژیان و چوار فەرسەخ دورمان خستنەوە، وتی: سامانێکی زۆریشمان دەست کەوت و پاشان راوێژمان کرد، عەیاز بیروڕای وابوو بەرهەکەسێك دە دانە ببەخشین، دەڵێ: ئەبو عوبەیدەش وتی: کێ گرەوم لەگەڵ دەکات؟ گەنجێك وتی: من ئەگەر تورە نەبیت، وتی: پێشی دایەوە بینیم هەردوو پرچەکەی ئەبوعوبەیدە دەلەرێتەوە کە لە دوایەوە بوو بەسەر ئەسپێکی بێ جل و بەرگەوە. ئەمە ئیسنادێکی سەحیحەو ئیبن حەبان لە سەحیحەکەیدا لە بەندارەوە ئەویش لە غەندەرەوە هاوشێوەی ئەمەی گێڕاوەتەوە، حافز زیائی مەقدیسیش لە کتێبەکەیدا هەڵی بژاردووە.

بەدر: شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەداو بە بیرەکانیەوە دەناسرێت، دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێك کە هەڵی کەندووە، پێی وتراوە: بەدری کوڕی نارین، شەعەبی دەڵێ: بەدر بیری پیاوێك بوو بەناوی بەدرەوە.

پاشان خوا دەفەرموێت ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ واتە هەستن بە گوێڕایەڵی کردنیپەروەرگار.

﴿إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ
ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا
يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ
إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقۡطَعَ طَرَفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ

﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ
﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن
يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾﴾

ڕاڤەکەرانی قورئان بیروڕایان جیاوازە لەم پەیمانەدا، کە ئایا ڕۆژی بەدرە یان ڕۆژی ئوحود؟ لەسەر دوو ڕان، یەکەمیان: کە خوا دەفەرموێت ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ پابەندە بە ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ﴾ ئەمە لە حەسەنی بەسری و عامری شەعبی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و جگە لەمانیشەوە گێڕراوەتەوە، ئیبن جورەیجیش هەڵی بژاردووە.

عوبادی کوڕی مەنسور لە حەسەنەوە سەبارەت بە ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾، وتویەتی: ئەمە ڕۆژی بەدربوو، ئیبن ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. پاشان دەڵێ: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە موسای کوڕی ئیسماعیلەوە، لە وەهیبەوە، لە داودی کوڕی عامرەوە، واتە لە شەعبیەوە: هەواڵی ئەوە گەشت بە ئیمانداران کە لە ڕۆژی بەدردا کوڕی جابر هاوکاری بت پەرستەکان دەکات، ئەمە زۆر بەلایانەوە سەخت بوو، خوای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە ﴿أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ تا دەگاتە ﴿مُسَوِّمِينَ﴾ دەڵێ: ئیتر شکست بەسەر کورزی کوڕی جابردا هات و، هاوکاری بت پەرستەکانی نەکرد، خوای گەورەش هاوکاری موسڵمانەکانی نەکرد بە ناردنی پێنج هەزار فریشتەکە، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێ: خوای گەورە هەزار فریشتەی بۆ ئیمانداران نارد، پاشان بوون بە سێ هەزارو، دواتر بوونە پێنج هەزار.

ئەگەروترا: چی ئەم ئایەتە و ئەو قسەیە پێکەوە کۆ دەکاتەوە لەگەڵ فەرمودەی پەروەردگار لە چیرۆکی ڕۆژی بەدردا کە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّى مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾﴾ تا دەگاتە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال: ٩ - ١٠] وەڵامەکەی ئەوەیە کە دەقەکە باسی هەزار دەکات - لێرەدا - دژی ئەوە نیە کە سێ هەزارو بەرەو زۆرتریش نەبووبن، چونکە دەفەرموێت (مردفین) بەو واتایەی کە کۆمەڵی تری جگە

لەوانیان بە دوادا دێت، واتە هەزارانی تری وەك خۆیان، ئەم چوارچێوەیە لێكچوە بە ئەم چوارچێوەیەی لە سورەتی ئالی عیمراندا باس كراوە. ئەوەی دیارە ئەوەیە كە ئەوە بریتیە لە ڕۆژی بەدر وەك وا باوو زانراوە كە فریشتەكان لە ڕۆژی بەدردا كوشتارو جەنگیان كرد، خوای گەورەش زاناترە.

سەعیدی كوڕی ئەبی عروبە لە قەتادەوە دەڵێ، خوای گەورە لە ڕۆژی بەدردا كۆمەكی موسڵمانەكانی كرد بە ناردنی پێنج هەزار فریشتە.

وتەی دووەم: ئەم پەیمانە پەیوەستە بەم ئایەتەوە: ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَـٰعِدَ لِلْقِتَالِ﴾ [آل عمران: ١٢١]، ئەمەش ڕۆژی ئوحود بوو، كە ئەمە قسەی موجاهید و عەكرەمەو زوحاك و زەهری و موسای كوڕی عەقبەو كەسانی ترە، بەڵام وتویانە، خوای گەورە پێنج هەزار فریشتەكەی نەنارد بۆ پشتیوانی ئیمانداران، چونكە موسڵمانان لەو ڕۆژەدا هەڵاتن، عەكرەمە ئەمەشی بۆ زیاد كردووە: تەنانەت سێ هەزاریشی نەنارد، چونكە خوا فەرمووی ﴿بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟﴾، بەڵام ئەوان ئارامیان نەگرت و رایان كردو جوڵان،ءخوای گەورە تەنانەت یەك فریشتەی بۆ هاوكاریان نەناردە خوارەوە.

كە دەشفەرموێت: ﴿بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟﴾، واتە: ئارام بگرن لەسەر دوژمنەكەتان و، لەمن بترسن و فەرمانەكانم جێبەجێ بكەن. كە دەشفەرموێت: ﴿وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـٰذَا﴾ حەسەن و قەتادەو ڕەبیع و سەدی دەڵێن: واتە لە ڕویانەوە، موجاهید و عەكرەمەو ئەبو سالح دەڵێن: واتە لە ڕق و قینی ئەواندا. زوحاك دەڵێ: لە ڕق و قینیانداو لە ڕویانەوە. عەوفی لە ئیبن عەباسەوە دەڵێ: واتە لەم سەفەرەیاندا، وە دەوترێت: لە توڕەییانەوە.

پاشان پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَـٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ ناسراون بە دەموچاو و ڕوكاریاندا، ئەبو ئیسحاقی سوبەیعی لە حاریسی كوڕی موزەیبەوە، لە عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: سیمای فریشتەكان لە ڕۆژی بەدردا خوری سپی بوو بەهەمان شێوە سیماو نیشانەیان لەنێوچاوانی ئەسپەكانیاندا بوو، ئیبن ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە. پاشان وتی: ئەبو زەرعە بۆی گێڕاینەوە، لە هەدەبەی كوڕی خالیدەوە، لە حەممادی كوڕی سەلەمەوە، لە موحەممەدی كوڕی عەمری عەلقەمەوە، لە

ئەبی سەلەمەوە، لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی ئەم ئایەتە (مسومین) وتویەتی: بە خوری سور، موجاهیدیش وتویەتی: (مسومین): ناونیشانەکانی سڕاوەتەوە، نێوچاوانی ناسراوە بە خوری سپی لە کلکی ئەسپەکاندا،

عەوفی لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: فریشتەکان هاتن بۆلای موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) خوری سپیان وەك نیشانە بەکارهێنابوو، بەهەمان شێوە موحەممەد و هاوەڵەکانی ئەسپەکانیان وەك سیماو نیشانەی ئەوان لێکرد بە خوری، قەتادەو عەکرەمەش دەڵێن (مسومین) بە نیشانەی جەنگ، مەکحولیش دەڵێ: ڕوخساریان داپۆشی بوو بە عەمامە. هەروەها ئیبن مەردەویە لەفەرموودەی عەبدولقدوسی کوڕی حەبیبەوە، لە عەتای کوڕی ئەبی ڕەباحەوە، لە ئیبن عەباسەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لەسەر (مسومین) فەرمووی (فێرکراوبوون) لەڕۆژی بەدردا نیشانەی فریشتەکان عەمامەی ڕەش بوو، وە لە ڕۆژی حونەیندا عەمامەی سور بوو. هەروەها لە فەرموودەی حسەینی کوڕی مەفاریق لە سەعیدەوە، لە حەکەمەوە، لە موقسیمەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: فریشتەکان نەجەنگان تەنها لە ڕۆژی بەدردا نەبێت ئیبن ئیسحاقیش دەڵێ: کەسێك کە تومەت باری ناکەم لە موقسیمەوە بۆی گێڕامەوە، لە ئیبن عەباسەوە کە وتوویەتی: نیشانەی فریشتە لە ڕۆژی بەدردا عەمامەی سپی بوو کە بە پشتیاندا شۆڕیان کردبوویەوە، وە لە ڕۆژی حونەین دا عەمامەی سوور بوو. فریشتەکانیش لە هیچ ڕۆژێکدا دستیان نەوەشاند جگە لە بەدرنەبێت، ئەوان لە ڕۆژی جەنگەکانی تردا تەنها ژمارەیان زۆر دەکرد و هاوکاریان پێشکەش دەکردو خۆیان جەنگیان نەدەکرد. پاشان لە حەسەنی کوڕی عیمارەوە، لە حەکەمەوە، لە موقسیمەوە لە ئیبن عەباسەوە هاوشێوەی ئەمەی باس کردووە.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێ: ئەحمەسی بۆی گێڕاینەوە، لە وەکیعەوە، لە هیشامی کوڕی عوروەوە، لە یەحیای کوڕی عوبادەوە کە زوبەیر (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ڕۆژی بەدردا عەمامەیەکی زەردی بەسەرەوە بوو.

فریشتەکانیش هاتنە خوارەوە عەمامەی زەردیان بەسەرەوە بوو، ئیبن

مەردەویە لە ڕێگەی هیشامی کوڕی عورووەوە، لە باوکیەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە بەهەمان شێوەی ریوایەت کردووە.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ﴾، واتە خوای گەورە کە فریشتەکانی نارده خوارەوەو ئێوەی لە ناردنیان ئاگادار کردەوە بۆ شتێك نەبوو جگە لەوەی دڵتان ئارام‌ءئاسودەو خۆش بێت، چونکە سەرکەوتن بەدەستی پەروەردگارەو لای ئەوە، ئەگەر بیەوێت بەبێ بوونی ئێوەش بەسەر دوژمنەکانیدا سەردەکەوێت، خوای گەورە هیچ پێویستی بە جەنگی ئێوە نییە لە دژی بێ باوەڕان، وەك خوای گەورە پاش فەرمانکردنی بە ئیماندارانْ بۆ جەنگ کردن دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾﴾ [محمد: ٤ ـ ٦] لەبەرئەمە لێرەدا دەفەرموێت ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾﴾ واتە پەروەردگار خاوەن عیزەت و دەسەڵاتێکە هیچ ڕێگرێك لەبەردەمیدا نیەو، لە بڕیارو قەدەرەکانیشیدا دانایە.

پاشان فەرمووی: ﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ واتە فەرمانی پێکردوون بە جیهاد و شمشێر وەشاندن ئەمەش لەپێناوی ئەو حیکمەت و داناییەی کە پەروەردگار لەم کارەدا داینـاوە، لەبەرئەمە باسی هەموو بەشە بەردەست کەوتووەکانی لە بت پەرستە تێکۆشەرەکان کردووەو، فەرموویەتی ﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا﴾ واتە تاکو کۆمەڵێك لەناو بچن .﴿مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَوْ يَكْبِتَهُمْ﴾ واتە سەرشۆڕیان دەکات و بەرق و قینی خۆیانەوە دەگەڕێنەوە بێ ئەوەی ئامانجەکەیان دژ بە ئێوە بێتە دی. لەبەرئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَيَنقَلِبُوا﴾ واتە بگەڕێنەوە ﴿خَائِبِينَ﴾ واتە ئەوەی ئاواتە خوازی بوون دەستیان نەکەوت. پاشان بە ڕستەیەك رەخنە دەگرێت کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حوکم و بڕیاری یەکلایی کەرەوە لە دنیاو قیامەتدا هەر بەدەستی خوایەو هاوەڵی نیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾، واتە بەڵکو هەموو شتێك فەرمانی بەدەستی پەروەردگارە، وەك لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ [الرعد: ٤٠] هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ

يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ [البقرة: ٢٧٢] یان دەفەرموێت ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ [القصص: ٥٦].

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ دەڵێ: واتە تۆ دەسەڵاتی هیچ حوکم دانێکت نیە بەسەر بەندەکانمدا تەنها ئەوە نەبێت کە من فەرمانم پێکردوویت سەبارەت بەوان.

پاشان خوای گەورە باسی بەشەکانی تر دەکات و دەفەرموێت: ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾، واتە ئەو باری بێ باوەڕیەی کە ئەوانی تێدایەو هیدایەت دانیان پاش گومڕابونیان ﴿أَوْ يُعَذِّبَهُمْ﴾ واتە لەسەر بێ باوەڕیەکەیان لە دنیاو قیامەتدا، هەروەها لەسەر تاوانەکانیان، لەبەرئەوە خوا فەرمووی ﴿فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ واتە ئەوانە شایستەی ئەوەن.

هەروەها بوخاری دەڵێ: حەبانی کوڕی موسا بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدوڵلاوە، لە موعەممەرەوە، لە زەهریەوە، لە سالمەوە، لە باوکیەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە (دروودی خوای لێ بێت) کاتێك لە چەمینەوەی نوێژدا سەری بەرز کردۆتەوە لە رکاتی دووەمی بەیانیدا فەرموویەتی: (خوایەگیان نەفرەت لە فلان و فلان بکە) ئەمەش دوای ئەوەی دەیفەرموو (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾﴾. ئیتر لە هەرهەموویان خۆش بوو.

ئەحمەد دەڵێ: ئەبو معاویەی غەلابی بۆی گێڕاینەوە، لە خالیدی کوڕی حاریسەوە، لە موحەممەدی کوڕی عیجلانەوە، لە نافیعەوە، لە عەبدوڵلاوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دووعای لە چوار کەس کرد، دەڵێ، خوای گەورە ئەمەی نارده خوار ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، دەڵێ، دواتر خوای گەورە هیدایەتی دان بۆ ئیسلام.

هەروەها موحەممەدی کوڕی عیجلان لە نافیعەوە، لە ئیبن عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دوعای لە چوار پیاوی بت پرست کرد و بە ناوەکانی خۆیانەوە ناوی بردن، تاکو ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾.

بەهەمان شێوە بوخاری دەڵێ: موسای کوڕی ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە، لە ئیبن شەهابەوە، لە سەعیدی کوڕی موسیب و ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە، لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) ئەگەر بیویستایە دوعا لە کەسێك بکات، یان دوعا بۆ کەسێك بکات، لەپاش چەمینەوە قونوتی دەخوێند، یان وتی: ئەگەر بیوتایە (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) دەیفەرموو: (اللهُمَّ العَنْ فلانًا وفلانًا، اللهم العَنْ الحارثَ بن هشام، اللهم العَنْ سُهَيل بن عمرو، اللهم العَنْ صفوان بن أمية) ئەمەی بە دەنگی بەرز دەخوێند، هەروەها لە هەندێك لە نوێژەکانی بەیانیانیدا دەیفەرموو: (اللهم العن فلانا وفلان) بەمشێوەیە ناوی دەهێناو دوعای دەکرد بۆ زیندوەکان لە زیندوانی عەرەب، تاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾.

هەروەها لە حەنزەڵەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەڵێ: بیستم لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵا وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دوعای دەکرد لە سەفوانی کوڕی ئومەیەو سوهەیلی کوڕی عەمرو حارسی کوڕی مورسەلە، پێشتر سەنەدە گەشتووەکەیمان لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەد دا باس کردوە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: هەشیم بۆی گێڕاینەوە، لە حەمیدەوە، لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی ئوحود یەکێك لە خرێکانی شکاو، نێوچاوانی برینداربوو تاکو خوێن بەسەر دەموچاویدا هاتە خوارەوە، فەرمووی: (چۆن قەومێك سەرفراز دەبن کارێکی ئاوایان بە پێغەمبەرەکەیان کردبێت، لەکاتێکدا ئەو بانگیان دەکات بۆلای پەروەردگاری باڵا دەستیان؟) خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾﴾. بەتەنها موسلیم ڕیوایەتی کردووە، لە قەعنەبیەوە، لە حەمادی کوڕی سەلەمەوە، لە سابتەوە، لە ئەنەسەوە،

ئیبن جەریر دەڵێ: ئیبن حەمید بۆی گێڕاینەوە، لە یەحیای کوڕی وازحەوە، لە حسەینی کوڕی واقیدەوە، لە مەتەرەوە، لە قەتادەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی ئوحود دا پێکراو، خرێیەکی شکاو،

برۆی نێوانی تێ کەوت، پێغەمبەر کەوت و دو قەڵغانی بەسەرەوە بوو خوێنی لێ دەڕۆشت، سابتی مەولای ئەبو حوزەیفە بەلایدا تێپەڕی و هەڵی ساندەوەو دەموچاوی سڕیەوە، ئەویش هاتەوە حاڵەتی ئاسایی خۆی و فەرمووی: (دەبێت ئەو نەتەوە چۆن بن کە کارێکی ئاوایان بە پێغەمبەرەکەیان کردبێت، لەکاتێکدا ئەو بانگیان دەکات بۆلای پەروەردگاری باڵادەستیان؟) خوای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾، بەهەمان شێوە عەبدولڕەزاق لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە ریوایەتی کردووە، بەڵام نەیوتووە: هاتۆتەوە هۆشی خۆی.

دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە هەموو موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی پەروەردگارە، دانیشتوانەکانیشی بەندەی خوان و لە بەردەستی خوادان ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾، واتە تەنها پەروەردگارە ئەوەی بیەوێت بیکات دەیکات و بۆ هیچ کەسیش نیە رەخنە لە فەرمان و بڕیاری خوا بگرێت و، بەهیچ جۆرێك پرسیاری لێ ناکرێت لەوەی دەیکات، بەڵکو خوا پرسیار لە هەموو کەسێك دەکات لەسەر هەرشتێك دەیکەن ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا۟
ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ۞ وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن
رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ
يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ
وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟
أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ
وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ
مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ
ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾﴾

سەبارەت بە قەدەغەکردنی بەندەکان لە خواردنی (سود)و وەرگرتنی چەند جارەی پارە کەلە نەفامیدا دەیانکرد و دەیان وت: ئەگەر بەرواری دانەوەی قەرز هات، دەبێت قەرزەکە بدرێتەوە، یاخود زیادەی بچێتە سەر، جا ئەگەر زیادەکەی دا باشە، ئەگینا بەردەوام لەگەڵ دواکەوتنیدا زیادەی تری دەچێتە سەر، بەمشێوەیە هەموو ساڵێك ئەگەر کەمێکیشی بچێتە سەر ئەوا بەچەند ساڵێك دەبێت بڕێکی زۆر، خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کرد کە لەخوا بترسن تاکو لە ڕۆژی دنیاو قیامەتدا رزگاریان ببێت، دواتر هەڕەشەیان لێ دەکات بەئاگرو هۆشداریان دەداتێ لێی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾.

پاشان هانیان دەدات بۆ دەستپێشخەری لە ئەنجامدانی چاکەو پەلەکردندا بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین چاکەو پاداشت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾﴾، واتە بەهەمان ئەو شێوەیەی کە ئاگر بۆ بێ باوەڕان ئامادە کراوە. هەروەها وتراوە واتای ﴿عَرْضُهَا ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ ئاگادارکردنەوەیە لە فراوانی پانیەکەی، وەك خوای گەورە لە وەسفی راخەری بەهەشتدا دەفەرموێت: ﴿بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾ [الرحمن: ٥٤]، واتە ئەی چ گومانێکت بە روکاری دەرەوەی هەیە؟ هەروەها وتراوە: بەڵکو پانیەکەی وەك درێژیەکەی وەهایە چونکە بەهەشت گومەزێکە لە ژێر عەرشدا، شتی قوبەیی و بازنەیی پانیەکەی وەك درێژیەکەی وەهایە، ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەمە ئەو فەرمودە سەحیحەیە کە دەفەرموێت (ئەگەر لە پەروەردگار داوای بەهەشتتان کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن، چونکە فیردەوس بەرزترین شوێنی بەهەشت و ناوەڕاستی بەهەشتە، هەر لەوێوە روبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن و، سەقفەکەشی بریتیە لە عەرشی پەروەردگار) ئەم ئایەتە وەك ئە وئایەتەی تری سورەتی (الحدید)ە، کە دەفەرموێت: ﴿سَابِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ [الحدید: ٢١].

ئێمە لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەد دا ئەوەمان گێڕایەوە کە هێرقل نوسراوێکی نووسی بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) نوسیبووی: تۆ

بانگی منت کردووە بۆ بەهەشتێك کە پانایییەکەی ئاسمانەکان و زەویە، ئەی ئاگر- دۆزەخ - لەکوێیە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پاك و بێگەری بۆ خوا، ئەی شەو لە کوێیە لەکاتێکدا ڕۆژ هات؟)

هەروەها ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوەو وتوویەتی: یونس بۆی گێڕامەوە، لە ئیبن وەهەبەوە، لە موسلیمی کوڕی خالیدەوە، لە ئەبی خوسەیمەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبی ڕاشدەوە، لە یەعلای کوڕی موڕەوە، وتوویەتی: گەشتم بە تەنوخی نێراوی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بۆلای هێرقل لە حیمس کە پیرێکی گەورە بوو، لاواز بوو بوو، وتی: چومە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بە نوسراوەکەی هێرقلەوە، پیاوێك کەلای چەپیەوە دانیشتبوو نوسراوەکەی وەرگرت: دەڵێ: وتم: ئەو هاوەڵەتان کێیە کە دەیخوێنێتەوە؟ وتیان: معاویەیە، نوسراوی هێرقل ئەمەی تێدا نوسرابوو: تۆ نوسیوتەو بانگی من دەکەیت بۆ بەهەشتێك پانایییەکەی ئاسمانەکان و زەویەو ئەویەهەشتە بۆ لەخواترسان ئامادە کراوە، ئەی کەواتە ئاگر لە کوێیە؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی : (پاك و بێگەری بۆ خوا ئەی شەو لە کوێیە کاتێك ڕۆژ هات؟).

ئەعمەش و سوفیانیسەوری و شوعبە لە قەیسی کوڕی موسلیمەوە، لە تاریقی کوڕی شەهابەوە، دەڵێن: کۆمەڵێك لە جولەکەکان پرسیاریان لە عومەری کوڕی خەتاب کرد سەبارەت بە بەهەشتێك پانتایییەکەی ئاسمانەکان و زەوی بێت، وتیان: ئەی ئاگر لەکوێیە؟ عومەر پێی وتن: بینیتان کاتێك کە ڕۆژهات شەو لەکوێیە؟ کاتێك کە شەو هات ڕۆژ لە کوێیە؟ وتیان بەراستی هاوشێوەی ئەمە لە تەوراتدا هاتوەئیبن جەریر لە سێ ڕێگاوە گێڕاویەتیەوە، پاشان وتی: ئەحمەدی کوڕی حازم بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو نەعیمەوە، لە جەعفەری کوڕی بورقانەوە، یەزیدی کوڕی ئەسەم هەواڵی پێداین کە : پیاوێکی ئەهلی کیتاب وتی: دەڵێن: ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾، کەواتە ئاگر لەکوێیە؟ ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: شەو لەکوێیە کاتێك ڕۆژهات، وە ڕۆژ لەکوێیە کاتێك شەو هات؟ ئەوەش بە مەرفوعی گێڕراوەتەوە کە بەزاز وتویەتی: موحەممەدی کوڕی موعەمەر بۆی گێڕاینەوە، لە موغەیرەی

کوڕی سەلەم ئەبو هیشامەوە، لە عەبدولواحیدی کوڕی زیادەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەسەممەوەو، لە مامیەوە یەزیدی کوڕی ئەسەم، لە ئەبی هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) و وتی: کاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ ئەی ئاگر لە کوێیە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا شەوت بینیوە کاتێك هات هەمووشتێك دادەپۆشێت، لەوکاتەدا ڕۆژ لەکوێیە؟) وتی: لەو شوێنەیە کە خوا ویستویەتی. فەرمووی: (بەهەمان شێوە ئاگر لەو شوێنەیە کە خوای گەورەو باڵادەست ویستی لێیەتی).

ئەمەش دوو واتا هەڵدەگرێت، یەکەمیان: مەبەست پێی ئەوەیە مەرج نیە کاتێك ڕۆژ دێت و ئێمە شەو نابینین کەواتە شەو لە هیچ شوێنێك نیە، ئەگەرچی ئێمەش نەیزانین، بەهەمان شێوە ئاگر لەو شوێنەیە کە خوای گەورە ویستی لێیەتی، ئەمەش ڕونترو ئاشکراترە وەك لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەدا هاتبوو.

دووەمیان: واتاکەی ئەوەیە کاتێك ڕۆژ لەلایەکەوە ڕووی جیهان ڕووناك دەکاتەوەو دایدەپۆشێت، ئەوە لەوکاتەدا شەو لەلایەکی تری جیهاندایە، بەهەمان شێوە بەهەشت لە بەرزترین شوێندایە لەسەرو ئاسمانەکانەوە لەژێر عەرشی پەروەردگاردا بە پانایی عەرش. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ [الحديد: ٢١] ئاگریش لە خواری خوارەوەیە، ئەمەش ڕێگر نیە لە نێوان ئەوەی بەهەشت پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوی بێت و، لەنێوان هەبوونی ئاگردا، خوای گەورەش زاناترە.

دواتر خوای گەورە باسی سیفەتەکانی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾، واتە لە بون و نەبون و گرانی و هەرزانی و سەختی و خۆشگوزەرانی و بێ خۆش بوون و بێ ناخۆش بوون و تەندروستی و نەخۆشی و لە هەموو بارەکاندا، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ [البقرة: ٢٧٤]. واتاکەی ئەوەیە کە هیچ شتێك لایان نادات لە گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگارو بەخشین لە پێناوی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەودا، بە چاکەکردن لەگەڵ

بەدیهێنراوەکانیدا لە کەسە نزیکەکانیان و لە کەسانی تریش بە هەموو جۆرە چاکەیەك.

کە دەشفەرموێت: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ﴾، واتە کاتێك رق و قین و هەڵچونیان بۆ دروست دەکات ئەوان دەیخۆنەوە، بەو واتایەی کە دەیشارنەوەو کاری پێ ناکەن، لەگەڵ ئەمەشدا دەبورن لەو کەسەی خراپەی لەگەڵدا کردون، لە هەندێك ئەسەردا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی ئادەمیزاد هەرکات توڕەبویت یادی من بکە، منیش لەکاتێکدا توڕەبوم یادت دەکەم و لەگەڵ ئەوانەی لەناویان دەبەم تۆ لەناو نابەم و گرفتارت ناکەم) ئیبن ئەبی حاتەم گێڕاویەتیەوە.

ئەبو یەعلاش لە مەسنەدەکەیدا وتویەتی: ئەبو موسای زەمەن بۆی گێڕاینەوە، لە عیسای کوڕی شوعەیبی زەریر ئەبولفەزڵەوە، لە ڕەبیعی کوڕی سولەیمانی جیزیەو، لە ئەبی عەمری کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە باوکیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس توڕەییەکەی واز لێ بێنێت، خوای گەورە سزای دۆزەخەکەی لەو دەگێڕێتەوە، هەرکەسیش زمانی بگرێت، خوای گەورە عەیب و عاری دادەپۆشێت، هەرکەسیش پۆزش بۆ پەروەردگار بێنێتەوە خوای گەورە پۆزشەکەی وەردەگرێت) ئەم فەرموودەیە غەریبەو، لە ئیسنادەکەیدا قسە هەیە.

ئیمام ئەحمەد دەڵی: عەبدولرەحمان بۆی گێڕاینەوە، لە مالیکەوە، لە زەهریەوە، لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە، لە ئەبی هوڕەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بەهێز ئەو کەسە نیە زۆرانبازێکی بەهێزە، بەڵکو بەهێز ئەو کەسەیە لەکاتی توڕەبوندا زاڵ دەبێت بەسەر نەفسی خۆیدا). بوخاری و موسلیم لە فەرموودەی مالیکەوە گێڕاویانەتەوە.

بەهەمان شێوە ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو معاویە بۆی گێڕاینەوە، لە ئەعمەشەوە، لە ئیبراهیمی تیمیەوە، لە حارسی کوڕی سوەیدەوە، لە عەبدوڵڵاوە کە ئیبن مەسعودە (ڕەزای خوای لێ بێت) تویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (کێ لە ئێوە سامانی واریسەکەی لە سامانی

خۆی لاخۆشەویسترە) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ کەسمان نیە کە سامانی خۆی لە سامانی واریسەکەی لا خۆشەویستر نەبێت، فەرمووی: (بزانن هیچ کەس نیە لە ئێوە سامانی واریسەکەتان لە سامانی خۆتان لا خۆشەویستر نەبێت، تۆ لە سامانەکەت خاوەنی هیچ شتێك نیت تەنها ئەوە نەبێت کە پێش خۆت ناردوتە بۆ قیامەت، سەروەت و سامانی واریسەکەشت ئەوەیە کە دوای خۆت جێت هێشتووە) وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لەناو ئێوەدا کێ بە بەهێز دادەنێن؟) وتمان: ئەوکەسەی پیاوان زۆرانبازی لەگەڵ دەکەن. فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو ئەو کەسەی لەکاتی تورەبووندا بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ دەبێت ( وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی : (ئێوە کێ بەوەجاخ کوێر دادەنێن؟) وتیان: ئەوکەسەی کە منالی نیە، فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو ئەوکەسەی لە منالەکەیەوە هیچی پێشکەش نەکراوە) بوخاری بەشی یەکەمی فەرموودەکەی ئیخراج کردووەو، موسلیمیش ئەصلی فەرموودەکەی ئیخراج کردووە، لە گێرانەوەی ئەعمەشەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: موحەممەدی کوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە، لە شوعبەوە دەڵێ، گوێم لێ بوو عورەوەی کوڕی عەبدوڵڵای جەعەفی لە حەسبە یان ئیبن ئەبی حەسینەوە دەیگێڕایەوە، لە پیاوێکەوە کە پێغەمبەری بینی بوو (دروودی خوای لێ بێت) وتاری دەدا، فەرمووی: (ئایا دەزانن کێ وەجاخ کوێرە؟) وتمان: ئەو کەسەی منالی نیە. فەرمووی: (وەجاخ کوێری تەواو ئەو کەسەیە منالی هەیە بەڵام کە مرد لە منالەکانیەوە هیچی پێ ناگات و پێشکەشی ناکرێت) فەرمووی: (ئایا دەزانن ریسوا کێیە؟) وتمان: ئەو کەسەیە کە هیچ پارەی نیە. فەرمووی: (ریسوای تەواو ئەو کەسەیە کە پارەی هەیە بەڵام کە مرد لەوپارەیە هیچی پێ ناگات و هیچی لێ پێش خۆی نەخستووە) دەڵێ: پاشان پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەی بەهێزی کێیە؟) وتیان: بریتیە لە زۆرانبازێکی بەهێز. فەرمووی: (بەهێزی تەواو ئەو کەسەیە کە تورە دەبێت و تورەبوونەکەی توند دەبێت و دەموچاوی سور دەبێتەوەو قژی هەڵدەچێت بەڵام زۆرانبازی تورەییەکەی دەکات و بەسەر تورەییەکەیدا زاڵ دەبێت).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبی نومەیر بۆی گێڕاینەوە، لە هیشامی کوڕی عورەوە، لە باوکیەوە، لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە، لە مامێکیەوە کە پێی دەوترا جاریەی کوڕی قودامەی سەعدی، کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) کردووەو، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا قسەیەکم پێ بڵێ سودم پێ بگەیەنێت با کەمیش بێت تاکو لێی تێ بگەم، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (تووڕە مەبە) پیاوەکە چەند چار قسەکەی دووبارە کردەوە بۆ پێغەمبەر، ئەویش هەر دەیفەرموو (تووڕە مەبە) هەر بەمشێوەیە ریوایەتی کردووە لە ئەبی معاویەوە، لە هیشامەوە، هەروەها لە یەحیای کوڕی سەعیدی قەتانەوە، لە هیشامەوە ریوایەتی کردووە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قسەیەکم پێ بڵێ با قسەکەش کەم بێت تاکو لێی تێ بگەم، فەرمووی: (تووڕەمەبە) بە تەنها ئەحمەد هێناویەتی.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو معاویە بۆی گێڕاینەوە، لە داودی کوڕی ئەبو هیندەوە، لە ئیبن ئەبی حەرب ئەبی ئەسوەدەوە، لە ئەبی ئەسوەدەوەو، لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: لەسەر حەوزێکی خۆی ئاوی داوە بەخەڵکی کۆمەڵێك هاتون و پێیان وتووە: کێ لە ئێوە دەچێتە لای ئەبو زەڕو چەند تاڵە قژێك لەسەری دەکاتەوە؟ پیاوێك وتی: من، پیاوەکە هات و ڕۆشتە سەر حەوزەکەو لە قژی ئەبوزەڕی نەوی و ئازاری دا، لەوکاتەدا ئەبو زەر کە بە پێوە بوو دانیشت و، دواتر ڕاکشا، پێی وترا: ئەی ئەبا زەڕ بۆچی دانیشتیت و پاشان ڕاکشایت؟ وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووي: (ئەگەر کەسێکتان تووڕەبوو بە پێوە بوو با دانیشێت، ئەگەر تووڕەییەکەی نەما باشە، ئەگینا با ڕاکشێت.. ئەبو داود لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە بە ئیسنادەکەی گێڕاویەتیەوە) بەڵام لە گێڕانەوەکەیدا لە ئەبی حەرب و ئەویش لە ئەبی زەڕ گێڕاویەتیەوە کەلە ئەبی زەڕ روویدا.. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئیبن ئەبی حەرب لە باوکیەوە، لە ئەبو زەڕەوە، هەروەك عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئیبراهیمی کوڕی خالید بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو وائلی سەنعانیەوە، وتی: ئێمە لەلای عورووەی کوڕی

موحەممەدا دانیشتبووین پیاوێك هاتە لای و بە قسەیەك قسەی لەگەڵ کرد کە توڕەی کرد، کاتێك کە توڕەی کرد هەستایەوەو ڕۆشت پاشان گەڕایەوە بۆلای ئێمەو دەستنوێژی گرتبوو، وتی: باوکە لە باپیرمەوە عەتییە کە ئیبن سەعدی سەعدیە بۆی گێڕامەوە - ئەو هاوڵێتی هەبوو - وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووین: (بەڕاستی توڕەیی لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لەئاگر بەدی هێنراوە، ئاگریش تەنها بە ئاو دەکوژێتەوە، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێکتان توڕەبوو با دەست نوێژ بگرێت) بەمشێوەیە ئەبو داود لە فەرموودەی ئیبراهیمی کوڕی خالیدی سەنعانیەوە لە ئەبی وائیلی قاسی موڕادی سەنعانیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەبو داود دەڵێ: وادەزانم عەبدوڵلای کوڕی بوحەیرە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی یەزید بۆی گێڕاینەوە، لە نوخی کوڕی جەعوەنەی سەعیەوە، لە موقاتیلی کوڕی حەیانەوە، لە عەتائەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس ڕێگە نیشانی کەسێکی بارقورس بدات یان ئاسانکاری بۆ بکات و لەسەری لایببات، خوای گەورە پاراستویەتی لە فراوانی دۆزەخ، ئەوە نەبێت کە کاری بەهەشت خەفەت خواردنە بە کۆمەڵ - سێ جار - بەڵام کاری دۆزەخ ئاسانە بە هەڵەکردن و بیرکردن، بەختەوەر کەسێکە خۆی پاراستبێت لە فیتنەو ئاشوب، هیچ قومێك نیە خۆشەویستربێت لای پەروەردگار لەو قومە توڕەییەی بەندەیەك دەیخواتەوە و تەنها لەبەرخوا دەیخواتەوە، ئەوە خوای گەورە ناوناخی پڕ دەکات لە ئیمان) تەنها ئەحمەد هێناویەتی و، ئیسنادەکەی حەسەنەو، تانە لێدراوی تێدا نیە. مەتنەکەشی حەسەنە.

فەرموودەیەکی تر لە واتاکەیدا: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو داود وتی: عوقبەی کوڕی موکریم بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولڕەحمان واتە ئیبن مەهدیەوە، لە بیشر واتە ئیبن مەنسورەوە، لە موحەممەدی کوڕی عیجلانەوە، لە سوەیدی کوڕی وەهەبەوە، لە پیاوێکەوە لە نەوەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە باوکیەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس ڕق و قینی خۆی بخواتەوە لەکاتێکدا تواناى جێبەجێ کردنی

هەبێت، خوای گەورە ناخی پڕ دەکات لە ئاسایش و ئیمان، هەرکەسیش واز لە لەبەرکردنی جلءبەرگی جوان بێنێت لەکاتێکدا توانای بەسەریدا هەبێت - بیشر وتی: وابزانم فەرمووی - لەبەر تەوازوع و خۆ بەکەم زانین - خوای گەورە جل و بەرگی کەرامەت و شکۆمەندی لەبەر دەکات و هەرکەسیکیش تاج بکاتە سەرکەسێك لە پێناوی خوادا، خوای گەورە تاجی پادشای لەسەر دەکات).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی یەزید بۆی گێڕاینەوەو وتی: سەعید بۆی گێڕاینەوە، ئەبو مەرحوم بۆی گێڕامەوە لە سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەسەوە، لە باوکیەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس رق و قینی خۆی بخواتەوە و توانای بەسەر جێبەجێکردنیدا هەبێت خوای گەورە لەسەرو هەموو بەدیهێنراوەکانەوە بانگی دەکات تاکو سەرپشکی بکات لە هەڵبژاردنی هەر حۆریەکدا کە دەیەوێت) ئەبو دوادو ترمزی و ئیبن ماجەش لە فەرموودەی سەعیدی کوڕی ئەبی ئەیوبەوە گێڕاویانەتەوە، ترمزی وتویەتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

فەرموودەیەکی تر: عەبدولڕەزاق وتی: داودی کوڕی قەیس هەواڵی پێداین لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە پیاوێکی خەڵکی شارەوە کە پێی دەوترا عەبدولجەلیل، لە مامێکیەوە، لە ئەبي هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی ﴿وَٱلۡكَـٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ دەڵێ، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس رق و قینێك بخواتەوە لەکاتێکدا توانای بەسەر جێبەجێکردنیدا هەبێت خوای گەورە بە ئاسایش و ئیمان پڕی دەکاتەوە) ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن مەردەویە دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی زیاد بۆی گێڕاینەوە، کە یەحیای ئەبو تالیب هەواڵی پێداین، عەلی کوڕی عاسم هەواڵی پێداین، یونسی کوڕی عوبەید لە حەسەنەوە بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبن عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بەندە هیچ قومێکی نەخواردۆتەوە باشتر بێت لە قومە توڕەییەك کە لەبەر ڕەزامەندی خوا خواردبێتیەوە) هەر بەمشێوەیە ئیبن ماجە لە

بیشری کوڕی عومەرەوە، لە حەمادی کوڕی سەلەمەوە، لە یونسی کوڕی عوبەیدەوە گێڕاویەتیەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ﴾ واتە تووڕەییەکەیان بەرامبەر خەڵکی بەکار ناهێنن، بەڵکو خەڵکی لە خراپەی خۆیان بەدوور دەگرن، پاداشتی ئەم کارەشیان لای پەروەردگارەوە چاوەڕوان دەکەن.

دواتر پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾، واتە لەگەڵ ئەوەی خۆیان لە خراپەکردن بەرامبەر بە خەڵکی لادەدەن لەهەمانکاتدا دەبورن لەوانەی زوڵمیان لێ کردون و لەناو دڵیاندا هیچ نارەحەتی و بێزاریەك بەرامبەر هیچ کەس ناهێڵن، ئەمەش باشترین حاڵە، لەبەرئەوە خوای دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ ئەمە لە پلەکانی ئیمانە، کە لە فەرموودەدا هاتووە: (سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم: هەرگیز سەدەقەو بەخشین لە پارەوە سامان کەم ناکاتەوە، وە جگە لەزیادکردنی عیزەت و سەربەرزی خوای گەورە هیچ شتێك بە بەندە نادات لە بەرامبەر لێبوردن لە خەڵکیدا، هەرکەسیش لەبەر خاتری خوا گەردن کەچی بنوێنێت خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە) حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا لە فەرموودەی موسای کوڕی عوقبەوە، لە ئیسحاقی کوڕی یەحیای کوڕی تەڵحەی قەرەشیەوە، لە عوبادەی کوڕی سامتەوە، لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەرکەس ئەوە دڵخۆشی دەکات کە خانوی بۆ بەرز بکرێتەوەو پلەوپایەکانی بۆ بەرز بکرێتەوە، با ببورێت لەو کەسەی ستەمی لێکردووە، ببەخشێت بەو کەسەی بێ بەشی کردووە، سەردانی ئەو کەسە بکات پەیوەندی لەگەڵدا پچراندوە) پاشان وتی: سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە.

ئبن مەردەویەش هێناویەتی لە فەرموودەی عەلی و کەعبی کوڕی عوجرەوە لە ئەبی هورەیرەو ئوم مەسلەمەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) بەهەمان شێوە. هەروەها لە ڕێگەی زوحاکەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کاتێك ڕۆژی قیامەت هات بانگ کەرێك بانگ دەکات: کوان ئەو کەسانەی لە خەڵکی

خۆش دەبوون؟ ڕاکەن بۆلای پەروەردگارتان و پاداشتەکانتان وەربگرن، ئەوە مافە لەسەر هەر مرۆڤێکی موسڵمان ئەگەر بوراو خۆش بوو لە خەڵکی بچێتە بەهەشتەوە).

دواتر پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ﴾، واتە ئەگەر تاوانێکیان ئەنجام دا بەدوایدا تەوبەو داوای لێخۆشبوون دەکەن. ئیمام ئەحمەد دەڵێ: یەزید بۆی گێڕاینەوە، لە هەمامی کوڕی یەحیاوە، لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی تەڵحەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی عەمرەوە، لە ئەبی هوڕەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (پیاوێك تاوانێکی ئەنجامداو وتی: خوایەگیان من تاوانێکم ئەنجامداوە لێم ببورەو لەو تاوانەم خۆشبە، خوای گەورە فەرمووی: بەندەکەم تاوانێکی کردو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت و لەسەریشی سزای دەدات، ئەوە من لە بەندەکەم خۆش بووم، پاشان تاوانێکی تری کردو وتی: خوایەگیان من تاوانێکم ئەنجامداوە لێم ببورەو لە تاوانەکەم خۆشبە، خوای گەورە فەرمووی: بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت و لەسەریشی سزای دەدات، ئەوە لەبەندەم خۆش بووم، پاشان تاوانێکی تری کردو وتی: پەروەردگاری من، من تاوانێکم ئەنجامداوە لێم ببورە و لە تاوانەکەم خۆشبە، خوای گەورەو باڵادەست فەرمووی: بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت و لەسەریشی سزای دەدات، ئێوە بەشاهید بن ئەوە لە بەندەکەم خۆش بووم هەرچیەکی دەوێت با بیکات) لە سەحیحی بوخاری و موسلیمەوە ئیخراجیان کردووە لە فەرموودەی ئیسحاقی کوڕی ئەبی تەڵحەوە بەشێوەی ئەمە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەبو نەزرو ئەبو عامر بۆیان گێڕاینەوە، وتیان: زوهەیر بۆی گێڕاینەوە، لە سەعدی تائیەوە، لە ئەبو مودەلـلەی مەولای دایکی ئیماندارانەوە، گوێی لە ئەبو هوڕەیرە بووە، وتوویەتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لێ بێت) هەرکات تۆمان بینی دڵەکانمان نەرم دەبێت و، ئێمە لەگەڵ قیامەت ویستاندا دەبین،

هەرکاتێکیش لەتۆ جیابووینەوە دنیا سەرسامان دەکات و، پێوەی سەرقاڵ دەبین و، بە ئافرەت و منداڵەوە سەرقاڵ دەبین، فەرمووی: (ئەگەر ئێوە لە هەموو بارێکدا وەك ئەو بارە بونایە کە لای منن - لەگەڵ منداڵان - ئەوە فریشتەکان بە دەستەکانیان تەوقەیان لەگەڵ دەکردن و لە ماڵەکانتاندا سەردانیان دەکردن، خۆ ئەگەر ئێوە تاوانتان نەکردایە خوای گەورە کۆمەڵێکی تری دەهێنا کە تاوان بکەن و داوای لێخۆش بوون لە پەروەردگار بکەن) وتمان: سەبارەت بە بەهەشت قسەمان بۆ بکە خانوەکانی چین؟ فەرمووی: (خشتێك ئاڵتون و خشتێك زیوە، چیمەنتۆکەی میسکی (الاژفر)ە، چەوەکانی مرواری و یاقوتن، خۆڵەکەی زەعفەرانە، هەرکەس بچێتە ناویەوە لە خۆشیدا دەژی و نارەحەت نابێت، بەهەتا هەتای دەژی و نامرێ و جل و بەرگەکانی نارزێن و، لاوێتی بەسەر ناچێت، سێ کەسیش نزاو پاڕانەوەیان بەرپەرچ نادرێتەوە: پێشەوایەکی دادپەروەرو، ڕۆژووەوان تا دەیشکێنێت و، نزای ستەملێکراویش لەسەر هەورەکان هەڵدەگیرێت و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوەو، پەروەردگار دەفەرموێت: سوێند بە عیزەتی خۆم سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەکی تریش بێت). ترمزی و ئیبن ماجە بە جۆرێکی تر لە فەرموودەی سەعدەوە گێڕاویانەتەوە.

هەروەها تەئکید لەسەر دەستنوێژگرتن و دورکات نوێژ دەکاتەوە لەکاتی تەوبەکردندا، ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ریوایەتی کردووە، دەڵێ: وەکیع بۆی گێڕاینەوە، لە موسعەرو سوفیانی سەوریەوە، لە عوسمانی کوڕی موغیرەی سەقەفیەوە، لە عەلی کوڕی رەبیعەوە، لە ئەسمای کوڕی حەکەمی فەزاریەوە، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: من هەرکات گوێم لە فەرموودەیەکەوە ببوایە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) هێندەی خوا بیویستایە بەو فەرموودەیە سودی پێ دەگەیاندنم، وە ئەگەر کەسێکی تر فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە بۆ بگێڕامایەتەوە سوێندم دەدا، ئەگەر سوێندی بۆ بخواردمایە بڕوام دەکرد، ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە - بەڕاستی راستی کرد ئەبوبەکر - کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەر پیاوێك تاوانێکی ئەنجامداو پاشان دەستنوێژی گرت

بەشێوەیەکی تەواو - موسەعەر وتی - نوێژیشی کرد - سوفیانیش وتی - پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد - و داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگار کرد ئەوە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە لێی خۆش بووە) بەمشێوەیە عەلی کوڕی مەدینی و حەمیدی و ئەبوبەکری کوڕی ئەبی شەیبەو ئەهلی سونەن و ئەبی حەبان لە سەحیحەکەیداو بەزازو دارئەلقوتنی لە ڕێگەی عوسمانی کوڕی موغیرەوە گێڕاویانەتەوە، ترمزی وتویەتی: ئەوە فەرموودەیەکی حەسەنەو، ئێمەش ڕێگەکانیمان باسکرد، قسە لەسەر کورتکراوەتەوە لە مەسنەدی ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خوای لێ بێت)دان پوختەی قسەکە ئەوەیە کە فەرموودەکە حەسەنەو، لە گێڕانەوەی پێشەوای موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبو تالیبە لە ئەبوبەکری سدیقەوە (ڕەزای خوای لێ بێت).

ئەوەی شاهیدی ڕاستی ئەم فەرموودەیە دەدات ئەوەیە کە موسلیم لە سەحیحەکەیدا لە پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (هەرکەسێك لەئێوە دەستنوێژ بگرێت دەستنوێژێکی تەواو و جوان، پاشان بڵێ: اشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، ئەوە بەدڵنیاییەوە هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە هەرکامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە).

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە پێشەوای موسڵمانان عوسمانی کوڕی عەفانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەستنوێژی بۆ گرتوون وەك دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) و پاشان وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (هەرکەس وەك ئەم دەستنوێژکردنەی من دەستنوێژی گرت و پاشان دوو ڕکات نوێژی کردو تیایدا بێ ئاگاو داڵغە لێدەرنەبوو، ئەوە لە هەموو تاوانەکانی ڕابردووی دەبەخشرێت) ئەم فەرموودەیە لە گێڕانەوەی هەرچوار پێشەواو خەلیفە ڕاشدینەکانەوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) چەسپاوە، هەروەك چۆن قورئانیش ئاماژەی پێدەکات کە: داوای لێخۆشبون کردن سوود بە تاواناکارو سەرپێچیکار دەگەیەنێت.

عەبدولڕەزاقیش وتویەتی: جەعفەری کوڕی سولەیمان هەواڵی پێداین لە

سابتەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێم.گەشتووە، لەکاتێکدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ﴾، شەیتان گریا.

حافز ئەبو یەعلا دەڵێ: موحریزی کوڕی عەون بۆی گێڕاینەوە، لە عوسمانی کوڕی مەتەرەوە، لە عەبدولغەفورەوە، لە ئەبی نوسەیرەوە، لە ئەبی ڕەجائەوە، لە ئەبو بەکرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (فەرمانتان پێدەکەم بەردەوام (لا إله إلا الله) و (استغفر الله) زۆر بڵێن، چونکە شەیتان وتی: خەڵکیم بە هیلاکەتا برد بە تاوانکردن و ئەوانیش منیان بە هیلاکەتا برد بە (لا إله إلا الله) و (استغفر الله)، کاتێك ئەوەم بینی بە ئارەزووبازی بە هیلاکەتما بردن، چونکە ئەوان وا حساب دەکەن کە هیدایەت دراون) عوسمانی کوڕی مەتەرو هەردوو شێخەکەی لاوازن.

ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا لە ڕێگەی عەمری کوڕی ئەبی عەمرو ئەبی هەیسەمی عەتواریەوە، لە ئەبی سەعیدەوە گێڕاویانەتەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (شەیتان وتی: ئەی پەروەردگار سوێندم بە عیزەتی تۆ هەتاکو ڕۆح لە جەستەی بەندەکانتدا بێت بەردەوام لە ڕێگەی ڕاست لایان دەدەم و سەرگەردانیان دەکەم، خوای گەورەش فەرمووی: سوێند بە عیزەت و جەلالی خۆم تاکو ئەوان داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن منیش لێیان خۆش دەبم).

هەروەها حافز ئەبو بەکری بەزاز دەڵێ: موحەممەدی کوڕی موسەنا بۆی گێڕاینەوە، لە عومەری کوڕی ئەبی خەلیفەوە، بیستم ئەبا بەدر لە سابتەوە بۆی گێڕاینەوە، لە ئەنەسەوە، وتی: پیاوێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تاوانێکم ئەنجامداوە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەگەر تاوانت کردووە داوای لێخۆش بوون لە پەروەردگارت بکە، وتی من داوای لێخۆشبوون دەکەم، بەڵام جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەر تاوان و دەیکەمەوە، فەرمووی: ئەگەر تاوانت کردەوە جارێکی تر داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارت بکە، لە جاری چوارەمدا فەرمووی: داوای لێبوردن و لێخۆشبوون لە پەروەردگارت بکە تاکو شەیتان نائومێد دەبێت) ئەمە فەرموودەیەکی غەریبە لەم ڕووەوە.

کە دەشفەرموێت: ﴿وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾، واتە جگە لەو هیچ کەس لە تاوانەکان خۆش نابێت، وەك ئیمام ئەحمەد وتویەتی: موحەمەدی کوڕی موسعەب بۆی گێڕاینەوە، لە سەلامی کوڕی مسکین و موبارەکەوە، لە حەسەنەوە، لە ئەسوەدی کوڕی سەریعەوە دەڵێ: دیلێك هێنرا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (حەقی ناسی بۆ خاوەنەکەی).

پاشان پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە دەستیان لە تاوانەکانیان هەڵگرت و پەشیمان بونەوەو گەڕانەوە بۆلای پەروەردگار لە کاتێکی نزیکداو، بەردەوام نەبوون لەسەر تاوان و سەرپێچی کردن و دەستیان لێ هەڵگرت، وە ئەگەر تاوانیان دووبارە کردەوە داوای لێخۆشبوون دەکەنەوە، وەك حافز ئەبو یەعلای موسلی لە مەسنەدەکەیدا دەڵێ: ئیسحاقی کوڕی ئەبی ئیسرائیل و جگە لەویش گێڕاویانەتەوە، وتویانە: ئەبو یەحیا عەبدولحەمیدی حەمدانی بۆی گێڕاینەوە، لە عوسمانی کوڕی واقیدەوە، لە ئەبی نوسەیرەوە، لە خزمەتکارێکی ئەبوبەکرەوە، لە ئەبو بەکرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ئەوکەسەی بەردەوام داوای لێخۆشبوون دەکات ئەوە لەسەر تاوان بەردەوام نیە ئەگەر لە ڕۆژێکدا حەفتاجار بگەڕێتەوە سەری) هەروەها ئەبو داودو ترمزی و بەزاز لە مەسنەدەکەیدا لە فەرموودەی عوسمانی کوڕی واقیدەوەو یەحیای کوڕی موعین متمانەی پێ بەخشیوە لە شێخەکەیەوە ئەبو نوسەیرەی واسیتی کەناوی موسلیمی کوڕی عوبەیدە، ئیمام ئەحمەد و ئیبن حەبان متمانەیان پێ داوە، قسەی عەلی کوڕی مەدینی و ترمزی ئەوەیە: ئیسنادی ئەم فەرموودەیە بەوشێوەیە نیە، ئەوەی دیارە ئەوەیە لەبەر نەناسراوی خزمەتکارەکەی ئەبو بەکرە، بەڵام نەناسراوی کەسێکی وەك ئەو زیان ناگەیەنێت چونکە تابعیەکی گەورەبوو: ئەوەی بەسە کە دەدرێتە پاڵ ئەبوبەکر، کەواتە فەرموودەکە حەسەنە، خوای گەورە زاناترە، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، موجاهید و عەبدوڵلای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر وتی ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، ئەوەیە کە هەرکەس گەڕایەوە خوای گەورە وەری دەگرێتەوەو لێی دەبورێت، ئەمەش وەك ئەم فەرموودەی پەروەردگارە: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ﴾ [التوبة: ١٠٤]، وە

﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ [النساء: ١١٠] وە هاوشێوەی ئەم ئایەتانە زۆرن لە قورئاندا.

هەروەها ئیمام ئەحمەد دەڵێ: یەزید بۆی گێڕاینەوە کە جەریر هەواڵی پێداوە، حەبان کە ئیبن زەیدی ئەرعەبیە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە بۆی گێڕاوەتەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) کە کاتێك لەسەر مینبەر بووە فەرموویەتی: (ڕەحم بکەن ڕەحمتان پێدەکرێت، ببورن دەبوورێن، وەیل بۆئەوانەی قسەی ناشیرین دەکەن و هەرچیەکیان بەدەمداهات دەیڵێن، وەیل بۆ ئەوانەی سورن و بەردەوامن لەسەر ئەو تاوانانەی دەیکەن و چاك ڕاستیەکەش دەزانن) تەنها ئەحمەد هێناویەتی.

دواتر خوای گەورە پاش ئەوەی بە وەسفەکانی خۆیان وەسفی کردن، فەرمووی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ﴾ واتە پاداشتی ئەوان لەسەر ئەو سیفەتانە ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واتە لە هەموو جۆرە خواردنەوەکان ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ واتە بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە ﴿وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ﴾ ئەمەش وەسفی خوایە بۆ بەهەشت.

﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ
عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ
﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن
يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا
بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا
يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾
أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ
ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ ٱلْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ
وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾﴾

خوای گەورە لەگەڵ ئەو ئیماندارانەدا دەدوێ کە لە ڕۆژی ئوحوددا

کارەساتیان بەسەردا هات و حەفتایان لێ شەهید کرا، دەفەرموێت: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ﴾ واتە هاوشێوەی ئەم نارەحەتەیەی بەسەر ئێوەدا هات بەسەر ئوممەتەکانی پێشوشدا هات لە شوێنکەوتووی پێغەمبەران بەڵام سەرەنجام بۆ ئەوان بوو، شتێکیش بۆ بێ باوەڕان بوو، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾. دوای ئەوە فەرمووی: ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ﴾، واتە قورئان رونکردنەوەی هەموو فەرمانەکانی تێدایە بە ئاشکرایی و ئەوەی ڕونکردۆتەوە کە ئوممەتەکانی پێشوو لەگەڵ دوژمنەکانیاندا چۆن بوون ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ﴾، واتە قورئان هەواڵی پێش خۆتانی تێدایەو ﴿وَهُدًى﴾ بۆ دڵەکانتان و ﴿وَمَوْعِظَةٌ﴾ واتە رێگرە لە حەرامەکان و تاوانەکان، پاشان خوای گەورە دڵنەوایی ئیمانداران دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَهِنُوا﴾ واتە بەهۆی ئەوەوە کە رویدا لاواز مەبن ﴿وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە سەرەنجام و سەرکەوتن بۆ ئێوەیە ئەی ئیمانداران. ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ﴾، واتە ئەگەر ئێوە هەندێکتان لێ بریندارببوو وە هەندێکی ترتان کوژراوە، ئەوە بزانن لە دوژمنەکانیشتان ژمارەیەکی نزیك لە ئێوە ل کوژراو بریندارهەیە، ئەوانیش وەك ئێوە کارەسات باربوون ﴿وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾، واتە جارێك دوژمنەکانتان بەسەردا سەردەخەین، ئەگەر چی سەرەنجام هەر بۆ ئێوەیە، ئەمەش لەبەر حیکمەت و داناییەك کە لەم کارەدا هەیە، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئیبن عەباس وتویەتی: لە شێوەی ئەمەدا بۆئەوەی ببینین کێ ئارام دەگرێت لەسەر سەرکەوتنی دوژمنەکان ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ﴾، واتە دەکوژرێن لە پێناوی خواداو تەواوی تواناکانیان لە پێناوی رەزامەندی ئەودا سەرف دەکەن ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ واتە لە تاوانەکانیان خۆش بێت و بیسڕێتەوە ئەگەر تاوانیان هەبێت، وە ئەگەرنا ئەوە بەپێی ئەو ناڕەحەتی و ئازارەی چەشتویانە پلەیان بەرز دەکاتەوە.

کە دەفەرموێت: ﴿وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ﴾ واتە بێ باوەڕەکان ئەگەر فرسەتێکتان بۆ رێکەوت و بردیانەوە ستەم و دەستدرێژی دەکەن و ئەمەش دەبێتە هۆی خاپوربون و لەناوچوون و کارەسات باربون و تیاچوون، دواتر

دەفـەرمـوێـت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾﴾ واتە ئایا ئێوە وا لێکتان داوەتەوە کە دەچنە بەهەشتەوە بێ ئەوەی بەکوشتارو ناڕەحەتیەکان تاقی بکرێنەوە وەك خوای گەورە لە سورەتی (البقرە)دا دەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُواْ﴾ [البقرة: ٢١٤] هـەروەهـا دەفـەرموێت ﴿الم ﴿١﴾ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُواْ أَن يَقُولُواْ آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴿٣﴾﴾ [العنكبوت: ١ـ ٣] لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾﴾ واتە چونە بەهەشت بۆتان مسۆگەر نابێت و دەستی ناخەن تاکو تاقی نەکرێنەوە بە ناڕەحەتی و خوای گەورە تێکۆشەرەکانتان نەبینێت کە لەپێناوی ئەودا تێدەکۆشن، لەگەڵ ئارامگرەکان لەکاتی بەرەنگاربوونەوەو بەرگریکردن لەبەرامبەر دوژمناندا.

کـە دەشـفـەرمـوێـت ﴿وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾﴾، واتە ئێوە ئەی ئیمانداران لە پێش جەنگی بەدرەوە ئاواتە خوازی بەیەك گەشتن بوون لەگەڵ دوژمنان و خۆتان بۆ سوردەکردنەوە، ئاواتە خوازی زۆرانبازی و جەنگی ئەوان و ئارامگرتن بوون لە بەردەمیاندا، دەی ئەوەی ئاواتتان بۆ دەخواست هاتۆتە پێش و لەبەردەمتاندایە، کەواتە بجەنگن و ئارام بگرن.

لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا چەسپاوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئاواتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن مەخوازن، بەڵکو داوای سەلامەتی لە پەروەردگار بکەن و، ئەگەر ڕووبەڕووشیان بوونەوە ئارام بگرن و بزانن کە بەهەشت لەژێر شمشێرەکاندایە).

لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ﴾ واتە مردنتان بینی لەکاتی بریسکەی شمشێرەکان و هاویشتنی تیرەکان و وەشاندنی ڕمەکان و ڕیزبەستنی جەنگاوەرەکاندا بۆ جەنگ و یەکتر کوشتن، زانایانی بواری کەلام ئەوە بە خەیاڵ کردن دادەنێن، ئەوە بینینێکە کە هەست پێکراو نیە وەك چۆن مەڕ خەیاڵی هاوڕێیەتی بەران و دوژمنایەتی گورگ دەکات.

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ
ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ
وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ
ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًاۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ
ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَاۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ
رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ۗ
وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا
ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ
﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْءَاخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ
ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾﴾

کاتێك لە ڕۆژی ئوحودا موسڵمانەکان ئەوەی کوژرا کوژراو ئەوەی شکستی خوارد شکستی خوارد، شەیتان بانگی کرد، بەڵێ بەڕاستی موحەممەد کوژرا، ئیبن قەمیئەش گەڕایەوە بۆناو بت پەرستەکان و، پێی وتن: موحەممەدم کوشت، بەڵام ئەو پێغەمبەری پێکابوو، سەری بریندار کردبوو، ئەمەش کاریگەریەکی زۆر خراپی لەسەر موسڵمانەکان هەبوو، بڕوایان کرد کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) کوژراوە، ئیتر کوژرانی پێغەمبەریان بەلاوە ئاسایی بوو، هەروەك ئەو چیرۆکانەی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەرانی تر گێڕاویەتیەوە کە ڕێکەوتووە لاوازی و ترس و دواکەوتن لە جەنگ بەسەر شوێنکەوتووەکانیاندا هاتووە، لەم بارەیەوە خوای گەورە ئایەتی بۆسەر پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لێ بێت) ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ﴾، واتە پێغەمبەر لە پێغەمبەرانی پێشووەوە پێشەنگی هەیە کە دەگونجێت بکوژرێت.

ئیبن ئەبی نەجیح لە باوکیەوە دەڵێت: پیاوێك لە کۆچکردووەکان بەلای پیاوێك لە پشتیوانەکاندا تێپەڕی کە لە خوێنی خۆیدا دەتلایەوەو پێی وت: ئەی فڵانەکەس ئایا زانیوتە کە موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) کوژراوە، پشتیوانەکە

وتی: ئەگەر موحەممەد کوژرابێت ئەوە گەشتۆتە شوێنی خۆی، ئێوەش بجەنگن لەپێناوی ئاینەکەتاندا، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ﴾، حافز ئەبو بەکری بەیهەقی لە (دلائل النبوه)دا گێڕاویەتیەوە.

پاشان خوای گەورە ڕەخنە لەوانە دەگرێت کە لاوازی روی تێکردوون و دەفەرموێت ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾ واتە بە شکست خواردووی دەگەڕێنەوە؟ ﴿وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِى اللَّهُ الشَّٰكِرِينَ﴾، واتە ئەوانەی هەستان بە گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگارو جەنگ کردن لەپێناوی ئاینەکەیداو شوێنی پێغەمبەرەکەی کەوتن بە زیندویی یان مردویی.

بەهەمان شێوە لە کتێبی سەحیحەکان و مەسنەد و سونەنەکان و کتێبە ئیسلامیەکانی تردا لە ڕێگەی جیاجیاوە ئەمە چەسپاوە کە هەمووی ڕاست و دروستی دەسەلمێنێت و بڕاوەتەوە، منیش ئەوەم لە مەسنەدی هەردوو شێخ ئەبوبەکر و عومەردا (ڕەزای خوایان لێ بێت) باس کردووە کە ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) لەکاتی وەفاتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

بوخاری دەڵی: یەحیای کوڕی بەکیر بۆی گێڕاینەوە، لە لەیسی کوڕی عەقیلەوە، لە ئیبن شەهابەوە، لە ئەبو سەلەمەوە، کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) هەواڵی پێداوە کە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) بەسەر ئەسپێکەوە لە ماڵەکەی خۆیەوە هات کە لە (سنح) بوو تاکو دابەزی و ڕۆشتە مزگەوتەوە، قسەی لەگەڵ خەڵکەکەدا نەکرد تا چووە لای عائیشە، پێغەمبەری خوا تەیەمومی کرد و بە جلێکی حیبری سور داپۆشرابوو، ئەبوبەکر جلەکەی لەسەر دەموچاوی لابردو پاشان بەسەریدا کەوت و ماچی کرد و گریا، پاشان وتی: دایك و باوکم بەفیدات بن، سوێند بەخوا پەروەردگار دوو مردنت لەسەر کۆناکاتەوە، سەبارەت بەو مردنەی کە لەسەرت نوسرابوو ئەوە هاتە ڕێگەت و مردیت.

زەهریش دەڵێ: ئەبو سەلەمە لە ئیبن عەباسەوە بۆی گێڕامەوە کە ئەبوبەکر دەرچوو دەبینێت عومەر قسە بۆ خەڵکەکە دەکات،وتی: دانیشە ئەی عومەر،

بەڵام عومەر دانەنیشت، خەڵکەکە ڕۆشتن بۆلای ئەبوبەکر و وازیان لە عومەر هێنا، ئەبوبەکر وتی: لەپاشاندا، هەرکەس موحەممەد دەپەرستێت ئەوە موحەممەد مرد، هەرکەسیش خوا دەپەرستێت ئەوە خوا زیندووەو نامرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ تا دەگاتە ﴿وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ وتی: سوێند بەخوا وەك ئەوە وابوو خەڵکەکە نەیان زانیبێت ئەو ئایەتە هاتۆتە خوارەوە تاکو ئەبوبەکر بەسەریاندا خوێندیەوە، ئیتر هەموو خەڵکەکە لێیان وەرگرت و هەرکەسێك لە خەڵکەکە گوێی لێی بوو ئایەتەکەی وتەوە، سەعیدی کوڕی موسەیب هەواڵی پێدام کە عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەوە نەبوو تا ئەوکاتەی گوێم لێ بوو ئەبوبەکر خوێندیەوە وشك بووم تەنانەت قاچەکانم نەیان دەگواستمەوە، تا کەوتم بەزەویدا.

هەروەها ئەبو قاسمی تەبەرانی دەڵێ: عەلی کوڕی عەبدولعەزیز بۆی گێڕاینەوە، لە عەمری کوڕی حەمادی کوڕی تەڵحەی قەنادەوە، لە ئەسباتی کوڕی نەسرەوە لە سەماکی کوڕی حەربەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، کە عەلی سەبارەت بە ژیانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەیوت ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾ سوێند بەخوا پاش ئەوەی خوای گەورە هیدایەتی داین وەرناگەڕێینەوە سەر ئایینی پێشومان، سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەر مرد یان کوژرا ئەوە دەجەنگم لەسەر ئەو ئاینەی ئەو لەسەری جەنگا تاکو دەمرم، سوێند بەخوا من براو خزمەتکارو برازاو واریسی ئەوم، کێ هەیە لەمن نزیکتر بێت بەو؟.

کە دەشفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ واتە هیچ کەسێك نامرێت بەقەدەرو بڕیاری خوا نەبێت تاکو ئەو ماوەیە تەواو نەکات کە خوا بۆی نوسیوە، لەبەرئەوە فەرمووی: ﴿كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ وەك ئەم وتەیەی تری پەروەردگار وایە ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ﴾ [فاطر: ١١] هەروەها: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾ [الأنعام: ٢]. ئەم ئایەتە هاندانی تێدایە بۆ ترسنۆکەکان تاکو بجەنگن و ئارەزووی جەنگ بکەن لەپێناوی خوادا، چونکە چونە پێشەوەو خۆ حەشاردان نەلە تەمەن زیاد دەکەن و نە لێی کەم دەکەنەوە، وەك ئیبن ئەبی

حاتەم دەڵێ: عەباسی کوڕی یەزیدی عەبدی بۆی گێڕاینەوە، وتی: گوێم لە ئەبا معاویە بوو لە ئەعمەشەوە، لە حەبیبی کوڕی سوهبانەوە بۆی گێڕاینەوە، وتی: پیاوێك لە موسڵمانەکان کە حوجری کوڕی عودەی بوو وتی: چی ڕێگریتان لێ دەکات تاکو بپەڕنەوە لەم تۆوەوە - دیجلە - بۆ ئەو دوژمنانە، ئەوەتە خوا دەفەرموێت ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ پاشان بە ئەسپەکەی دای لە دیجلەو، کاتێك ئەم ڕۆشتە ناو ڕوبارەکەوە، هەموو خەڵکەکە ڕۆشتنە ناوی کاتێك دوژمن ئەمەیان بینینی، وتیان:کۆببنەوەو ڕایان کرد و هەڵاتن.

دواتر کە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا﴾، واتە هەرکەس کارەکانی بەتەنها بۆ دنیایە دنیای دەست کەوتووەو پاداشتی وەرگرتووە هێندەی کە خوا بۆی نوسیوە، ئیتر هیچ پاداشت و بەشێکی لە قیامەتدا نیە، هەرکێش بە کردارەکانی مەبەستی قیامەتە ئەوە خوای گەورە لە دنیاش هێندەی دەداتێ کە بۆی نوسیوەو، وەك دەفەرموێت ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْءَاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ [الشورى: ٢٠]، یان دەفەرموێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾﴾ [الإسراء: ١٨ ـ ١٩]، لەبەر ئەمەیە کە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، واتە لە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆمان لە دنیاو قیامەتدا پێیان دەبەخشین بەپێی سوپاسگوزاری و کردارەکانیان.

پاشان خوای گەورە بۆ دڵدانەوەی ئیمانداران لەسەر ئەو نارەحەتیەی لە ڕۆژی ئوحود دا بەسەریان داهات فەرمووی: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾، وتراوە: واتاکەی ئەوەیە کە چەندین لە پێغەمبەران و لەگەڵیاندا ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵە چاکەکانیان کوژراون. ئەم قسەیە هەڵبژاردەی ئیبن جەریرە، چونکە وتویەتی: بەڵام ئەوانەی خوێندیانەوە ﴿قُتِلَ معه ربيون كثير﴾ ئەوانە وتیان: ئەوە لە کوشتن مەبەستی پێغەمبەرو هەندێك لەوانەبوو کە لەگەڵیدابوون لە پیاوچاکان و جیا لە هەموویان، هەروەها ترسنۆکی و لاوازیش

بەدور دەگرێت لەوانەی کە مانەوەو نەکوژراون، وتی: ئەوەشی بە ﴿قُتِلَ﴾ خوێندیەوە ئەوە ئەوەی هەڵبژاردووە، چونکە وتویەتی: ئەگەر بکوژرانایە ئەوە بۆ ئەم وتەیەی خوا ﴿فَمَا وَهَنُوا۟﴾ رویەکی زانراو نەدەبوو، چونکە ناگونجێت بڵێیت نەترسان و لاواز نەبوون لەکاتێکدا ئەوان کوژرابن، پاشان خوێندنەوەی ئەوانەی هەڵبژارد کە بەمشێوەیە دەیخوێننەوە ﴿قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ چونکە خوای گەورە بەم ئایەتەو ئایەتەکانی پێشوو سەرزەنشتی ئەوانە دەکات کە لە رۆژی ئوحوددا شکستیان خواردو وازیان لە جەنگ هێنا بە بیستنی هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر لەلایەن بانگ کەرێکەوە کە هاواری دەکرد موحەممەد کوژراوە، خوای گەورە لەسەر هەڵاتن و چۆڵکردنی گۆڕەپانی جەنگ و چەك دانانیان پێی فەرموون: ﴿أَفَإِي۟ن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ﴾ ئەی ئیمانداران ئایا ئێوە لە ئاینەکەتان وەردەگەڕێن و ﴿ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ﴾؟

هەروەها وتراوە: چەندە لە پێغەمبەران هەبوون کە ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵەکانیان لەبەردەستیاندا کوژران، بەڵام قسەی ئیبن ئیسحاق لە ژیاننامەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) شتێکی تر دەخوازێت، ئەو وتویەتی: چەندین پێغەمبەر هەبوون کە کوژران بەڵام ئەو کۆمەڵانەی لەگەڵیدا بوون تووشی ترس نەبوون لەپاش پێغەمبەرەکەیان، وەلەبەردەم دوژمنەکەیاندا لاواز نەبوون و پاڵیان لێ نەدایەوە بەهۆی ئەوەی لە جیهادکردندا لە رێگەی خواو ئاینەکەیدا بەسەریاندا هات، ئەمەش ئارامگرتنە ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾.

ئەم فەرمایشتەی خوا کە دەفەرموێت ﴿قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ی کردووە بە (حال). نوسەیری پشتیوانیەکی زۆر لەم قسەیە دەکات و زیادەڕەویشی تێدا کردووە، ئەویش ئاراستەیەکی هەیە سەبارەت بە ﴿فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ﴾، هەر بەمشێوەیە ئەمەوی لە مەغازیەوە گێڕاویەتیەوە لە کتێبی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم داو کەسی تر نەیگێڕاوەتەوە.

هەندێکی تریشیان بەمشێوە خوێندویانەتەوە ﴿قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ سوفیانی سەوری دەڵی: لە عاسمەوە، لە زوڕەوە، لە ئیبن مەسعودەوە ﴿رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ واتە هەزاران، ئیبن عەباس و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەکرەمەو حەسەن و قەتادەو سەدی و رەبیع و عەتای خوراسانی دەڵێن:

﴿رِبِّيُّونَ﴾ واتە کۆمەڵی زۆر. عەبدولڕەزاقیش لە موعەمەرەوە، لە حەسەنەوە دەڵێ ﴿رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ واتە زانایانی زۆر، هەر لەوەوە دەڵێ: زانایانی بە ئارامی چاکەکارو لەخوا ترسن. ئیبن جەریریش لە هەندێك لە پەیکەرتاشەکانی بەسرەوە گێڕاویەتەیوە کە ﴿رِبِّيُّونَ﴾ بریتیین لەو کەسانی کە پەروەردگاری باڵادەست دەپەرستن. وتویەتی: بەڵام هەندێك بەرپەرچیان داونەتەوەو وتویانە: ئەگەر وابوایە ئەوە بە ﴿رَبِّيُّونَ﴾ واتە دەخوێنرایەوە، ئیبن زەیدیش دەڵێ: ﴿رِبِّيُّونَ﴾ بریتین لە شوێنکەوتەو ژێر دەستەکان. (الربانیون)یش فەرمان ڕەواکانن.

﴿فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟﴾ قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێن ﴿وَمَا ضَعُفُوا۟﴾ بەکوشتنی پێغەمبەرەکەیان ﴿وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟﴾، دەڵێت: لە بینایی و ئاینەکەیان وەرنەگەڕان و وازیان نەهێنا لە جەنگ کردن لەسەر ئەو ڕێبازەی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) جەنگی لەسەر کرد تاکو بە پەروەردگار گەشتنەوە، ئیبن عەباس دەڵێ ﴿وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟﴾ واتە گەردن و سەریان کەچ نەکرد، سەدی و ئیبن زەیدیش دەڵێن: سەرشۆڕنەبوون بۆ دوژمنەکەیان، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق و سەدی و قەتادەش دەڵێن: ئەمەیان بەسەردا نەهات لەکاتێکدا پێغەمبەرەکەیان کوژرا ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾﴾، واتە هیچ داوایەکی تریان نەبوو جگە لەمە ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە سەرکەوتن و زاڵبون و خۆشگوزەرانی ﴿وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾، واتە ئەوەشی لەگەڵ ئەوەی دنیا بۆ کۆکردنەوە ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ
أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ
ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ بِمَآ
أَشْرَكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ

مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم
بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ
مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن
يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ
وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ
أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ
لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ
بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾﴾

خوای گەورە هۆشداری بە بەندە ئیماندارەکانی دەدات کە گوێڕایەڵی بێ باوەڕو دوڕووەکان نەکەن، چونکە گوێڕایەڵیان لە دنیاو قیامەتدا نزمی و ریسوایی بەرهەمدێنێت، لەبەر ئەمە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن تُطِيعُوا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾ پاشان فەرمانیان پێ دەکات بە گوێڕایەڵی پەروەردگارو دۆستایەتی ئەو و پشت بەستن و داوای هاوکاری کردن لێی، دەفەرموێت: ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾﴾. دواتر مژدەیان دەداتێ کە ترسی ئەمان دەخاتە دڵی دوژمنەکانیانەوەو، بەهۆی بێ باوەڕی و بت پەرستیەکەیانەوە سەرشۆڕیان دەکات بۆ ئیمانداران، سەرەڕای ئەو ئەشکەنجەو ئازارو ریسواکردنەی بۆ قیامەت بۆی هەڵگرتون، دەفەرموێت: ﴿سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾﴾. لە هەردوو سەحیحەکەدا چەسپیوە لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (پێنج شتم پێدراوە کە نەدراون بە هیچ یەکێك لە پێغەمبەرانی پێش من: سەرخراوم بە ترس لە دوری یەك مانگ رێکردنەوەو، زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و پاکی و، دەسکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوەو، شەفاعەت و تکام پێ بەخشراوەو، هەر پێغەمبەرێکی - پێشوو - بەتایبەتی نێرراوە بۆ قەومەکەی بەڵام من نێرراوم بۆ هەموو خەڵك بەگشتی).

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئەبی عودەی بۆی گێڕاینەوە لە سولەیمانی تیمیەوە، لە یەسارەوە، لە ئەبی ئومامەوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (پەروەردگارم فەزڵی داوم بەسەر پێغەمبەراندا - یان فەرمووی بەسەر نەتەوەکاندا - بە چوار شت: فەرمووی: نێرراوم بۆلای هەموو خەڵکی بەگشتی، زەوی هەر هەمووی بۆ خۆم و ئوممەتەکەم کراوەتە مزگەوت و پاکی، لە هەر شوێنێك پیاوێك لە ئوممەتەکەم کاتی نوێژی هات مزگەوت و شوێنە پاکەکەی خۆی لەلایدایە، هەروەها سەرخراوم بە ترس لە دووری مانگەرێیەکەوە کە خوای گەورە دەیخاتە دڵی دوژمنەکانەوە، دەسکەوتی جەنگیشم بۆ حەڵاڵ کراوە).

ترمزیش لە فەرموودەی سولەیمانی تیمی، لە یەساری قەرەشی ئەمەوی مەولای دیمەشقیان کە لە بەسرە نیشتەجێ بوو، لە ئەبی ئومامەی سەدی کوڕی عیجلانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوەو، وتویەتی: فەرموودەیەکی حەسەنە.

سەعیدی کوڕی مەنسوریش دەڵێ: ئیبن وەهەب هەواڵی پێداین، کە عومەری کوڕی حارس بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەبا یونس بۆی گێڕاوەتەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (سەرخراوم بە ترس بەسەر دوژمندا) موسلیم لەفەرموودەی ئیبن وەهەبەوە ریوایەتی کردووە.

ئیمام ئەحمەدیش دەڵێ: حسەینی کوڕی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسرائیلەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە، لە ئەبی بوردەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پێنج شتم پێ بەخشراوە: نێراوم بۆ رەش و سوورو، زەویم بۆ کراوەتە مزگەوت و شوێنێکی پاك و، دەسکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە لەکاتێکدا حەڵاڵ نەبوو بۆ ئەوانەی پێش من و، سەرخراوم بە ترس لە دووری مانگە رێیەکەوەو، شەفاعەتم پێ بەخشراوە، هیچ پێغەمبەرێکیش نیە داوای شەفاعەت و تکای خۆی نەکردبێت، بەڵام من شەفاعەتی خۆم شاردۆتەوەو دامناوە بۆ ئەو کەسەی دەمرێت و هیچ هاوەڵێك بۆ خواد بڕیار نادات) تەنها ئەحمەد هێناویەتی.

هەروەها عەوفی لە ئیبن عەباسەوە سەبارەت بە ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ

﴿كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ﴾، دەڵێ: وتویەتی: خوای گەورە ترسی خستە دڵی ئەبو سوفیانەوەو گەڕایەوە بۆ مەککە، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ئەبو سوفیان لە ئێوە ترساو گەڕایەوە، خوای گەورە ترسی خستە دڵیەوە) ئیبن ئەبی حاتەم گێڕاویەتیەوە.

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ﴾، ئیبن عەباس دەڵێ: خوای گەورە پەیمانی سەرکەوتنی پێداین، بەم ئایەتەش بەڵگە لەسەر یەکێك لە دوو قسەکەی پێشوو دێنێتەوە لە ئایەتی ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَـٰثَةِ ءَالَـٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَـٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾﴾ [آل عمران ١٢٤، ١٢٥] کە ئەوە ڕۆژی ئوحودە چونکە دوژمنەکەیان سێ هەزار جەنگاوەر بوون، کاتێك روبەڕوویان بونەوە لە سەرەتای ڕۆژدا سەرکەوتن بۆ ئیسلام بوو، کاتێکیش ئەوەی رویدا رویدا بەهۆی سەرپێچی تیرهاوێژەکان و شکستی هەندێك لە جەنگاوەرەکانەوە، ئەو پەیمانەی پێیان درابوو دواکەوت کە مەرجداربوو بە گوێڕایەڵی و دامەزراویەوە، لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ﴾، واتە لە سەرەتای ڕۆژدا ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُم﴾، واتە دەیانکوژن ﴿بِإِذْنِهِۦ﴾، واتە بەهۆی ئەوەی خوای ئێوە بەسەر ئەواندا زاڵ کرد ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾، ئیبن جەریر دەڵێ: ئیبن عەباس وتویەتی: (الفشل) واتە ترسنۆکی ﴿وَتَنَـٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم﴾ وەك لە تیرهاوێژەکان رویدا ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ﴾ کە بریتییە لەسەرکەوتن بەسەریاندا ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾، ئەوانە بوون کە ئارەزووی کۆکردنەوە دەسکەوتەکانیان کرد پاش شکستی بت پەرستەکان ﴿وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ پاشان ڕێگەی سەرکەوتنمان نیشانی ئەوانداو چاوی ئێوەیان لەسەرنەما تاکو تاقیتان بکاتەوەو هەڵتان بسەنگێنێت ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾، واتە خوای گەورە لەو کارەشتان خۆش بوو، ئەمەش لەبەرئەوەی ژمارەو تفاقی ئەوان زۆرو هی موسڵمانان کەمبوو - خوایگەورە زاناترە.

ئیبن جەریح دەڵێ: کە دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾، واتە: لە

ڕەگ و ریشە دەری نەهێنان، موحەممەدی کوڕی ئیسحاقیش بەهەمان شێوەی وتووە، ئیبن حەریر ریوایەتی کردوون، ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: سولەیمانی کوڕی داود بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی زەنادەوە، لە باوکیەوە، لە عەبدوڵلاوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتویەتی: خوای گەورە لە هیچ شوێنێکی تردا وەك ئوحود سەرکەوتنی نەبەخشی، بەڵام ئێمە ئینکاری ئەمەمان کردو پێمان نەزانی، دەڵێ: ئیبن عەباس وتی: لە نێوان من و ئەوکەسەی ئینکاری ئەوە دەکات قورئانەکەی پەروەردگارە، ئەوەتە خوای گەورە سەبارەت بە ڕۆژی ئوحود دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ إِذۡ تَحُسُّونَهُم بِإِذۡنِهِۦ﴾، ئیبن عەباس و حەسەن دەڵێن: کوشتنە. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾، بەمە مەبەستی تیرهاوێژەکانە، چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە شوێنێکدا جێگیری کردوون و، فەرمووی: (پشتمان بپارێزن، ئەگەر بینیتان دەکوژرێین مەیەن بۆ هاوکاریمان، ئەگەر بینیتان دەسکەوت کۆ دەکەینەوە بەشداریمان مەکەن) بەڵام کاتێك پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەسکەوتەکانی کۆدەکردەوەو، سەربازی بت پەرستەکانیان راونا، هەموو تیرهاوێژەکان رویان کردە گۆڕەپانی جەنگەکەو هاتنە نێو سەربازەکانەوە بۆ کۆکردنەوەی شت و مەك، ئیتر ریزەکان هاوەڵانی پێغەمبەر وەك پەنجەی هەردوو دەست بکەیت بەناو یەکدا ئاوا چوون بەناو یەکداو پەرش و بڵاو بوونەوە، کاتێك تیرهاوێژەکان شوێنەکەی خۆیان چۆڵ کرد، لەو شوێنەوە ئەسپەکان - ئەسپ سوارەکان - هێرشیان کردە سەر هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، بە جۆرێك موسڵمانەکان شڵەژان کە هەندێکیان لە هەندێکی تریانی دەدا، لێیان تێك چوو، بەو شێوەیە ژمارەیەکی زۆر موسڵمان کوژرا، لە سەرەتای ڕۆژدا سەرکەوتن بۆ پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بوو، تەنانەت لە ئاڵا هەڵگرانی قوڕەیش حەوت یان نۆ کەسیان بەدەستی هاوەڵان لێ کوژرا، پاشان موسڵمانان هێرشیان کردەوە بەرەو شاخەکە - ئوحود - بەڵام نەیان توانی بیگرنەوەو کەوتنە ژێر ئامێری جەنگی قوڕەیشیەکانەوە، شەیتانیش هاواری کرد:

موحەممەد کوژرا، کەس گومانی نەدەکرد وا نەبێت، ئێمەش هەروا گومانمان دەبرد کە کوژراوە تا ئەوەبوو لە نێوانی هەردوو سەعدەوە دەرکەوت و بە لەرێ ڕۆشتن و لاکردنەوەکەیدا ناسیمانەوە، دەڵێ: هێندە دڵخۆش بووین وەك ئەوەی هیچ شتێکمان بەسەر نەهاتبێت، دەڵێ: بەرەو ئێمە دوعای دەکرد و دەیفەرموو: (رق و قینی خوا توندو سەخت ببێت لەسەر قەومێك کە دەموچاوی پێغەمبەری خوایان خوێناوی کرد) جارێکی تر دەیفەرموو: (ئەی پەروەردگار بەڕاستی بۆ ئەوان نیە بەرزتر بنەوە بەسەر ئێمەدا - بەسەرماندا سەرکەون) تا گەشتە لای ئێمەو ماوەیەك مایەوە، تاکو ئەوەبوو ئەبو سوفیان لە خواروی لوتکەی شاخەکەوە هاواری دەکرد: هوبەل بەرز راگرن - دووجار وتی - واتە خواکەی - پاشان وتی: ئیبن ئەبی کەبشە لەکوێیە؟ ئیبن ئەبی قەحافە لەکوێیە؟ ئیبن خەتاب لەکوێیە؟ عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا وەڵامی بدەمەوە؟ فەرمووی : (بەڵێ) کاتێك ئەبو سوفیان وتی: هوبەل بەرز راگرن. عومەر وتی: خوای گەورە بەرزتر و بەدەسەڵات ترە، ئەبو سوفیان وتی: (قد انعمت عینها فعاد عنها اوفعال) وتی: ئەی ئیبن ئەبی کەبشە لە کوێیە، ئیبن ئەبی قەحافە لە کوێیە؟ ئیبن خەتاب لە کوێیە؟ عومەر وتی: ئەمە پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لێ بێت) و، ئەوەش ئەبوبەکرەو، ئەمەش من،م عومەر، دەڵێ: ئەبو سوفیان وتی: ئەمڕۆ بە ڕۆژی بەدر، ڕۆژەکان دەستاودەست دەکەن و دەسوڕێنەوە، جەنگیش بە نۆرەیە، دەڵێ: عومەر وتی: وەك یەك نیە، کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدان و، کوژراوەکانی ئێوە لە دۆزەخدان، وتی: ئێوە بڕواتان وایە کە بەوشێوەیە، کەواتە ئێمە ڕەنجەڕۆو زیان مەند بووین، پاشان ئەبو سوفیان وتی: ئێوە لە کوژراوەکانتاندا پەند و ئامۆژگاری دەبینن بەڵام ئەمە لە بیروڕای کوللەکانیشماندا نیە. دەڵێ: پاشان تای نەفامی گرتی و وتی: بەڵام ئەگەر ئەوە ئەوەیە ئێمە پێمان ناخۆش نیە. ئەمە فەرموودەیەکی غەریبەو، چوارچێوەکەی سەیرو سەمەرەیە، وە لە (مرسلات)ەکانی ئیبن عەباسە، چونکە نەخۆی و نەباوکی ئوحودیان نەبینیوە، حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا لە ئەبی نەزری فەقیهەوە لە عوسمانی کوڕی سەعیدەوە، لە سەلمانی کوڕی داودی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە

ئیخراجی کردووە، هەربەمشێوەیە ئیبن ئەبی حاتەم و بەیهەقی لە (دلائل النبوە)دا لە فەرموودەی سولەیمانی کوڕی داودی هاشمیەوە ریوایەتی کردووە، بۆ هەندێکی لە سیحاحەکاندا شاهیدی هەیە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: عەفان بۆی گێڕاینەوە، لە حەممادەوە، لە عەتای کوڕی سائیبەوە، لە شەعەبیەوە، لە ئیبن مەسعودەوە، وتی: لە ڕۆژی ئوحودا ئافرەتان لە پشتەوەی موسڵمانەکان بوون بەسەر برینداراەکاندا دەگەڕان و تیماریان دەکردن، ئەگەر لەو ڕۆژەدا سوێندت بخواردایە کە هیچ کەسێك لە ئێمە نیە دنیای بوێت، ئەوە سوێندەکەت نەدەکەوت، تا خوای گەورە ئەم ئـایـەتـەی نـاردە خـوارەوە ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) سەرپێچیان کردو دەرچوون لەو فەرمانەی پێیان کرابوو، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) تاك کەوتەوەو تەنها نۆ کەسی لە چواردەورمایەوە: حەوت لە ئەنسارەکان و، دوان لە قورەیشیەکان، پێغەمبەر دەیەمیان بوو، کاتێك قورەیشیەکان تەواو ماندویان کرد، فەرمووی: (خوای گەورە رەحم بە پیاوێك بکات دوژمنانمان لێ دور بخاتەوە) دەڵێ: پیاوێك لە ئەنسارەکان هەستایەوەو جەنگا هەتاکو کوژرا، کاتێك ئەویان کوشت جارێکی تر فەرمووی: (خوای گەورە رەحم بە پیاوێك بکات دوژمنانمان لێ دور بخاتەوە) بەردەوام ئەمەی دەفەرموو تاکو حەوت کەسیان کوژرا، پێغەمبەری خوا بە دوو هاوەڵەکەی فەرموو: (ئێمە بە ویژدان نەبووین بەرامبەر هاوەڵەکانمان) ئەبو سوفیان هات و وتی: هوبەل بەرز راگرن، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بڵێن: الله بەرزو بە دەسەڵاتترە. هاوەڵان وتیان: الله بەرزو بە دەسەڵاتترە،پاشان ئەبوسوفیان وتی: ئێمە عوززامان هەیەو ئێوە عوزاتان نیە. فەرموو)بڵێن: خوا سەرپەرشتیاری ئێمەیەو بێ باوەڕەکان سەرپەرشتیاریان نیە)، ئەبو سوفیان وتی: ئەمڕۆ بە ڕۆژی بەدر، ڕۆژێك لە سەرمانەو ڕۆژێك بۆ ئێمەیە، ڕۆژێك ئافرەت و ڕۆژێك هەڵو، حەنزەلە بە حەنزەلەو فلان و فلان بە فلانەکەس، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (وەك یەك نین، کوژراوەکانی ئێمە زیندون و رزق و رۆزی دەدرێن، بەڵام کوژراوەکانی ئێوە لەئاگردا ئەشکەنجە دەدرێن)

ئەبو سوفیان وتی: بەڕاستی لەو کۆمەڵەدا بەندو ئامۆژگاری هەبوو، ئەگەرچی کەسانێك جگە لە فەرمانڕەواو ناودارەکانمان نەفرەتیان کرد، منیش نە فەرمانم کردو نە بەرگریشم کرد، نە پێم خۆش بوو نە پێم ناخۆش بوو، نە بێزاری کردم و نە دڵخۆش، دەڵێ: روانیان دەبینن حەمزە سکی هەڵدڕاوە، هیند جگەرەکەی دەرهێناوەو پارچە پارچەی کردووە بەڵام ناتوانێت بیخوات، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا هیچی لێ خوارد؟) وتیان: نەخێر. فەرمووی: (خوای گەورە هیچ شتێك لە حەمزە ناخاتە ناو ئاگرەوە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) حەمزەی داناو نوێژی لەسەر کرد و، پیاوێکی ئەنساریشیان هێنا لە تەنیشتی ئەوەوە دایان نا پێغەمبەر نوێژی لەسەر کرد، پاشان بەرز بوویەوەو حەمزەی بەجێ هێشت، ئەو ڕۆژە تاکو حەفتا نوێژی لەسەرحەمزە کرد. بە تەنها ئەحمەد ئەم فەرموودەی هێناوە.

بوخاری دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی موسا لە ئیسرائیلەوە بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە، لە بەڕائەوە، وتی: لەو ڕۆژەدا بت پەرستەکان گەشتن و پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەستەیەك لە تیرهاوێژەکانی دانیشاند و عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە بەرپرسیان، فەرمووی: (ئەگەر بینیتان ئێمە بەسەریاندا سەرکەوتین ئێوە شوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن، وە ئەگەر بینیتان ئەوان بەسەرماندا سەرکەوتن هاوکاریمان مەکەن و شوێنی خۆتان چۆڵ مەکەن) کاتێك پێیان گەشتین هەڵاتن تەنانەت ئافرەتم بینی بەڕاکردن بەرەو شاخەکە دەڕۆشتن و قاچیان بەرز دەکردەوە، تا خڕخاڵەکانیان دەردەکەوت، ئەوەبوو تیرهاوێژەکان دەیان وت: دەسکەوت، دەسکەوت، عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر وتی: پێغەمبەر پەیمانی لێ وەرگرتم کە ئێوە ئێرە چۆڵ نەکەن، بەڵام ئەوان سەرپێچیان کرد، کاتێك سەرپێچیان کرد چاویان لەسەر لاچوو حەفتا کوژراویان لێ کەوتەوە، ئەبو سوفیان چووە شوێنێکی بەرزەوە وتی: ئایا لەناو ئێوەدا موحەممەد هەیە؟ فەرمووی: (وەڵامە مەدەنەوە) وتی: ئایا لەناوتاندا ئیبن ئەبی قەحافە هەیە؟ فەمووی: (وەڵامی مەدەنەوە) وتی: ئایا کوڕی خەتابتان لەناودایە؟ پاشان وتی: بەڕاستی ئەو کەسانە کوژراون، چونکە ئەگەر زیندوبونایە وەڵامیان دەداویەوە. عومەر خۆی پێ نەگیراو وتی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا، خوای گەورە

ئەوانەی بۆ هێشتویەتەوە کە خەفەتت دەدەنێ، ئەبو سوفیان وتی: هوبەل بەرز ڕاگرن، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (وەڵامی بدەنەوە) وتیان: چی بڵێین؟ فەرمووی: (بڵێن: خوا بەرزو بە دەسەڵات ترە) ئەبو سوفیان وتی: ئێمە عوزامان هەیەو ئێوە عوزاتان نییە، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (وەڵامی بدەنەوە) وتیان: چی بڵێین؟ فەرمووی: (بڵێن: خوا سەرپەرشتیاری ئێمەیەو ئێوە سەرپەرشتاریتان نییە). ئەبو سوفیان وتی: ئەمڕۆ بەڕۆژی بەدر، جەنگیش بەنۆرەیە، وە ئێوە پەندێك و سزایەك دەبینن كە نە فەرمانم پێکردووەو نە خراپەشم پێ دەگەیەنێت. لەم ڕووەوە بە تەنها بوخاری هێناویەتی، پاشان ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی خالیدەوە، لە زوهەیری کوڕی معاویەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە، لە بەڕائەوە بەم شێوەیە، پاشتر ساکارتر لەمە باس دەکەین.

بەهەمان شێوە بوخاری دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو ئوسامەوە، لە هیشامی کوڕی عوروەوە، لە باوکیەوە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ، کاتێك لە ڕۆژی جەنگی ئوحودا بت پەرستەکان شتێکیان هێنا، شەیتان هاواری کرد: کام بەندەی خوا دوایەمینتانە، یەکەمیان گەڕایەوە ئەوا جەڵدە لەدوایەمینیان بدە، چاوی بە حوزەیفە کەوت، دەبینێت لەگەڵ یەیمانی باوکیدا شەڕییان دەکرد، وتی: ئەمە چ بەندەیەکی خوایە باوکم باوکم. دەڵێ: عائیشە وتی: سوێند بەخوا نەگەڕانەوە تاکو کوشتیان، حوزەیفەش وتی: خوای گەورە لێتان ببورێت. عوروە وتی: سوێند بەخوا بەردەوام حوزەیفە خێرو چاکەی تێدابوو تا ئەوکاتەی بەخوای کۆی گەیشتەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: یەحیای کوڕی عیبادی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر لە باوکیەوە، لە باپیریەوە کە زوبێری عەوامە بۆی گێڕاینەوە وتی: سوێند بەخوا چاوم لێ بوو دەمڕوانی بۆ خزمەتکارەکانی هیند و هاوڕێکانی بەخێرایی ڕایان دەکرد نە زۆرو نە کەمیان لەگەڵ خۆیان هەڵنەدەگرت، تیرهاوێژەکانیش هاتنە خوارەوە بۆ گۆڕەپانەکە کاتێك بەسەر قوڕەیشەکاندا سەرکەوتین دەیانویست شت کۆ بکەنەوە، ئیتر پشتی ئێمەیان چۆڵ کرد بۆ ئەسپەکان، ئەوان لە دوامانەوە هاتن بۆمان، هاوارکەرێکیش

هاواری کرد: بەڵێ بەڕاستی موحەممەد کوژرا، پاش ئەوەی ئاڵا هەڵگرەکانمان کوژران ئێمە شکاینەوەو ئەوانیش بەسەرماندا شکانەوە تاوای لێهات هیچ کەس لێی نزیك نەدەبویەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: بەردەوام ئاڵای بت پەرستەکان لەسەر زەوی کەوتبوو تاکو عەمرەی کچی عەلقەمەی حارسیە هەڵی گرتەوەو دایەوە بە قورەیش و ئەوانیش بە چواردەوریدا کۆبوونەوە.

سەدی دەڵێ: لە عەبد خەیرەوە وتویەتی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود وتی: من وام نەدەبینی یەك کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دنیایان خۆش بوێت تاکو ئەم ئایەتە لە ڕۆژی ئوحودا هاتە خوارەوە دەربارەی ئێمە ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ﴾. بە شێوازێکی تر لە ئیبن مەسعودەوە ریوایەت کراوە، بەهەمان شێوە لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و ئەبی تەلحەوە ریوایەت کراوە، ئیبن مەردەویەش هەموویانی لە تەفسیرەکەیدا گێراوەتەوە.

پاشان خوای گەورە فەرموی: ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ ئیبن ئیسحاق دەڵێ: قاسمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی رافیع یەکێك لە تیرەی بەنی عودەی بەنی نەجار بۆی گێڕامەوە، وتی: ئەنەسی کوڕی نەزر مامی ئەنەسی کوڕی مالیك رۆشت بۆلای عومەری کوڕی خەتاب و تەڵحەی کوڕی عەبدوڵلا لەگەڵ کۆمەڵێك لە کۆچکردووەکان و پشتیوانەکاندا کە ئەوچەکانەی بەدەستیانەوەبوو دایان نابوو، وتی: چی دەست بەتاڵی کردوون؟ وتیان: کوژرانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)، وتی: ژیانتان بۆ چیە لەدوای ئەوەوە؟ هەستنەوەو بمرن لەسەر ئەو ڕێبازەی ئەو لەسەری مرد، پاشان کۆمەڵەکە هەستانەوەو رویان کردەوە گۆڕەپانی جەنگ و جەنگان تا کوژران (ڕەزای خوای لێ بێت).

بوخاریش دەڵێ: حەسانی کوڕی حەسان بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی تەڵحەوە، لە حەمیدەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، کە مامی واتە ئەنەسی کوڕی نەزر ئامادە نەبوو لە بەدردا، وتی: لەیەکەم جەنگی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) ئامادە نەبووم، ئەگەر خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەشداریم پێ بکات ئەوە خوا دەمبینێت کە من چی دەدۆزمەوە، ئەوەبوو

گەشت بە ڕۆژی ئوحود و بینی موسڵمانان شکستیان خوارد، وتی: خوایەگیان من داوای لێبوردنت لێ دەکەم لەو کارەی ئەوان – واتە موسڵمانەکان – کردیان و، ئەستۆ پاکی و دوری خۆمت بۆ دەردەبڕم لەوەی بت پەرستەکان هێناویانە، ئیتر بە شمشێرەکەیەوە بەرەو پێشەوە ڕۆشت و سەعدی کوڕی موعازی بینی، وتی: بۆ کوێ دەچیت ئەی سەعد؟ وتی: من بۆنی بەهەشت دەکەم لە دامێنی ئوحوددا، پاشان بەرەو پێش ڕۆشت و کوژرا، نەدەناسرایەوە تاکو خوشکێکی ناسیەوە بەسەری پەنجەکانی و بەهۆی خاڵێکەوە، چونکە هەشتاو ئەوەندە جێ تیرو شیرو شمشێری پێوەبوو. ئەمە پوختەی بوخاریە، موسلیم لە فەرمودەی سابت لە ئەنەسەوە بە شێوەی ئەمە ئیخراجی کردوە.

بەهەمان شێوە بوخاری دەڵێ: عەبدان بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو حەمزەوە، لە عوسمانی کوڕی مەوهیبەوە، وتی: پیاوێك هات و حەجی کەعبەی کرد و بینی کۆمەڵێك دانیشتوون، وتیان: ئیبن عومەر ڕۆشت بۆلای و وتی: من دەربارەی شتێك پرسیارت لێدەکەم قسەم بۆ بکە، وتی: پرسیار بکە، وتی: سوێندت دەدەم بە حورمەتی ئەم ماڵە، ئایا ئەوە دەزانیت کە عوسمانی کوڕی عەفان لە ڕۆژی ئوحوددا هەڵاتووە؟ وتی: بەڵێ: وتی :ئەی ئەوە دەزانیت کە لە بەدردا ئامادە نەبوو بەدریشی نەبینی؟ وتی : بەڵێ، وتی: ئەوەش دەزانی لە بەیعەتی ریزوان دواکەوت و ئامادەی نەبوو؟ وتی: بەڵێ، ئەویش (الله اکبر)ی کرد، پاشان ئیبن عومەر وتی: وەرە با هەواڵت پێ بدەم و ئەوەت بۆ رون بکەمەوە کە لە بارەیەوە پرسیارت لێ کردم، سەبارەت بە هەڵاتنی لە ڕۆژی ئوحوددا ئەوە من شاهیدی دەدەم کە خوای گەورە لێی خۆش بوو، سەبارەت بە ئامادەنەبوونی لە بەدردا بەهۆی ئەوەوە بوو خێزانەکەی کە کچی پێغەمبەری خوا بوو نەخۆش بوو، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (تۆ پاداشت و پشکی پیاوێکت هەیە کە بەشداری بەدری کردبێت) سەبارەت بە ئامادە نەبوونیشی لەبەیعەتی ریزوان ئەوە ئەگەر کەسێکی تر جگە لە عوسمان ڕێزدار تر بوایە لەناو مەککەدا پێغەمبەر ئەوی لەبری عوسمان دەنارد، بەیعەتی ریزوانیش دوای ئەوەبوو کە عوسمان ڕۆشت بۆ مەککە، پێغەمبەریش (درودی خوای لێ بێت) بە بەدەستی ڕاستی خۆی فەرموو: (ئەمە دەستی عوسمانە) و دای

بەسەر دەستەکەی تریداو فەرمووی: (ئەمە دەستی عوسمانەو ئێستە لەگەڵ خۆتدا بیبە) پاشان بوخاری لە رویەکی ترەوە لە ئیبن عەوانەوە، لە عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەوهیبەوە گێڕاویەتیەوە.

دواتـر خـوای گـەورە دەفـەرمـوێـت: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ﴾، واتە ئێوە بەهۆی هەڵاتنتانەوە بەرەو شاخەکە چاوتان لەسەر دوژمنەکانتان نەما، حەسەن و قەتادە بە ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ﴾، واتە لە شاخەکە ﴿وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ﴾، خوێندویانەتەوە. واتە ئێوە بەهۆی پەشۆکان و ترس و دڵە ڕاوکێوە لاتان بەلای کەسدا نەدەکردەوە ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِيٓ أُخْرَىٰكُمْ﴾، واتە پێغەمبەرتان لەدوای خۆتانەوە بەجێ هێشت و، ئەویش بانگی دەکردن تاکو لە دوژمن رانەکەن و بگەڕێنەوەو دەست بە جەنگ و ڕوبەڕوبوونەوە بکەنەوە.

سەدی دەڵێت: کاتێك بت پەرستەکان لە ئوحوددا زۆریان بۆ موسڵمانەکان هێناو نارەحەتیان کردن و شکستیان بەسەردا هێنان هەندێکیان رایان کردەوە تاکو گەشتنەوە مەدینە، هەندێکی تریان رۆشتن بەرەو بەردە بەرزەکانی شاخەکەو لەسەر بەردەکان جێگیر بوون، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵکەکەو فەرمووی (وەرنەوە بۆلای من بەندەکانی خوا، وەرنەوە بۆلای من ئەی بەندەکانی خوا) خوای گەورە باسی سەرکەوتنی موسڵمانە هەڵهاتوەکان دەکات بۆ شاخەکەو، باسی بانگ کردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەکـات لـێیـان و، دەفـەرمـوێـت: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِيٓ أُخْرَىٰكُمْ﴾. ئیبن عەباس و قەتادەو ڕەبیع و ئیبن زەید هەر بەمشێوەیان وتووە، عەبدوڵڵای کوڕی زەبعەریش لە چامە شیعریەکدا باسی شکستی موسڵمانەکان دەکات لە ڕۆژی ئوحوددا، لەکاتێکدا کە خۆی موسڵمان نەبووە و لەسەرەتای چامە شیعریەکەیدا دەڵێ:

يـا غُـرابَ الـبَـيْـنِ أَسْـمَـعْـتَ فَـقُـلْ
إِنَّـمـا تَـنْـطِـقُ شَـيـئًـا قَـدْ فُـعِـلْ

إِنَّ لِـلْـخَـيْـرِ ولِـلـشَّـرِّ مَـدًى
وكِـلا ذَلِـكَ وَجْـهٌ وقَـبَـلْ

تا دەگاتە:

لَـيْـتَ أشـيـاخـي بِـبَـدْرٍ شَـهِـدوا
جَـزَعَ الـخـزرج مـن وقـع الأسَـلْ
حـيـن حَـكَّـت بـقُـبـاء بَـرْكَـهـا
واسـتـحَـرّ الـقـتـل في عـبـد الأشلْ
ثـم خَـفّـوا عـنْـدَ ذاكُـم رُقَّـصًـا
رَقْـص الـحَـفّـان يـعـلـو في الـجَـبَـلْ
فـقـتـلـنـا الـضِّـعـف مـن أشـرافـهـم
وعَـدَلْـنـا مَـيْـلَ بَـدْرٍ فـاعـتـدَلْ

الحفان: بێچووی ئاژەڵانە.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لەگەڵ دوانزە هاوەڵیدا تاك كەوتنەوە، وەك ئیمام ئەحمەد دەڵێ: حەسەنی كوڕی موسا بۆی گێڕاینەوە، لە زوهەیرەوە، لە ئەبو ئیسحاقەوە، لە بەڕائی كوڕی عازبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی ئوحوددا عەبدوڵڵای كوڕی جوبەیری كردە سەركردەی تیر هاوێژەكان - كە ژمارەیان پەنجا پیاو بوو -، دەڵی: شوێنی خۆیانی بۆ دیاری كردن و، فەرمووی: (ئەگەر بینیتان باڵندەكان دەمان ڕفێنن شوێنی خۆتان جێ مەهێڵن تاكو دەنێرم بەدواتاندا، وە ئەگەر ئێمەتان بینی بەسەر دوژمندا سەركەوتووین و شكستمان پێ هێناون هەر شوێنی خۆتان چۆڵ مەكەن تاكو دەنێرم بەدواتاندا) دەڵێ: موسڵمانەكان بت پەرستەكانیان شكاند، وتی: سوێند بەخوا ئافرەتانم بینی بەپەلە ڕایان دەكرد بەرەو شاخەكەو كە جل و بەرگەكانیان بەرز دەكردەوە خڕخاڵەكانی قاچیان دەردەكەوتن، هاوەڵانی عەبدوڵڵا وتیان: با بڕۆین دەستكەوت كۆكەینەوە، ئەوە هاوەڵەكانتان سەركەوتنن چاوەڕوانی چی دەكەن؟ عەبدوڵڵای كوڕی جوبەیر وتی: ئایا ئەوەتان لە بیرچوو كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی وتن؟ وتیان: سوێند بەخوا ئێمەش دەچین بۆناو ئەو خەڵكەوە دەسكەوت كۆ دەیكەنەوە. كاتێك چوون بۆناویان چاویان لەسەر بت پەرستەكان لاداو بە

شکست خواردوویی هاتنەوە، ئەمە ئەوەیە کە پێغەمبەر لە دوایانەوە بانگی دەکردن، بەڵام جگە لە دوانزە کەس کەسی تر لەگەڵ پێغەمبەری خوا نەمایەوە، بت پەرستەکان حەفتایان لێ کوشتین، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) و هاوەڵەکانی لە ڕۆژی بەدردا سەدو چلیان لە بت پەرستەکان کوشتبوو، حەفتاشیان لێ بەدیل گرتبوون، ئەبو سوفیان وتی: ئایا لەناو ئەو کۆمەڵەدا موحەممەدی تێدایە؟ سێ جار- دەڵێ: پێغەمبەری ڕێگریان لێکردن وەڵامی بدەنەوە، پاشان وتی: ئایا ئیبن ئەبی قەحافە لەو کۆمەڵەدایە؟ ئایا ئیبن ئەبی قەحافە لەو کۆمەڵەدایە؟ ئایا ئیبن خەتاب لەو کۆمەڵەدایە؟ ئایا ئیبن خەتاب لەو کۆمەڵەدایە؟ پاشان ڕویکردە هاوەڵەکانی و وتی: ئەوانەی ناوم هێنان کوژراون و ئێوە ڕزگارتان بوو لێیان، بەڵام خۆی پێ ڕانەگیراو وتی: سوێند بەخوا درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا، ئەوانەی ژماردتن هەرهەموویان زیندوون، ئەوەی زیانت پێدەگەیەنێت و خەفەتبارت دەکات ماوەتەوە بۆت، ئەبو سوفیان وتی: ئەمڕۆ بە ڕۆژی بەدر، جەنگیش بەنۆرەیە. وە ئێوە لەوقەومە پەند و سزایەك دەبینن کە من فەرمانم پێ نەکردووەو، خراپەشم پێ ناگەیەنێت، پاشان دەستی کرد بە هەڵچون و وتی: هوبەل بەرز ڕاگرن، هوبەل بەرز ڕاگرن، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا وەڵامی نادەنەوە؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێین؟ فەرمووی: (خوای گەورە بەزترو بەدەسەڵات ترە) ئەبو سوفیان وتی: ئێمە عوزامان هەیەو، ئێوە عوزاتان نییە. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا وەڵامی نادەنەوە؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بڵێین چی؟ فەرمووی: (بڵێن: خوای گەورە سەرپەرشتیاری ئێمەیەو ئێوە سەرپەرشتیارتان نییە)

بوخاری لەفەرموودەی زوهەیری کوڕی معاویەوە بە کورتی گێڕاویەتیەوە، هەروەها لە فەرموودەی ئیسرائیل لە ئەبی ئیسحاقەوە بە ساکارتر لەوەی پێشکەمان کرد گێڕاویەتیەوە، خوای گەورە زاناترە.

بەیحەقیش لە (دلائل النبوە)دا لە فەرموودەی عیمارەی کوڕی غەزیەوە، لە ئەبی زوبەیرەوە، لە جابرەوە گێڕاویەتیەوە، دەڵێ: خەڵکەکە لە چواردەوری پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) هەڵاتن لە ڕۆژی ئوحوددا، یانزە پیاو لە

پشتیوانەکانی لەگەڵدا میەوە، لەگەڵ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا کە بەسەر شاخەکەدا سەردەکەوت، بت پەرستەکان پێیان گەشتن، فەرمووی: (ئایا پیاوێك نییە بۆ ئەمانە) تەڵحە وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (تۆ هەروەك خۆت بەو کاری خۆت بکە ئەی تەڵحە) پیاوێك لە پشتیوانەکان وتی: منیش ئەی پێغەمبەری خوا، لەپێناوی پاراستنی پێغەمبەردا جەنگاو، پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵیدا مابونەوە سەرکەوتن، پاشان پشتیوانەکە کوژراو شوێنی پێغەمبەر کەوتنەوە، فەرمووی: (ئایا پیاوێك نیە بۆ ئەمانە) تەڵحە هەمان قسەی پێشووی کردەوەو، پێغەمبەری خواش هەمان شتی پێ وتەوە، پیاوێك لە پشتیوانەکان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر پارێزگاری لێکردن و جەنگاو هاوەڵانیشی سەردەکەوتن، پاشان ئەمیش کوژراو شوێنی پێغەمبەر کەوتنەوە، بەردەوام پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وەك قسەکەی یەکەمجاری دەوتەوەو، تەڵحەش دەیوت: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش رێگەی پێ نەدەداو، پیاوێك لە پشتیوانەکان روخسەتی لێ وەردەگرت بۆ جەنگ کردن، ئەویش مۆڵەتی پێدەدا، ئەو کەسەش وەك ئەوانەی پێش خۆی دەجەنگا، تاوای لێهات جگە لە تەڵحە هیچ کەسێکی لەگەڵدا نەما کە بیان پارێزێت، ئینجا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەمانە خۆی پێشکەش دەکات؟) تەڵحە وتی: من، ئیتر دەستی کرد بە جەنگ و وەك ئەوانەی پێش خۆی جەنگی کرد، پەنجەکانی پێکران، حەسەن دەڵێ: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەگەر بموتایە (بسم الله) و ناوم ببردایە فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوەو خەڵکەکەش سەیریان دەکردیت تاکو دەیانبردیتە نێو کەشی ئاسمانەوە) پاشان پێغەمبەر سەرکەوت بۆلای هاوەڵەکانی و ئەوان هەموویان کۆبوونەوە.

هەوەرها بوخاری لە ئەبی بەکری کوڕی ئەبی شەیبەوە گێڕاویەتیەوە، لە ئیسماعیلەوە، لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە، دەڵێ: دەستی ئەبو تەڵحەم بینی پارچە پارچە بوو بوو پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پارێزگاری لە خۆی پێدەکرد - واتە لە ڕۆژی ئوحوددا.

هەروەها لە هەردوو سەحیحەکەداو لە ئەبی عوسمانی هینیدیەوە دەڵێ (لە

هەندێك لەو ڕۆژانەی پێغەمبەر تیایدا جەنگا کەسی بە چواردەوردا نەمایەوە، جگە لە تەڵحەی کوڕی عەبدوڵڵاو سەعد نەبێت، لە فەرمودەی هەردووکیانەوە).

حەسەنی کوڕی عەرەفەش دەڵێ: مەروانی کوڕی معاویە بۆی گێڕاینەوە، لە هاشمی کوڕی هاشمی زەهریەوە، دەڵێ: بیستم لە سەعیدی کوڕی موسەیب دەیوت: بیستم لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاس دەیوت: تورەکەی.تیرەکانی بۆ دەرهێنام لە ڕۆژی ئوحودداو دەیفەرموو: (تیر بهاوێژە دایك و باوکم بەقوربانت بن) بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدەوە، لە مەروانی کوڕی معاویەوە ئیخراجی کردووە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: ساڵحی کوڕی کەیسان لە هەندێك بنەماڵەی سەعدەوە، لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە بۆی گێڕامەوە، کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە ڕۆژی ئوحوددا لە پێناوی پێغەمبەری خوادا تیری دەهاویشت، سەعد دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) تیر دەداتە دەستم و دەفەرموێت: (تیر بهاوێژە دایك و باوکم بەقوربانت بن) تەنانەت هەندێك تیری بۆ دەردەهێنام و دەیدایە دەستم تاکو بیهاوێژم کە سەریان نەبوو.

هەروەها لە هەردوو سەحیحەکەدا چەسپیوە لە فەرموودەی ئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، لە سعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، وتویەتی: لە ڕۆژی ئوحوددا لەلای ڕاست و لای چەپی پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) دوو پیاوم بینی جل و بەرگی سپییان لەبەردا بوو شەڕیان دەکرد بۆ پاراستنی پێغەمبەر سەختترین شەڕ، کەنە پێش ئەو ڕۆژەو نە لەدوای ئەو ڕۆژەوە شەڕکردنی وام نەبینیوە، واتە جوبرەئیل و میکائیل (سڵاوی خوایان لێ بێت).

حەمادی کوڕی سەلەمەش لە عەلی کوڕی یەزید و سابتەوە، لە ئەنەس کوڕی مالیکەوە دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا تاك کەوتەوە لەگەڵ حەوت کەس لە پشتیوانەکان و، دوو کەس لە قورەیشیەکان، کاتێك پێغەمبەریان شەکەت کرد، فەرمووی: (کێ ئەمانەمان لێ دەگێڕێتە دواوە بەهەشت بۆ ئەو) پیاوێك لە ئەنسارەکان هاتە پێشەوەو، شەڕی کرد تا کوژرا، ئەوە بەردەوام بەو

شێوەیەبوو تاکو هەر حەوتەکەیان کوژران، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بە دوو هاوەڵەکەی فەرموو: (بە ویژدان نەبووین لەگەڵ هاوەڵەکانماندا) موسلیم لە حەدەبەی کوڕی خالیدەوە، لە حەمادی کوڕی سەلەمەوە، بەهەمان شێوەی گێڕاوەتەوە.

ئەبو ئەسوەدیش لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە دەڵێت، وتویەتی: ئوبەی کوڕی خەلەفی سەربە تیرەی جەمع لەکاتێکدا لە مەککەبوو سوێندی خوارد کە پێغەمبەری بکوژێت، کاتێك هەواڵی سوێندەکەی بە پێغەمبەری خوا گەشت (دروودی خوای لێ بێت)، فەرمووی: (بەڵکو من دەیکوژم إن شاء الله) کاتێك ڕۆژی ئوحود رویدا، ئوبەی لە جل و بەرگێکی ئاسنین و دەمامك دارەوە رۆشت بەرەو پێغەمبەرو دەیوت: من رزگارم نەبێت ئەگەر موحەممەد رزگاری ببێت، هێرشی کرد بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) موسعەبی کوڕی عومەیر ڕوبەڕووی بویەوە کە سەر بە تیرەی عەبدولدار بوو، بە نەفسی خۆی پارێزگاری لە پێغەمبەر دەکرد، موسعەبی کوڕی عومەیری کوشت، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ملی ئوبەی کوڕی خەلەفی بینی لە نێوان درزێکەوە لە نێوان خودەکەی سەری و زرێ پۆشەکەیەوە لەو شوێنەوە رمێکی لێداو، لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە بۆسەر زەوی و، خوێن لە شوێنی پێکرانەکەیەوە هیچ خوێنی لێ نەهات، هاوەڵەکانی هاتن هەڵیان گرت لە کاتێکدا دەیبۆڕان وەك بۆڕاندنی گا، پێیان وت: چی تۆقاندویتی تەنها روشانێکە؟ ئەویش باسی قسەکەی پێغەمبەری بۆ کردن کە فەرموو بووی: (بەڵکو من ئوبەی دەکوژم) پاشان وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئەو لێدان و ئازارەی بە منەوەیە بە هەموو خەڵکی (ذي المجاز)ەوە بوایە، هەرهەموویان دەمردن، ئیتر مردو بەرەو ئاگر رۆشت (مسحقا لأصحاب النار) بەهەمان شێوە موسای کوڕی عوقبە لە لە مەغازیەکەیدا، لە زوهەریەوە، لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە بەهەمان شێوەی گێڕاوەتەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاقیش باسی کردووەو، دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) خۆی دامەزراند لە شیوەکەدا، ئوبەی کوڕی خەلەفی بینی کە دەیوت: رزگارم نەبێت ئەگەر تۆ رزگارت ببێت، خەڵکەکە وتیان: ئەی

پێغەمبەری خوا با کەسێك لە ئێمە هێرش بکاتە سەری، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (وازی لێ بێنن) کاتێك نزیك بویەوە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) رمەکەی لە حارسی کوڕی سەممە وەرگرت و، هەندێك لە خەڵکەکە وتیان -لەوەی بۆیان باسکردم - کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) رمەکەی لێ وەرگرت بە رمەکەوە راپەڕی و ئێمەش لە دەوریدا بلاوبوینەوە وەك بڵاوبونەوەی موەکانی وشتر لەکاتی خۆ گەوزاندنیدا،

پاشان پێغەمبەری خوا روبەروی بویەوەو لێدانێك لە گەردنی دا کەچەند جارێك لەسەر ئەسپەکەی هەڵی بەزاندەوە. هەروەها واقیدی لە یونسی کوڕی بەکیرەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە، لە عاسمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، لە باوکیەوە هاوشێوەی ئەمەی گێڕاوەتەوە.

واقیدی دەڵێت: ئیبن عومەر دەیوت: ئوبەی کوڕی خەلەف لە (بطن رابغ) مرد، من بە ناوچەی بەتن رابغدا دەرۆشتم پاش تاریك بونی شەو، ئاگرێکم بینی کڵپەی سەندبوو لێی ترسام، بینیم پیاوێك لێی دێتە دەرەوە بە زنجیرێکەوە کە رایدەکێشا، تینوێتی زۆری بۆ هێنابوو، پیاوێکیش دەیوت: ئاوی مەدەرێ، چونکە ئەمە کوژراوی دەستی پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لێ بێت)، ئەمە ئوبەی کوڕی خەلەفە.

هەروەها لە هەردوو سەحیحەکەدا چەسپاوە کە لە گێڕانەوەی عەبدولرەزاقەوە، لە موعەمەرەوە، لە هەمامی کوڕی مونەبیهەوە، لە ئەبی هورەیرەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (رقوقینی خوا توند بووە لەسەر کۆمەڵێك کە ئەمەیان بەسەر پێغەمبەری خوادا هێناوە - ئەو لەوکاتەدا ئاماژەی بۆ خرێکەی کرد - هەروەها رق و توڕەیی خوا توند بوو، لەسەر پیاوێك کە پێغەمبەری خوا - لەپێناوی خوادا- دەیکوژێت ( بوخاریش بەهەمان شێوە لە فەرموودەی ئیبن جورەیرەوە لە عەمری کوڕی دینارەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە گێڕاویەتیەوە.

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: خرێیەکی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێکراو، ناوچاوی بریندارکرا، لێوی بریندارببوو، ئەو کەسەشی پێغەمبەری بریندار کرد عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاس بوو.

سالحی کوڕی کەیسان بۆی گێڕامەوە، لە گێڕانەوەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە کە وتبووی: هەرگیز سوور نەبووم لەسەر کوشتنی کەسێك هێندەی سووربوونم لەسەر کوشتنی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاس بەوەی ئەوەی کە سەبارەت بەو دەمزانی لە بەدڕەوشتی و بێزاری لەنێو قەومەکەیدا، تەنها ئەو قسەی پێغەمبەریشم بەس بوو سەبارەت بەو کە فەرمووی: (رق و قینی خوا توند و سەخت بوو لەسەر ئەو کەسەی دەموچاوی پێغەمبەری خوێناوی کرد).

عەبدولڕەزاق دەڵێت: موعەممەر لە زوهەریەوە هەواڵی پێداین، لە عوسمانی جزریەوە، لە موقەسسەمەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی ئوحوددا دوعای لە عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاس کرد کە خرێیەکی شکاند و دەموچاوی بریندارکرد، فەرمووی: (ئەی پەروەردگار داوات لێدەکەم ساڵێکی بەسەردا نەیەتەوە تاکو بەکافری دەمرێت) ئەوەبوو ساڵی بەسەردا نەهاتەوە و بەکافری مرد و ڕۆشت بەرەو دۆزەخ - واقیدیش باسی کردووە لە ئیبن ئەبی سبرەوە، لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی فەروەوە، لە ئەبی حوەیرسەوە، لە نافیعی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: گوێم لە پیاوێك لە کۆچەران بوو دەیوت: بەشداری جەنگی بەدرم کردو ڕوانیم دەبینم تیر لە هەموو لایەکەوە دەبارێت و پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) لەناوەڕاستدایە، هیچ یەکێك لەو تیرانە بەری نەدەکەوتن، چاوم بە عەبدوڵلای کوڕی شەهابی زوهەری کەوت لەو ڕۆژەدا دەیوت: موحەممەدم نیشان بدەن، من ڕزگارم نەبێت ئەگەر ئەو ڕزگاری ببێت، پێغەمبەری خواش لە تەنیشتیەوە بوو، هیچ کەس لە گەڵیدا نەبوو، پاشان بەلایدا ڕۆشت و سەفوان سەر زەنشتی کرد لەسەر ئەمەو، وتی: سوێند بەخوا نەمبینیوە سوێندی بەخوا خواردبێت چونکە سوێند خواردن لە ئێمە قەدەغە بوو، چوارکەس بۆی دەرچووین و پەیمان و بەڵێنمان دا لەسەر کوشتنی بەڵام سەرکەوتوو نەبووین بۆ ئەم کارە، واقیدی دەڵێ: ئەوەی لای ئێمە چەسپاوە ئەوەیە کە ئەوکەسەی لەنێو چاوانی پێغەمبەری داو شکاندی ئیبن قەمیئە بوو، ئەوکەسەشی لێوەکانی بریندار کردو خرێکەی شکاند عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاس بوو.

ئەبو داودی تەیالیسی دەڵێت: ئیبن موبارەك بۆی گێڕاینەوە لە ئیسحاقی

کوڕی یەحیای کوڕی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلاوە، لە عیسای کوڕی تەڵحەوە، لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: ئەبوبەکر ئەگەر باسی ڕۆژی ئوحودی بکردایە دەیوت: ئەوە ڕۆژێك بوو هەر هەمووی بۆ تەڵحە بوو، پاشان دەستی کرد بە باسکردن، وتی: من یەکەم کەس بووم لە ڕۆژی ئوحوددا گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت)، پیاوێکم بینی لە پێناوی بەرگریکردن لە پێغەمبەری خوا دەجەنگا - وا دەزانم وتی لەبەر هاوسۆزی - وتی: وتم: ئەو پیاوە تەڵحەبوو کە شتێکم لەدەست چوو هەرگیز ناگەڕێنەوەو زۆر گەورە بوو، وتم: دەبێت پیاوێك بێت لە قەومەکەم بەلای منەوە زۆر خۆشەویست بێت و لەنێوان من و لەنێوان بت پەرستەکاندا پیاوێك هەبوو نەمدەناسی و من لەو نزیکتر بووم لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت)، بەڵام ئەو بەجۆرێك هەنگاوی دەناو دەهات و دەچوو کە من ناتوانم وا بکەم، بینیم ئەو پیاوە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحە، چوینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت)، بەڵام ئەو خرێیەکی شکابوو دەموچاویشی بریندار کرابوو، دوو ئەڵقەش چەقی بوونە نێو ڕومەتیەوەلە ئەڵقەی زرێ پۆشەکە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بڕۆن بەدەم هاوڕێکەتانەوە) مەبەستی تەڵحە بوو کە خوێنی لەبەر دەڕۆشت بەڵام ئێمە لامان بەلای فەرمایشتەکەیدا نەکردەوەو گرنگیمان پێی نەدا، دەڵێ، ڕۆشتم تاکو ئەوەئەڵقەکان لە دەموچاوی دەربهێنم، ئەبو عوبەیدە وتی: سوێندت لەسەر دەخۆم بەو مافەی کە هەمە تاکو وازی لێ بێنیت بۆ من، منیش وازم لێ هێنا، ئەبو عوبەیدە پێی ناخۆش بوو بەدەستی دەری بهێنێت نەوەك ئازاری پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بدات، بەدەمی قەپی پیاکرد و دانەیەکیانی دەرهێنا، لەگەڵ دەرهێنانی ئەڵقەکەدا دانێکی پێشەوەی دەرهات، پاشان ڕۆشتمە پێشەوە تاکو ئەڵقەکەی تر دەربهێنم بەڵام وتی: سوێندت لەسەر دەخۆم بەو مافەی کە هەمە تاکو وازی لێ بێنیت بۆ من، دەڵێ، بەهەمان شێوەی جاری یەکەمی کردەوەو، لەگەڵ ئەڵقەی دووەمدا دانی دووەمیشی کەوت، ئەبو عوبەیدە..(احسن الناس هتما)........، لە ئیش‌وکارو گرفتەکەی پێغەمبەری خوا لێ بوینەوەو چاکمان کرد، پاشان هاتین بۆلای تەڵحە کە لە ناو هەندێك لە

کوژراوەکانابوو، بینیمان حەفتاو ئەوەندە زیاتر یان کەمتر برینی پێوە بوو لە بەرەنجامی بەرکەوتنی لێدانی شمشێرو جێگە تیرو جێگە رم، بینیمان پەنجەی قرتاوە، هەندێك لە حاڵەتەکەیمان چارەسەر کرد.

هەروەها هەیسەمی کوڕی کولەیب و تەبەرانی لە فەرموودەی ئیسحاقی کوڕی یەحیاوە گێڕاویانەتەوە، لە گێڕانەوەی هەیسەمدا ئەبو عوبەیدە وتویەتی: داوات لێ دەکەم لەبەر خوا وازم لێ بێنی ئەی ئەبو بەکر؟ پاشان ئەبو عوبەیدە تیرەکەی بەدەمی دەگرێت و، وردە وردە رایدەکێشێت بۆ دەرەوە نەوەك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ئازاری پێ بگات، پاشان بەدەمی تیرەکە دەردێنێت و لەگەڵ دەرهێنانیدا دانی پێشەوەی ئەبو عوبەیدەش دەردێت، پاشان هەموو فەرموودەکە باس دەکات.

حافز زیائی مەقدیسیش لە کتێبەکەیدا ئەم گێڕانەوەی هەڵبژاردووە، بەڵام عەلی کوڕی مەدینی ئەم فەرموودەیەی لاواز کردووە لەلایەنی ئیسحاقی کوڕی یەحیاوە، ئەمەو یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتان و ئەحمەدو یەحیای کوڕی موعین و بوخاری و ئەبو زەرعەو ئەبوحاتەم و موحەممەدی کوڕی سەعد و نەسائی و جگە لەوانیش قسەیان لەسەر کردووە.

ئیبن وەهابیش دەڵێت: عەمری کوڕی حارس هەواڵی پێدام کە عومەری کوڕی سائب قسەی بۆ کردووە کە مالیکی باوکی ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ کاتێك لە جەنگی بەدردا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بریندار بوو، ئەو برینەکەی مژی تاکو پاکی کردەوەو تاکو سپی کردەوە، پێی وت: ئایا دڵت تێك نەچوو، وتی: نەخێر سوێند بەخوا هەرگیز دڵم تێك ناچێت، پاشان پشتی کردە پێغەمبەرو دەستی کرد بە جەنگ، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس دەیەوێت سەیری پیاوێك بکات لە بەهەشتیەکان با سەیری ئەو پیاوە بکات) پاشان شەهید کرا.

لە هەردوو سەحیحەکەشدا چەسپاوە لە ڕێگەی عەبدولعەزیزی کوڕی حازمەوە، لە باوکیەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، کە دەربارەی برینەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پرسیاری لێ کرا، وتی: دەموچاوی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بریندار بوو، هەروەها خرێیەکی شکاو

سەرە رمێکیش بەرسەری کەوت و بریندارى کرد، فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) خوێنەکەی دەشۆردو عەلیش بە جامێك ئاوی دەکرد بەسەریدا، کاتێك فاتیمە بینی ئاو پیاکردنەکە لە خوێنەکە کەم ناکاتەوە بەڵکو زیادی دەکات، پارچەیەك حەسیری هەڵگرت و سوتاندی تاکو بویە خۆڵەمێش، پاشان خۆڵە مێشەکەی دا لە برینەکەو خوێنەکە گیرسایەوە.

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ﴾ واتە بەخەم و خەفەتێك پاداشتی خەم و خەفەتێکی دانەوە، وەك عەرەب دەڵێت: بەڵاو نارەحەتی دابەزیە سەر فڵانە هۆزو، دابەزیە سەر فڵانە هۆزی تر، ئیبن جەریر دەڵێت: ئەم ئایەتەش بەهەمان شێوەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ﴾ [طه: ٧١]، واتە لەسەر پەلی دارخورما. ئیبن عەباس دەڵێت: خەم و خەفەتی یەکەم بەهۆی شکستەکەوە بوو، لەگەڵ ئەوکاتەی وترا موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) کوژراو، دووەمیان ئەوکاتەبوو بت پەرستەکان سەریان کەوتن لەسەر شاخەکە، پێغەمبەریش (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەی پەروەردگار بۆ ئەوان نییە بەسەر ئێمەدا بەرز ببنەوە) لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفیشە، دەڵێ: خەم و خەفەتی یەکەم بەهۆی شکستەکەوە بوو، دووەمیشیان ئەوکاتەبوو وترا موحەمەد (درودی خوای لێ بێت) کوژرا، چونکە ئەوە لای موسڵمانەکان سەختتر و گەورەتر بوو لە شکستەکە، ئیبن مەردەویە هەردووکیانی گێڕاوەتەوە، لە عومەری کوڕی خەتابیشەوە هاوشێوەی ئەمە گێڕراوەتەوە. هەروەها ئیبن ئەبی حاتەم هاوشێوەی ئەمەی باسکردووە، لە قەتادەوە.

سەدیش دەڵێت: خەم و خەفەتی یەکەم بەهۆی ئەوەوە بوو ئەو هەموو دەسکەوتەو سەرکەوتنەکەیان لەدەست چوو، دووەمیشیان بە بڵندبوون و سەرکەوتنی دوژمنان بەسەریاندا. پێشتریش ئەم قسەیە لە سەدیەوە گێڕرایەوە.

ئیبن جەریر دەڵێت: لە پێشترین قسە لەو قسانە قسەی ئەو کەسەیە کە فەرمووی ﴿فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ﴾ واتە خوای گەورە پاداشتی دانەوە بەهۆی خەم و خەفەتەکەتانەوە ئەی ئیمانداران، کە خوا بێ بەشی کردن لە دەسکەوتی سەروەت و سامانی بت پەرستەکان و لەسەرکەوتن بەسەریاندا، وە بەهۆی ئەو کوشتن و بریندابوونەی بەسەرتاندا هات لەو ڕۆژەدا پاش ئەوەی لە هەموو

ئەمانەدا ئەوەی نیشاندان کە خۆشتان دەویست بەسەرپێچی کردنتان لە فەرمانی پەروەردگارتان و، پێچەوانە ڕەفتار کردنتان لە فەرمانی پێغەمبەرەکەتان (درودی خوای لێ بێت). هەروەها خەم و خەفەتی گومان بردنتان بەوەی کە پێغەمبەرەکەتان کوژراوەو، بالا دەست بوون و سەرکەوتنی دوژمن بەسەرتاندا پاش ئەوەی ئێوە بەسەریاندا سەرکەوتن و زیانتان پێ گەیاندن. کە دەشفەرموێت: ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾، واتە لەسەر ئەو دەسکەوت و سەرکەوتنەی بەسەر دوژمندا بەدەستتان هێنا ﴿وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ﴾ لە بریندار بوون و کوژران، ئیبن عەباس و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و حەسەن و قەتادەو سەدی وایان وتووە. ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەو سوپاس و ستایش بۆ ئەو، جگە لەو هیچ خوداو پەرستراوێك نیە.

﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ
وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ
يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ
أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا
هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ
مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ
عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ
إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾﴾

خوای گەورە منەت دەنێت لە بەندەکانی بەهۆی ئەو ئارامی و ئاسایشەی دایبەزاندە سەریان کە بریتی بوو لەو خەوەنۆچکەی بەسەریاندا هات لەکاتێکدا ئەوان شمشێرەکانیان شل بوو بوو لە دەستیاندا بەهۆی ئەو خەم و خەفەتەی تیایدا بوون، بەلام خەوەنۆچکە و خەوالۆیی لەکاتێکی وەك ئەم کاتەدا بەلگەی ئاسایش و پارێزراویە، وەك خوای گەورە لە سورەتی (الانفال)و لەباسی چیرۆکی بەدردا دەفەرموێت ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ﴾ [الأنفال: ١١] ئیبن

ئەبی حاتەم دەڵێت: ئەبو سەعیدی ئەشەج بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو نەعیمی وەکیعەوە، لە سوفیانەوە، لە عاسمەوە، لە ئەبی زەریفەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە، دەڵێ، خەوە نۆچکە لە جەنگدا لە خواوەیە، بەڵام لە نوێژدا لە شەیتانەوەیە.

بوخاریش دەڵێت: حوزەیفە پێی وتم: یەزیدی کوڕی زەریع بۆی گێڕاینەوە، لە سەعیدی کوڕی قەتادەوە، لە ئەنەسەوە، لە ئەبی تەڵحەوە، وتویەتی: من لەو کەسانە بووم لە ڕۆژی ئوحوددا خەوەنۆچکە بردینیەوە، وای لێهات چەند جارێك شمشێرەکەم لە دەستم کەوتە خوارەوە، دەکەوتە خوارەوەو هەڵم دەگرتەوە، دەکەوتە خوارەوەو هەڵم دەگرتەوە،

بەهەمان شێوە ترمزی و نەسائی و حاکم گێڕاویانەتەوە لە فەرموودەی حەمادی کوڕی سەلەمەوە، لە سابتەوە، لە ئەنەسەوە، لە ئیبن تەڵحەوە، وتویەتی: لە ڕۆژی ئوحوددا سەرم بەرز کردەوەو دەمڕوانی بینیم هیچ کەسێکیان نەبوو لەو ڕۆژەدا کە پێڵوی چاوەکانی نەنیشتبێت لە خەوبردنەوەدا، وتوشیەتی: فەرموودەکە حەسەنی سەحیحە.

بەهەمان شێوە نەسائی گێڕاویەتیەوە لە موحەممەدی کوڕی موسەنناوە، لە خالیدی کوڕی حاریسەوە، لە ئەبی قوتەیبەوە، لە ئیبن عودەیەوە، هەردووکیان لە حەمیدەوە، لە ئەنەسەوە، وتویەتی: ئەبو تەڵحە وتی: من لەو کەسانە بووم خەوە نوچکەیان بەسەردا هات،

بەهەمان شێوە لە زوبەیرو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەدفەرەوە گێڕراوەتەوەو، بەیهەقیش دەڵێت: ئەبو عەبدوڵلای حافز بۆی گێڕاینەوە کە ئەبو حسەین موحەممەدی کوڕی یەعقوب هەواڵی پێداوە کە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی سەقەفی بۆی گێڕاوەتەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موبارەکی مەخزومیەوە، لە یونسی کوڕی موحەممەدەوە، لە شەیبانەوە، لە قەتادەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە ئەبو تەڵحەوە، وتویەتی: خەوە نۆچکە گرتینیەوەو ئێمە لە جێ ریزەکانی خۆماندا بووین لە ڕۆژی ئوحوددا، شمشێرەکەم لە دەستم دەکەوتە خوارەوەو هەڵم دەگرتەوەو، دەکەوتەوە خوارەوەو هەڵم دەگرتەوە، دەڵێ: کۆمەڵەکەی تر کە بریتی بوون لە دووڕووەکان، ئەوان

هیچ خەم و خەفەتێکیان نەبوو جگە لە خۆیان، بەڕاستی ئەوانە ترسنۆکترین و ریسواترین و حەق ژێرخەرترین کۆمەڵن ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ بەڕاستی ئەوان تەنها کەسانی درۆزن و کەسانی گومان و دووڵی دروستکردن بوون سەبارەت بە خوای گەورەو باڵا دەست. ئا بەمشێوەیە بەم زیادەیەو گێڕاویەتیەوە، وەك ئەوەی لە قسەی قەتادە بێت (بە رەحمەت بێت)، ئەوەش بەوشێوەیە کە باسی کرد، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾ واتە ئەهلی ئیمان و یەقین و ئەوانەی پشتیان بەخوا بەهێزو دامەزراوبوو، پشت بەستنی راستگۆیانە ئەوانە دڵنیابوون خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەر دەخات و خواستەکەی بۆ دێنێتەدی، لەبەرئەوە فەرمووی ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ واتە بەهۆی دڵە راوکێ و ترس و لەرزەوە خەو نەیبردنەوە ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت ﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا﴾ [الفتح: ١٢]. تا کۆتایی ئایەتەکە.

بەمشێوەیە دوڕووەکان بڕوایان وابوو کە بت پەرستەکان لەو جێگەو ساتەدا کە سەرکەوتن بەسەر موسڵمانەکاندا ئەوە سەرکەوتنی یەکجارەکی ئەوان و لە بن هاتن و تیاچوونی یەکجارەکی موسڵمانەکان و ئیسلام و شوێنکەوتووەکانیەتی، ئەمە رەفتاری خەڵکانی بەدگومان و دوودڵە،چونکە کاتێك فەرمانێك لە فەرمانە نەخوازراوو خراپەکان روو دەدات ئەوان ئەم گومانە خراپ و ئابڕو بەرانەیان بۆ دروست دەبێت، پاشان خوای گەورە دەربارەیان هەواڵ دەدات کە ئەوان ﴿يَقُولُونَ﴾ لەوکاتەدا ﴿هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ﴾ خوای گەورەش فەرمووی: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾ پاشان خوای گەورە تەفسیری ئەوەی کردووە لەناو ناخیاندا شاردوویانەتەوەو فەرمووی: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ واتە ئەم قسەیەیان لە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەشاردەوە.

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: یەحیای کوڕی عیبادی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبێر بۆی گێڕامەوە، لە باوکیەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێرەوە، وتویەتی: زوبەیر وتی: من خۆمم لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بینیەوە لەکاتێکدا ترس

زۆری بۆ هێنابوین، لەوکاتەدا خوای گەورە خەوەنوچکەیەکی بۆ ناردین، هیچ پیاوێك لە ئێمە نەبوو کە نەچوبێتە سنگیەوەو خەو نەیبردبێتەوە، دەڵێ: سوێند بەخوا من گوێم لە قسەی موعتەبی کوڕی قوشەیر بوو بەڵام ئەوەی گوێم لێی بوو وەك خەو ببینم وابوو، گوێم لێی بوو دەیوت: ئەگەر لە کارەکە ئێمە هیچ بەدەست بوینایە لێرەدا نەدەکوژراین، من ئەمەم لە وەوە لەبەرکرد، دەربارەی ئەمە خوای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ ئەمەش بۆ ڕەخنەلێگرتن و سەرزەنشت کردنیانە. ئیبن ئەبی حاتەم گێڕاویەتیەوە.

دواتر پەروەردگار فەرمووی ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ﴾، واتە ئەمە قەدەرێکەو پەروەردگاری باڵادەست بڕیاری لەسەر داوە، فەرمانێکی بێ چەندوچوونە و کەس ناتوانێت خۆی لێ لابدات و ڕزگاربوون لێی نیە، هەروەها فەرمووی ﴿وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ﴾، واتە تاکو تاقیتان بکاتەوە بەهۆی ئەوەی لێی ڕودان تاکو مرۆڤە پیسەکانتان لە چاکەکانتان جیا بکاتەوەو فەرمان و ڕەفتاری ئیمانداران لە دوڕوەکان جیا بکاتەوە لە گوفتارو کرداردا ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ە واتە بە هەموو ئەو نهێنی و ویژدانەی کە لەناو سینگەکاندا شاراوەتەوە، پاشان فـــەرمــــووی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟﴾ واتە بەهۆی هەندێك تاوانی پێشووتریانەوە، وەك هەندێك لە سەلەف دەڵێن: پاداشتی چاکە ئەوەیە چاکەیەکی بەدوادا بکەیت و پاداشتی خراپەش خراپەیەکە لە دواوەی دەکرێت. پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾ واتە لەو هەڵاتنەی هەڵاتن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ واتە لە تاوانەکان دەبورێت و، داناو بە ئارامە لەگەڵ بە دیهێنراوەکانیداو لێیان خۆش دەبێت، پێشتر باسی ئەو فەرموودەیەی ئیبن عومەرمان کرد سەبارەت بەعوسمان و هەڵاتنی لە ڕۆژی ئوحوددا کە خوای گەورە لێی خۆش بوو لەگەڵ هەموو ئەوانی تردا کە لێیان خۆش بوو بە ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾ [آل عمران: ١٥٢]؛ لێرەدا گونجاوە باسی بکەین.

ئیمام ئەحمەد دەڵێ: معاویەی کوڕی عەمر بۆی گێڕاینەوە، لە زائیدەوە،

لە عاسمەوە، لە شەقیقەوە، دەڵێ: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بە وەلیدی کوڕی عوقبە گەشت، وەلید پێی وت: ئەوە چیە دەتبینم و زبر مامەڵەت لەگەڵ ئەمیری موسڵمانان عوسماندا کردووە، عەبدولڕەحمان پێی وت: پێی رابگەیەنە کە من ڕۆژی حونەین هەڵ نەهاتم- عاسم دەڵێ: دەڵێت ڕۆژی ئوحود- وە لە بەدر دوانەکەوتم، وە سوننەتی عومەریشم واز لێ نەهێناوە، دەڵێ: ئەویش رۆشت و ئەم هەواڵەی دا بە عوسمان، عوسمانیش وتی: ئەوەی کە دەڵێت من لە ڕۆژی حونەیندا هەڵ نەهاتوم، چۆن ئەو من عەیبدار دەکات بە تاوانێك کە خوای گەورە لێی خۆش بووەو، فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾.، ئـــەو قسەیەشی کە دەڵێت من لە ڕۆژی بەدردا مامەوەو دواکەوتم، ئەوە من بەلای روقیەی کچی پێغەمبەری خواوە بووم (درودی خوای لێ بێت) کە ئەو نەخۆش بوو تاکو وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوداش (درودی خوای لێ بێت) لەبری من تیرێکی هاویشت، هەرکەسیش پێغەمبەر لە جیاتی ئەو تیرێك بهاوێژێت ئەوە بەشداری کردووە، ئەو قسەیەشی کە دەڵێت من سوننەتی عومەرم تەرك کردووە ئەوە نەمن دەیزانم و نە ئەو، بڕۆ بۆلای و ئەمەی پێ بڵێ.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾﴾

خوای گەورە لە ئیماندارانی قەدەغە دەکات کە لە بێ باوەڕان بچن لە بیروباوەڕە پوچەکانیاندا، بەڵگەش لەسەر ئەمە قسەکانیانە سەبارەت بە براو هاوەڵەکانیان کە لە جەنگ و روداوەکاندا مردوون، ئەوان بڕوایان وابوو ئەگەر بەشداری جەنگیان نەکردایە نە دەکوژران و شتیان بەسەردا نەدەهات، خوای گـەورە فـەرمـووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾،

واتە دەربارەی براکانیان ﴿إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، واتە ئەگەر بڕۆشتنایە بۆ سەفەرو بازرگانی ﴿أَوۡ كَانُواْ غُزّٗى﴾، واتە ئەوان لە جەنگدا بوون ﴿لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا﴾، واتە لەناو شاردا بونایە ﴿مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ﴾ واتە نە لەسەفەردا دەمردن و، نە لە جەنگیشدا دەکوژران، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ﴾، واتە ئەم بیروباوەڕەی لە ناخیاندا دروست کردووە تاکو زیاتر خەمو خەفەتیان پێ بدات لەسەر مردن و کوشتنی براو هاوەڵەکانیان، پاشان پەروەردگار بەرپەچیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۗ﴾، واتە بەدیهێنان بەدەست ئەوەو گەڕانەوەش بۆلای ئەوە، هیچ کەس نایەتە دنیاو ناژی و هیچ کەس نامرێ بە فەرمان و ویستی ئەو نەبێت، هیچ شتێکیش لە تەمەن زیادوکەم ناکات بە بڕیارو قەدەری ئەو نەبێت ﴿وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوۡ مُتُّمۡ لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ١٥٧﴾ ئەمە ئەوە لەخۆ دەگرێت کە مردن لە پێناوی خواداو کوشتن لەو پێناوەدا هۆکارێکە بۆ بەدەست هێنانی لێبوردن و ڕەزامەندی پەروەردگار، ئەمەش باشترە لەمانەوە لە دنیادا ولەکۆکردنەوەی پاشماوە دوابڕاوو لەناوچوەکانی، پاشان خوای گەورە هەواڵی ئەوەمان پێدەدات کە هەرکەس مرد یان کوژرا ئەوە پاشەڕۆژو گەڕانەوەی بۆلای پەروەردگاری باڵا دەستەو بە کردارەکانی پاداشتی دەداتەوە، ئەگەر چاکەی کردبوو بە چاکەو، ئەگەر خراپەی کردبوو بە خراپە، دەفەرموێت ﴿وَلَئِن مُّتُّمۡ أَوۡ قُتِلۡتُمۡ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحۡشَرُونَ ١٥٨﴾.

﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ١٥٩ إِن يَنصُرۡكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمۡۖ وَإِن يَخۡذُلۡكُمۡ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعۡدِهِۦۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١٦٠ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّۚ وَمَن يَغۡلُلۡ يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ١٦١ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ

﴿(١٦٢) هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ (١٦٣) لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ
عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ
وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ
مُّبِينٍ (١٦٤)﴾

خوای گەورە ڕوو دەکاتە پێغەمبەرەکەی و منەت بەسەر ئەو و ئیمانداراندا دەکات بەوەی دڵی نەرم و ناسك کردووە بۆ ئوممەتەکەی کە شوێنکەوتەی فەرمانەکانی پێغەمبەرن و وازیان لە ئازاردان و ڕەنجاندنی هێناوەو زوویانی پێغەمبەری بۆ شیرین کردوون، ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾ واتە: چ شتێك تۆی بەو شێوەیە نەرمو نیان کردووە بۆ ئەوان ئەگەر ڕەحمەتی پەروەردگار نەبێت بە تۆو بەوانیش، قەتادە دەڵێت ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾، واتە بەڕەحمەتی خوا تۆ نەرمونیان بویت بۆ ئەوان، ئەو (ما) مای (صلە)یە، واتە ئامرازی پەیوەندیە. عەرەب ئەیلکێنێت بە ناسراوێکەوە، وەك خوا دەفەرموێت ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ﴾ [النساء: ١٥٥]، هەروەها بە نەناسراوێکەوە وەك ﴿عَمَّا قَلِيلٍ﴾ [المؤمنون: ٤٠]، بەمشێوەیە لێرەدا فەرمووی: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾، واتە بە هۆی ڕەحمەتی خواوە.

حەسەنی بەسری دەڵێت: ئەمە ڕەوشتی موحەممەد بووە خوای گەورە بەو ڕەوشتەوە ناردوویەتی. ئەم ئایەتە پیرۆزەش هاوشێوەیە لەگەڵ ئەم ئایەتە: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [التوبة: ١٢٨].

ئیمام ئەحمەد دەڵێت: حەیوەت بۆی گێڕاینەوە، لە بەقییەوە، لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە، لە ئەبو ڕاشیدی حوبرانیەوە، وتی: ئەبو ئومامەی باهیلی دەستی گرتم و، وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەستی گرتم و فەرمووی: (ئەی ئەبا ئومامە لەناو ئیمانداراندا کەسی وای تیایە دڵی بۆ من نەرم دەبێت) تەنها ئەحمەد هێناویەتی.

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ﴾ مەبەست لە ﴿غَلِيظَ﴾، لێرەدا قسەی ڕەقە. وەك پاش ئەمە دەفەرموێت

﴿غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ﴾، واتە ئەگەر تۆ قسە ناشیرین بویتایە لەگەڵیان و، دڵت لە بەرامبەریان ڕەق بوایە ئەوە لات نەدەمان و وازیان لێ دەهێنایت، بەڵام خوای گەورە بە چواردەوری تۆدا کۆی کردونەتەوە، نەرمونیانی کردوویت بۆ ئەوان تاکو دڵەکانیان بکەیتە خۆت، وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەڵێت: (من دەبینم سیفاتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە کتێبە پێشینەکاندا ئەوەیە کە قسە ڕەق و،دڵ ڕەق و،تووڕەو جنێودەر نەبووە لە بازاڕەکاندا و بەخراپە وەڵامی خراپەی نەداوەتەوە، بەڵکو بوراوەو چاوپۆشی کردووە).

هەروەها ئەبو ئیسماعیل موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل ترمزی دەڵێ: بیشری کوڕی عوبەیدی دارمی هەواڵی پێداین کە عەمماری کوڕی عەبدولڕەحمان لە مەسعودیەوە، لە ئیبن ئەبی مەلیکەوە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆی گێڕاینەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوای گەورە فەرمانی پێکردوم بە ڕاگرتنی دڵی خەڵکی وەك چۆن فەرمانی پێکردووم بە جێبەجێکردنی فەرزەکان) فەرموودەیەکی غەریبە.

لەبەرئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە ئیش و کارەکاندا ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد، ئەمەش بۆ خۆشکردنی دڵی ئەوان تاکو زیاتر چالاك بن لەو کارانەی بۆ پێغەمبەری دەکەن، بەهەمان شێوەی ڕاوێژکردنەکەیان لە ڕۆژی بەدردا لە ڕۆشتن بۆلای سەرچاوەی بیرەکانی (العیر)، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر بمانبەیتە ناو دەریاوە لەگەڵتا دێین و دەیبڕین، ئەگەر بمانبەیت بۆ (برك الغماد) ئەوە لەگەڵت دێین، ئێمە ئەوەت پێ ناڵێین کە قەومەکەی موسا بە موسایان وت: بڕۆ خۆت و پەروەردگارەکەت بجەنگن، ئێمە لێرەدا دانیشتووین، بەڵکو دەڵێین: بڕۆ ئێمە لەگەڵتداین، لە بەردەستتداین، لەلای ڕاستەوەین، لەلای چەپتەوەین و دەجەنگین.

هەروەها ڕاوێژی پێکردن کە لە کوێدا لابدات، تا ئەوەبوو مونزیری کوڕی عەمری موعنەق لە یموت ئاماژەی بە پێشەوەچوون کرد بۆ بەردەم ئەوان.

سەبارەت بە ئوحودیش ڕاوێژی پێکردن کە ئایا لە مەدینەدا بمێنێتەوە یان بچێتە دەرەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، هەموویان ڕایان وابوو کە بچێتە دەرەوە

ئەویش ڕۆشتە دەرەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، بەهەمان شێوە لە ڕۆژی خەندەقدا لە ڕێکەوتن لەگەڵ ئەحزابدا ڕاوێژی پێکردن بەسێ یەکی بەروبوومی مەدینە لەو ساڵەدا، بەڵام هەردوو سەعدەکە سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادە ناڕازیی بوون، ئەوەشی واز لێ هێنا، بەهەمان شێوە لە ڕۆژی حودەیبیەدا ڕاوێژی پێکردن لەوەی بدات بەسەر نەوەی بت پەرستەکاندا، بەڵام ئەبوبەکری سدیق پێی وت: ئێمە بۆ کوشتنی هیچ کەس نەهاتووین، بەڵکو هاتووین بەمەبەستی عەمرەکردن، پێغەمبەریش بە قسەی ئەبوبەکری کرد.

لە ڕووداوی بوهتانەکەی عائیشەدا (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بیروڕای خۆتانم پێ بڵێن ئەی گرۆی موسڵمانان سەبارەت بە کۆمەڵێك کە من خێزان و ماڵەکەم بونیاد دەنێم و ئەوان روخاندویانە، سوێند بەخوا هیچ خراپەیەکم لە خێزانەکەم نەبینوە ئیتر بەچی بیڕوخێنم و تۆمەتباری بکەم؟ وەڵڵاهی لە چاکە زیاتر هیچی ترم لێ نەبینیوەو هیچ دەربارەی نازانم) پاشان سەبارەت بە جێ نوستنی عائیشە ڕاوێژی بە عەلی و ئوسامە کرد، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە جەنگ و گرفتەکانی تردا ڕاوێژی پێدەکردن، زانایان بیروڕایان جیاوازە لەوەی ئایا ئەم کارە واجب بووە لەسەری یان لە بازنەی سوننەتداو بەمەبەستی پاك کردنەوەی دڵیان و دڵخۆشکردنیان کردوویەتی، هەردوو بیروڕاکە هەیە.

حاکم لە موستەدرەکەکەیدا دەڵێ: ئەبو جەعفەر موحەممەدی کوڕی موحەممەدی بەغدادی هەواڵی پێداین، یەحیای کوڕی ئەیوبی عەلاف لە میسر بۆی گێڕاینەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبی مەریەمەوە، لە سوفیانی کوڕی عوییینەوە، لە عەمری کوڕی دینارەوە، لە ئیبن عەباسەوە سەبارەت بە ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾، وتویەتی: مەبەست ئەبو بەکرو عومەرە (ڕەزای خوایان لێ بێت)، پاشان دەڵێ: سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە، بەهەمان شێوە ئەلکەلبی لە ئەبی سالحەوە، لە ئیبن عەباسەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبوبەکرو عومەر هاتە خوارەوە، چونکە ئەوان حەواری و دوو وەزیرەکەی پێغەمبەری خوا بوون (دروودی خوای لێ بێت)، دووباوکی موسڵمانانیش بوون.

ئیمام ئەحمەدیش ریوایەتی کردووە دەڵێ: وەکیع بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولحەمیدی کوڕی شەهری کوڕی حوشبەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی غەنەمەوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بە ئەبوبەکر و عومەری وتووە: (ئەگەر کۆ بوونەوەمان بۆ راوێژکردنێك کردبێت پێچەوانەی بیوڕای ئێوەم نەکردووە): ئیبن مەردەویەش لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە گێڕاویەتیەوەو دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) کرا سەبارەت بە (العزم)؟ فەرمووی: (راوێژکردنە بە خەڵکانی خاوەن بیروڕاو پاشان بەگوێکردنیان) ئیبن ماجەش وتویەتی: ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبە بۆی گێڕاینەوە، لە یەحیای کوڕی بەکیرەوە، لە شەیبانەوە، لە عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیرەوە، بە ساکارتر لەمە. پاشان ئیبن ماجە وتوویەتی: ئەبوبەرکی کوڕی ئەبی شەیبە بۆی گێڕاینەوە، لە ئەسوەدی کوڕی عامرەوە،لە شورەیکەوە، لە ئەعمەشەوە، لە ئەبی عەمری شەیبانەوە، لە ئیبن مەسعودەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (راوێژکار متمانەپێکراوە) تەنها خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە. هەروەها وتوویەتی: ئەبوبەکر بۆی گێڕاینەوە، لە یەحیای کوڕی زەکەریای کوڕی ئەبی زائیدەو عەلی کوڕی هاشمەوە، لە ئیبن ئەبی لەیلاوە، لە ئەبی زوبەیرەوە، لە جابرەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەگەر یەکێکتان برایەکی راوێژی پێکرد با وەڵامی راوێژ پێکردنەکەی بداتەوەو بیروڕای خۆی پێ بڵێ) بەهەمان شێوە هەرخۆی هێناویەتی.

دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾، واتە کاتێك راوێژی پێکردن و بیروڕای زاناو خاوەن بیروڕاکانت وەرگرت ئیتر پشت بەخوا ببەستەو کارەکەت بکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾ هەروەها ﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ ئەم ئایەتەش وەك ئەو ئایەتەیە کە پێشتر فەرمووی ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾ [آل عمران: ١٢٦]. پاشان فەرمانی پێکردن بە پشت بەستن بە پەروەدگارو فەرمووی ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾.

سەبارەت بە ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَغُلَّ﴾، ئیبن عەباس و موجاهید و حەسەن

و زیاد لە کەسێك دەڵێن: بۆ پێغەمبەر نیە کە خیانەت بکات، ئیبن ئەبی حاتەمیش دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە حوسیبی کوڕی وازیحەوە، لە ئەبو ئسیحاقی فەزاریەوە، لە سوفیانی کوڕی خەسیفەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتویەتی: لە ڕۆژی بەدردا پارچە قوماشێکیان ون کردو وتیان: لەوە دەچێت پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) هەڵی گرتبێت، خوای گەورە ئەمەی نارده خوار ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ واتە خیانەت بکات، ئیبن جەریر دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبی شەوارب بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولواحیدی کوڕی زیادەوە، لە حەسیفەوە،کە ئەم ئایەتە لەسەر پارچە قوماشێکی سور هاتە خوارەوە کە ڕۆژی بەدر دیارنەمابوو، هەندێك لە خەڵکەکە وتیان: دەگونجێت پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بردبێتی، لەمبارەیەوە زیادەڕویان کرد، خوای گەورەش ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾.ی نارده خوارەوە. بەمشێوەیە ئەبو داودو ترمزی هەموویان لە قوتیبەوە، لە عەبدولواحیدی کوڕی زیادەوە گێڕاویانەتەوە، ترمزی وتویەتی: فەرموودەکە حەسەنی غەریبە، هەندێکیشیان لە حەسیفەوە، لە موقسیمەوە بە مورسەلی گێڕاویانەتەوە.

ئیبن مەردەویە لە ڕێگەی ئەبی عەمری کوڕی عەلاوە، لە موجاهیدەوە، لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: دووڕووەکان پێغەمبەریان تۆمەتبارکرد بە بردنی شتێك کە ون بوو بوو، خوای گەورەش ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ی نارده خوارەوە بە شێوازێك زیاتر لە ئیبن عەباسەوە هاوشێوەی ئەوانەی باسکران ریوایەت کراوە، ئەوەش پاك ڕاگرتنی و شایەتیدانی چاکیە بۆ پێغەمبەری خوا کە دوورە لە هەموو جۆرەکانی خیانەت لە جێبەجێکردنی ئەمانەت و دابەشکردنی دەسکەوت و شتەکانی تردا، عەوفی لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ واتە دەسکەوت بەسەر هەندێك لە سریەکاندا دابەش بکات و بەسەر هەندێکی تریاندا دابەشی نەکات، زوحاکیش هەروای وتووە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقیش دەڵێت ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ بەوەی واز لە هەندێك لەو ئایەتانە بێنێت کە خوای گەورە بۆی ناردووە و بە ئوممەتەکەی نەگەیەنێت. حەسەنی بەسری و تاوس و موجاهید و زوحاك بەمشێوەیە خوێندویانەتەوە ﴿وَمَا

﴿كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ بەوەی (زەممە) بخرێتە سەر پیتی (یا) واتە خیانەت بکات.

قەتادەو رەبیعی کوڕی ئەنەسیش دەڵێت: ئەم ئایەتە لە ڕۆژی بەدردا هاتە خوارەوە، لەکاتێکدا هەندێك لە هاوەڵانی شتیان بردبوو (خیانەتیان کردبوو). ئیبن جەریر لە هەردووکیانەوە ریوایەتی کردووە پاشان لە هەندێکیانەوە گێڕاویەتیەوەکە تەفسیری ئەم خوێندنەوەی بەوە کردووە کە: تۆمەتبار کراوە بە خیانەت.

دواتر پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەمەش هەڕەشەیەکی توندو ترساندنێکی دڵنیایە. فەرموودەی پێغەمبەری خواش زۆرن لەمبارەیەوە کە بەرگری لێ دەکەن و خیانەت قەدەغە دەکەن.

ئیمام ئەحمەد دەڵێت: عەبدولمەلیك بۆی گێڕاینەوە، لە زوهەیر واتە ئیبن موحەممەدەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیلەوە، لە عەتای کوڕی یەسارەوە، لە ئەبی مالیکی ئەشبەعیەوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (گەورەترینی خیانەتەکان لای پەروەردگار قۆڵێك لەزەویە، دەبینین دووپیاو دراوسێن لە زەویدا - یاخود لە خانوودا - یەکێکیان لە بەشی دراوسێکەی باڵێك دەبڕێت بۆخۆی، هەرکات بردی ئەوە دەئاڵێتە گەردنی و لە حەوت زەمینەوە گەمارۆی دەدات تا ڕۆژی قیامەت).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: موسای کوڕی داود بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبن لەهیمەوە، لە ئیبن هوبەیرەو حارسی کوڕی یەزیدەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی جوبەیرەوە، وتوویەتی: بیستم لە موستەوریدی کوڕی شەداد دەیوت: بیستم لە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (هەرکەس بە ڕپرسیاری کارێکی بۆ ئێمە گرتە دەست و خانوی نەبوو با خانویەك بکات یان هاوسەری نەبوو با خێزان بهێنێت، یان خزمەتکاری نەبوو با خزمەتکارێك بگرێت، یاخودا ئاژەڵێکی نەبوو با ئاژەڵێك بەرێت، هەرکەسیش لەمانە زیاتری برد ئەوە خیانەت کارە) بەمشێوەیە ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

ئەبو داودیش بەسەنەدێکی ترو لە سیاقێکی تردا گێڕاویەتیەوەو، وتوویەتی: موسای کوڕی مەردانی روقی بۆی گێڕاینەوە، لە مەعافیەوە، لە ئەوزاعیەوە، لە حارسی کوڕی یەزیدەوە، لە جوبەیری کوڕی نەفیرەوە، لە موستەوریدی کوڕی شەدادەوە، دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (هەرکەس بەرپرس بوو بۆ ئێمە با ژنێك بهێنێت، ئەگەر خزمەتکاریشی نەبوو با خزمەتکارێك بەرێت، ئەگەر خانویەکیشی نەبوو با خانویەك بەرێت) دەڵێت: ئەبو بەکر وتی: هەواڵم پێدراوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەرکەس لەمە زیاتری برد ئەوە خیانەتکارە یان دزە).

بەڕێزو مامۆستامان حافزی موزی (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: جەعفەری کوڕی موحەممەدی فریابی لە موسای کوڕی مەردانەوە گێڕاویەتیەوەو، وتوویەتی: لە عەبدولڕەحمانی کوڕی جوبەیرەوە لە بری جوبەیری کوڕی نەفیرەوە، ئەوە هاوشێوەترە لەگەڵ حەق و راستی.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن جەریر دەڵێت: ئەبو کورەیب بۆی گێڕاینەوە، لە حەفیسی کوڕی بیشرەوە، لە یەعقوبی قومیەوە، لە حەفیسی کوڕی حەمیدەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کەسێك لە ئێوە ناناسمەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و مەڕێکی هەڵگرتووە کە دەباعێنێ، هاوار دەکات: ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد، منیش دەڵێم: دەسەڵاتی هیچ شتێکم نییە لای خوا بۆ تۆ، بەڕاستی من ئاگادارم کردیتەوە، کەسێکی تر لە ئێوە ناناسمەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و وشترێکی هەڵگرتووە کە دەبۆڕێنێ، هاوار دەکات: ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد منیش دەڵێم: دەسەڵاتی هیچ شتێکم نیە لای خوا بۆ تۆ، بەڕاستی من ئاگادارم کردیتەوە، کەسێکی تریش لە ئێوە ناناسمەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و ئەسپێکی هەڵگرتووە کە دەحیلێنێت، هاوار دەکات: ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد، منیش دەڵێم: دەسەڵاتی هیچ شتێکم نیە لای خوا بۆتۆ، بەڕاستی من ئاگادارم کردیتەوە، کەسێکی دیکەش لە ئێوە ناناسمەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و پارچە قوماشێك-چەرمێك-ی هەڵگرتووە، هاوار دەکات ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد، منیش دەڵێم: دەسەڵاتی هیچ شتێکم

لای خوا نیە بۆ تۆ، بەڕاستی من ئاگادارم کردیتەوە) هیچ یەکێك لەو شەش کەسەی خاوەنی کتێبەکەن ریوایەتیان نەکردووە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: سوفیان لە زەهریەوە بۆی گێڕاینەوە، گوێی لە عورروە بوە وتوویەتی: ئەبو حەمیدی ساعیدی بۆی گێڕاینەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پیاوێکی سەر بە تیرەی ئەزد کە پێیان دەوت ئیبن لوتبیە کردە بەرپرس بەسەر کۆکردنەوەی زەکاتەوە، کەهاتەوە وتی: ئەمە بۆ ئێوەو ئەوەش بە دیاری دراوە بە من، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) هەستایە سەر مینبەرو فەرمووی: (ئەو بەرپرسە چی لێ قەوماوە دێت و دەڵێت: ئەمە بۆ ئێوەو ئەوەش بە دیاری دراوە بە من. ئایا ئەو لە ماڵی باوك و دایکی دانیشێت و بڕوانێت بزانێت دیاری پێشکەش دەکرێت یان نە؟ سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، هەرکەس لە ئێوە بەشێك یان شتێك لەو زەکاتە هەڵگرێت ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و بەسەر گەردنیەوەیە، ئەگەر وشتر بێت دەبۆڕێنێ، ئەگەر مانگا بێت دەبۆڕێنێ، ئەگەر مەڕ بێت دەباعێنێ) پاشان هەردوو دەستی بەرز کردەوە تاکو بن باڵیمان بینی و پاشان فەرمووی: (خوایەگیان ئایا من گەیاندم) سێ جار فەرمووی.

هیشامی کوڕی عورروە ئەمەی بۆ زیادکرد کە ئەبو حەمید وتویەتی: بەچاوی خۆم بینیم و بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو، پرسیاریش لە زەیدی کوڕی سابت بکەن. لە فەرموودەی سوفیانی کوڕی عوییەنەوە ئیخراجیان کردووە، لای بوخاریش: پرسیار لە زەیدی کوڕی سابت بکەن، بەجۆرێکی تریش لە زوهەریەوە، لە ڕێگەی هیشامی کوڕی عورروەوە گێڕراوەتەوە، هەردووکیشیان لە عورروەوە گێڕاویانەتەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئیسحاقی کوڕی عیسا بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، لەیەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە عورروەی کوڕی زوبەیرەوە، لە ئەبی حەمیدەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (دیاری بەرپرسەکان خیانەتە) ئەم فەرموودەیە لە ئەفرادی ئەحمەدەو، ئیسنادەکەی لاوازە، وەك ئەوەیە کورتکراوەی ئەوەی پێش خۆی بێت، خوای گەورە زاناترە.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو عیسای ترمزی لە کتێبی (الاحکام)دا دەڵێت: ئەبو کورەیب بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو ئوسامەوە، لە داودی کوڕی یەزیدی ئەودیەوە، لە موغەیرەی کوڕی شیبلەوە، لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە، لە موعازی کوڕی جەبەلەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) منی نارد بۆ یەمەن، کاتێك دەستم بە ڕۆشتن کرد ناردیەوە بەدوامداو منیش گەڕامەوە، فەرمووی: (ئایا دەزانیت بۆچی ناردم بەدواتا؟ بەبێ پرسی من هیچ شتێك بۆ خۆت هەڵنەگریت چونکە ئەوە خیانەتە ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ لەبەرئەمە بانگم کردیتەوە ئێستە بڕۆ بۆ کارەکەت) ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبەو بەمشێوەیە نەبێت نەمان بیستووە.

لەهەمان بواردا لە عودەی کوڕی عومەیرەو بورەیدەو مستەوریدی کوڕی شەداد و ئەبی حەمید و ئیبن عومەرەوە هاتووە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی عەلییە بۆی گێڕاینەو، لە ئەبو حەیان یەحیای کوڕی سەعیدی تەیمیەوە، لە ئەبی زەرعەی کوڕی عومەری کوڕی جەریرەوە، لە ئەبی هورەیرەوە، دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لەناوماندا هەستایەوەو باسی (غلول)ی کردو زۆر بە قورسی و گەورەیی باسی کرد، پاشان فەرمووی: (کەسێکتان دەناسمەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و وشترێك بەسەر ملیەوەیەو دەبۆڕێنێ، پیاوەکە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێم: دەسەڵاتی هیچ شتێکم لای پەروەردگار نیە بۆتۆ چونکە من ئاگادارم کردیتەوە، کەسێکی ترتان دەناسمەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و ئەسپێك بەسەر ملیەوەیە دەحیلێنێت، پیاوەکە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێم: دەسەڵاتی هیچ شتێکم لای پەروەردگار نیە بۆ تۆ، چونکە من ئاگادارم کردیتەوە، کەسێکی ترتان دەناسمەوە دێت و لەسەر ملی پارچە چەرمێك هەیە خەریکە دەخنکێت، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێت: دەسەڵاتی هیچ شتێکم لای پەروەردگار نیە بۆ تۆ، بەڕاستی من ئاگادارم کردیتەوە، کەسێکی تریشتان دەناسمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و ئاڵتون یان زیوێك بەسەر ملیەوەیە، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێم: دەسەڵاتی

هیچ شتێکم لای پەروەردگار نیە بۆ تۆ، بەڕاستی ئاگادارم کردیتەوە). لە فەرموودەی ئەبی حەییانەوە ئیخراجیان کردووە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: یەحیای کوڕی سەعید لە ئیسماعیلی کوڕی خالیدەوە بۆی گێڕاینەوە، لە قەیسەوە، لە عودەی کوڕی عەمرەی کەندیەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە هەرکەس لە ئێوە کارێکی بۆ ئێمە کردو دەرزیەك و لەوە زیاتری لە ئێمە شاردەوە، ئەوە خیانەتی کردووەو لە ڕۆژی قیامەتدا بە خیانەتکاری دەیهێنن) دەڵێت: پیاوێك لە پشتیوانەکان هەستایەوە - موجالید دەڵێت: ئەو کەسە سەعیدی کوڕی عوبادە بوو وەك ئەوە وایە لەبەرچاومدا بێت - وتی: کارەکەتم لێ وەربگرەوە. فەرمووی: (من ئێستەش ئەوە دەڵێم، هەرکەسمان کردە بەرپرس بەسەر کارێکەوە با زۆرو کەمی شتەکانمان بۆ بێنێتەوە، ئەوەی پێی دراوە لێی ئەوە وەری گرتووە، ئەوەشی لێی قەدەغە کراوە ئەوە کۆتایی هاتووەو تەواو). هەربەمشێوەیە موسلیم و ئەبو داود لە ڕێگەی ئیسماعیلی کوڕی ئەبی خالیدەوە گێڕاویانەتەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئەبو معاویە لە ئەبی ئیسحاقی فیرازیەوە بۆی گێڕاینەوە، لە جورەیرەوە، لە مەنبوزەوە کە پیاوێکی سەربەهۆزی رافیع بوو، لە فەزلی کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی ئەبی رافیعەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) کاتێك نوێژی عەسری کرد پێم وابێت ڕۆشت بۆلای تیرەی بەنی عەبدول ئەشهەل تاکو قسەیان لەگەڵ بکات تا ڕۆژئاوابوون، ئەبو رافیع دەڵێت: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بە پەلە بۆ نوێژی شێوان دەگەڕایەوە، بە بەقیع دا تێپەڕی، فەرمووی: (ئۆف بۆ تۆ، ئۆف بۆ تۆ) دووجار فەرمووی، ئینجا(الله اکبر)ی لە دەستم کرد منیش خۆم دواخست گومانم برد مەبەستی من بێت، فەرمووی، (ئەوە چیتە؟) بڕۆ، دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا قسەت کرد؟ فەرمووی: (ئەو قسە چی بوو) وتم: ئۆفت لەمن هەڵکێشا، فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو ئەمە گۆڕی فلانە کەسە ناردم بۆلای تیرەی فلان بەدوای زەکاتدا، بەڵام ئەو جلوبەرگێکی یەمەنی بردوەو ئێستە هاوشێوەی ئەو جلوبەرگەی بۆ دوراوە لە دۆزەخدا).

فەرموودەیەکی تر: عەبدوڵلای کوڕی ئیمام ئەحمەد دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی سالمی کوفی مەخلوج کە لە مەککە بوو - بۆی گێڕاینەوە، لە عوبەیدەی کوڕی ئەسوەدەوە، لە قاسمی کوڕی وەلیدەوە، لە ئەبی سادقەوە، لە ڕەبیعی کوڕی ناجیدەوە، لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە، وتی: پێغەمبەری خوا تاڵە مویەکی لە لاتەنیشتی وشترو مەڕێك لێ دەکردەوەو پاشان دەیفەرموو: (مافی من لەمەدا وەك مافی کەسێك لە ئێوەیە، نەکەن هەرگیز خیانەت بکەن و شت ببەن بۆ خۆتان، چونکە خیانەت کردن لە ڕۆژی قیامەتدا سەرشۆڕیە بۆ خاوەنەکەی، دەرزی و دەزویەك و لەوە سەروتر بگێڕنەوە، جیهاد لە پێناوی خوادا بکەن لەگەڵ نزیك و دوور، لەناو شارو لە سەفەردا، چونکە جیهاد دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، بەڕاستی خوای گەورە بەهۆیەوە مرۆڤ لە خەم و خەفەت رزگار دەکات، یاسای خوا جێبەجێ بکەن بەسەر دوورونزیکێکدا،لەبەر قسەو لۆمەی لۆمەکاران فەرمانی خوا مەشکێنن) ئیبن ماجەش هەندێکی لە مەخلوجەوە گێڕاوەتەوە.

فەرموودەیەکی تر: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (دەرزی و بەکرە بگێڕنەوە، چونکە خیانەت ئابڕوچونە بەسەر بکەرەکەیدا لە ڕۆژی قیامەتدا).

فەرموودەیەکی تر: ئەبو داود دەڵێت، عوسمانی کوڕی ئەبی شەیبە بۆی گێڕاینەوە، لە جەریری کوڕی موتریفەوە، لە ئەبی جەهمەوە، لە ئەبو مەسعودی ئەنساریەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکات، پاشان فەرمووی: (بڕۆ ئەی ئەبا مەسعود، بەڵام نەتبینمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بێیت وشترێکی زەکات بەسەر پشتەوە بێت و ببۆڕێنێت، کە بردبێتت بۆ خۆت). وتی: کەواتە ناڕۆم. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کەواتە منیش بەزۆر ناتنێرم) تەنها ئەبو داود هێناویەتی.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو بەکری کوڕی مەردەویە دەڵێت: موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم هەواڵی پێداین، لە موحەممەدی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەبی شەیبەوە، لە عەبدولحەمیدی کوڕی سالحەوە، لە

ئەحمەدی کوڕی ئەبانەوە، لە عەلقەمەی کوڕی مورسەدەوە، لە ئەبی بورەیدەوە، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بەرد فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە حەفتا پایز پیایدا دەڕواتە خوارەوە هێشتا ناگاتە بنەکەی، مرۆڤی خیانەتکاریش دەهێنرێت و لەگەڵ ئەو بەردە فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوەو پاشان پێی دەوترێت: ئەوەی بردوتە بیهێنەرەوە) ئەمە ئەو وتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾.

فەرمودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: هاشمی کوڕی قاسم بۆی گێڕاینەوە، لە عەکرەمەی کوڕی عەمارەوە، لە سەماکی حەنەفی ئەبو زەمیلەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە، لە عومەری کوڕی خەتابەوە، دەڵێت: کاتێك ڕۆژی حونەین رویدا، کۆمەڵێك هاوەڵ هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) و وتیان: فڵانەکەس شەهیدەو فڵانەکەس شەهیدە، تا ناوی پیاوێکیان برد، وتیان: فڵانەکەسیش شەهیدە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (نەخێر من بینیم لە ئاگردابوو بەهۆی عەبایەکەوە کە بردبوی) پاشان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەی کوڕی خەتاب بڕۆ بەناو خەڵکیدا رابگەیەنە کە: جگە لە ئیمانداران هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە) دەڵێت: منیش چومە دەرەوەو بانگم کرد و رامگەیاند کە: جگە لە ئیمانداران هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە. بەهەمان شێوە موسلیم و ترمزی لە فەرمودەی عەکرەمەی کوڕی عەمارەوە گێڕاویانەتەوە، ترمزی دەڵێت: حەسەنی سەحیحە.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن جەریر دەڵێت: سەعیدی کوڕی یەحیای ئەمەوی بۆی گێڕاینەوە، لە باوکیەوە، لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە نافیعی کوڕی ئیبن عومەرەوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) سەعدی کوڕی عوبادەی نارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات و، فەرمووی: ( ئەی سەعد نەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا بێیت و وشترێکت هەڵگرتبێت کە ببۆڕێنێت) سەعد وتی: نەوەری دەگرم و نە دەیهێنم. پێغەمبەریش کارەکەی نەدا بەسەریا. هەروەها لە رێگەی عوبەیدوڵڵای کوڕی نافیعەوە هاوشێوەی ئەمەی گێڕاوەتەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئەحمەد دەڵێت: ئەبو سەعید بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولعەزیزی کوڕی موحەممەدەوە، لە ساڵحی کوڕی موحەممەدی کوڕی زائیدەوە، لەسالمی کوڕی عەبدوڵلاوە کە لەگەڵ موسلیمەی کوڕی عەبدولمەلیك بووە لە خاکی ڕۆم، لە تۆێشوو باری پیاوێکدا شتی دزراوی دۆزیەوە، وتی: پرسیاری لە سالمی کوڕی عەبدوڵلا کردو وتی: ئەبی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (لە بارو توێشووی هەرکەسێکدا شتی دزراوتان دۆزیەوە بیسوتێنن - دەڵێت : وادەزانم وتی: لێی بدەن) دەڵێت: بیفرۆشەو پارەکەی بکە بەخێر.

بەهەمان شێوە عەلی کوڕی مەدینی و ئەبو داود و ترمزی لە فەرموودەی عەبدولعەزیزی کوڕی موحەممەدی ئەتدراوردیەوە گێڕاویەتیەوەو، ئەبو داود و ئەبو ئیسحاقی فیرازیش، زیادەیەکیان بۆ زیاد کردووە، ئەوانیش هەردووکیان لە ئەبو واقیدی لەیسی بچوك ساڵحی کوڕی موحەممەدەوە. عەلی کوڕی مەدینی و بوخاری و جگە لەوانیش وتویانە: ئەمە فەرموودەیەکی مونکەرە (نەناسراوە) لە گێڕانەوەی ئەم ئەبی واقیدەدا، دارقوتنیش دەڵێت: ڕاستەکەی ئەوەیە کە ئەوە بەتەنها فەتوای سالم بووە، ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و هاوەڵە شوێنکەوتووەکانی بڕوایان وایە کار بە ناوەڕۆکی ئەم فەرموودەیە دەکرێت.

ئومەوی لە معاویەی کوڕی ئەبی ئیسحاقەوە، لە یونسی کوڕی عوبەیدەوە، لە حەسەنەوە، دەڵێت: سزای ئەو کەسەی شتی بردووە (خیانەتی کردووە) ئەوەیە بارەکەی دەربکرێت و بەهەموو ئەوەوەی کە تیایدایە بسوتێنرێت. پاشان لە معاویەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە، لە عوسمانی کوڕی عەتاوە، لە باوکیەوە، لە عەلیەوە ریوایەت کراوە کە وتوویەتی: خیانەتکار کۆڵ و بارەکەی کۆدەکرێتەوەو دەسوتێنرێت و خۆیشی شەلاقکاری دەکرێت بەبێ ئەوەی حەدی لەسەر بێت. بەڵام ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی و جمهور پێچەوانەی ئەمە دەڵێن، وتوویانە: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) نوێژی لەسەر خیانەتکار نەکردووەو، شتومەکەکەشی نەسوتاندووە. خوا زاناترە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئەسوەدی کوڕی عامر بۆی

گێڕاینەوە، لە ئیسرائیلەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە، لە جوبەیری کوڕی مالیکەوە، وتی: فەرمانی کرد قورئانەکان بگۆڕڕێن، دەڵێت: ئیبن مەسعود وتی: هەرکەس لە ئێوە دەتوانێت قورئانێك بەرێت با بیبات، چونکە هەرکەس شتێك بەرێت بۆ خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا پێی دەهێنرێتەوە، پاشان وتی: لە دەمی پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) حەفتا سورەتم خوێندۆتەوە، ئایا واز لەوە بێنم کە لە پێغەمبەری خواوە وەرم گرتووە -؟. وەکیعیش لە تەفسیرەکەیدا ریوایەتی کردووە لە شەریکەوە، لە ئیبراهیمی کوڕی موهاجیرەوە، لە ئیبراهیمەوە، وتویەتی: کاتێك فەرمانی کرد بە سوتاندنی قورئانەکان، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئەی خەڵکینە قورئانەکان بەرن بۆ خۆتان، چونکە هەرکەس شتێك بەرێت بۆ خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا بەو شتەوە دێتەوە، باشترین شتی براویش قورئانە کە لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێك لە ئێوەی پێوە بهێنرێت.

ئەبو داود لە سومرەی کوڕی جوندوبەوە دەڵێت، وتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەسکەوتێکی بگرتایە فەرمانی بە بیلال دەکرد تاکو خەڵکەکە بانگ بکات و، ئەوانیش دەسکەوتەکانیان دەهێناو، پێنج یەکی لێ جیا دەکردەوەو پاشان دابەشی دەکرد، ڕۆژێك دوای بانگ کردنەکە پیاوێك گوریسێکی مەیلەو ڕەشی لە موو دروستکراوی هێناو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە ئەو شتەیە کەمن دەستمکەوت لە دەستکەوتەکان، فەرمووی: (ئایا گوێت لە بیلال نەبوو بانگی دەکرد؟) سێ جار وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی چی ڕێگری لێکردیت کە بیهێنیت؟) ئەویش پۆزشی بۆ هێنایەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (نەخێر تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا دەیهێنیتەوە، لەبەرئەوە لێت وەرناگرم).

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَنْ بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾﴾، واتە یەکسان نیە ئەو کەسەی شوێنی ڕەزامەندی خوا دەکەوێت لەو یاسایەی داینـاوەو بەو هۆیەوە شایستەی ڕەزامەندی و پاداشتی خوا دەبێت و لە بەڵاو ئازاری سزاکەشی دەپارێزرێت، لەگەڵ ئەو کەسەی شایستەی رق و قینی خوا دەبێت و پێوەی گرفتار دەبێت و

هەرگیز لێی جیا نابێتەوەو، لە ڕۆژی قیامەتدا شوێن و ڕێی ئاگرەکە خراپترین سەرەنجامە، ئەم ئایەتە هاوشێوەی زۆرە لە قورئانی پیرۆزدا، وەك ئەم ئایەتە: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ﴾ [الرعد: ١٩]، یان: ﴿أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ [القصص: ٦١].

پاشان فەرمووی: ﴿هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ﴾، حەسەنی بەسری و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێن: واتە چاکەکاران و خراپەکاران نمرە نمرەن، ئەبو عوبەیدەو کەسائی دەڵێن: پلە پلەن، واتە جیاوازن لە پلەو نمرەیاندا چ لە بەهەشت و چ لە دۆزەخدا، وەك ئەم ئایەتە دەفەرموێت ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾ [الأنعام: ١٣٢] لەبەرئەمە خوای گەورە فەرمووی ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾، واتە لەسەر کردارەکانیان پاداشتیان دەداتەوە، نەستەمی چاکەیەکیان لێ دەکات و نە خراپەیەکیان بۆ زیاد دەکات، بەڵکو هەرکەس بە کرداری خۆی پاداشتی دەداتەوە.

کە دەشفەرموێت ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾، واتە لە ڕەگەزی خۆیان تاکو بتوانن قسەی لەگەڵدا بکەن و پرسیاری لێ بکەن و لەگەڵیدا دابنیشن و سوودی لێ وەربگرن.

وەك لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا﴾ [الروم: ٢١]، واتە لە ڕەگەزی خۆتان، هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ [الكهف: ١١٠]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ﴾ [الفرقان: ٢٠]. یان دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ﴾ [یوسف: ١٠٩]، یان دەفەرموێت: ﴿يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ﴾ [الأنعام: ١٣٠] ئەمە ئەوپەڕی منەتنانی پاروەردگارە لەسەر بەندەکانی کە هەر لە خۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون بەجۆرێك دەتوانن قسەی لەگەڵدا بکەن و لە قسەکانیاندا بگەڕێنەوە بۆلای ئەو، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی ﴿يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾، واتە قورئان ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾، واتە فەرمانیان پێدەکات بە چاکەو بەرگریان لێ دەکات لە خراپە تاکو دەروونەکانیان پاك ببێتەوەو پیس و پۆخڵی پێوە نەمێنێت کە لەکاتی

نەفامی و بت پەرستیاندا پێوەیان نوسابوو ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾، واتە قورئان و سوننەت ﴿وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ﴾ واتە لەپێش ئەم پێغەمبەرەوە ﴿لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ واتە لەنێو نەفامی و گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون بۆ هەموو کەسێك.

﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ
عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى
ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ
تَعَالَوْا۟ قَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ۗ هُمْ
لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى
قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُوا۟ لَوْ
أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا۟ ۗ قُلْ فَٱدْرَءُوا۟ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ بریتییە لەو کارەساتەی لە ڕۆژی ئوحوددا بەسەریاندا هات و حەفتا کەسیان لێ کوژرا ﴿قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا﴾ واتە ڕۆژی بەدر، ئەوە بوو حەفتا کەسیان لە بت پەرستەکان کوشت و، حەفتای تریان لێ بەدیل گرتن، ﴿قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا﴾ واتە لە کوێوە ئەمەمان بەسەردا هات ﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ﴾. ئیبن حاتەم دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو بەکری کوڕی ئەبو شەیبەوە، لە قورادی کوڕی نوحەوە، لە عەکرەمەی کوڕی عەممارەوە، لە سەماکی حەنەفی ئەبو زەمیلەوە، لە ئیبن عەباسەوە، لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: کاتێك ڕۆژی ئوحود رویدا لە ساڵی ئایندەدا، سزادران بەهۆی وەرگرتنی سەرانەوە لە بەدیل گیراوەکان و، بەوهۆیەوە حەفتایان لێ کوژراو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) دەوری پێغەمبەریان چۆڵ کرد و رایان کرد، خرێیەکی شکاو،سەرە رمێك بەر سەری کەوت و شکاندی و خوێن بەسەر دەموچاویدا هاتە خوارەوە، خوای گەورە ئەمەی نارده خوارەوە ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ

﴿هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ﴾ بەهۆی وەرگرتنی سەرانەوە لە بەدیل گیراوەکان. بەمشێوەیە ئیمام ئەحمەد لە عەبدولڕەحمانی کوڕی غەزوانەوە کە قورادی کوڕی نوحەوە بە ئیسنادی خۆی بەڵام درێژتر لەمە گێڕاویەتیەوە، حەسەنی بەسریش بەهەمان شێوەی وتووە.

ئیبن جەریریش دەڵێت: قاسم بۆی گێڕاینەوە، لە حسەینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەلییەوە، لە ئیبن عەونەوە، سونەید دەڵێت کە بریتیە لە حسەین: حەجاج لە جورەیرەوە بۆی گێڕامەوە، لە موحەممەدی کوڕی عوبەیدەوە، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: جوبرەئیل هات بۆلای پێغەمبەرو، وتی: ئەی موحەممەد خوای گەورە ئەوەی پێ ناخۆش بوو کە قەومەکەت کردیان بە وەرگرتنی سەرانە لە دیلەکان، لە کاتێکدا خوا فەرمانی پێکردیت لە نێوان دوو شتدا سەرپشکیان بکەیت: یان ئەوەی بێنە پێشەوەو لە گەردنیان بدەیت، یان ئەوەی سەرانەیان لێ وەربگیرێت لەسەرئەوەی هێندەی ژمارەی خۆیان لێ بکوژن، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بانگی خەڵکەکەی کردو ئەمەی بۆ باسکردن، ئەوانیش وتیان: ئەوانە عەشیرەت و برامانن ئایا سەرانەکەیان وەرنەگرین و بە وسەرانەیە خۆمان بەهێز بکەین بۆ جەنگی دوژمنەکەمان، هێزو توانای ئەوان بێت بۆ لای ئێمە، لەمەدا شتێکی تێدا نیە ئێمە پێمان ناخۆش بێت؟ وتی: لە ڕۆژی ئوحوددا حەفتا پیاویان لێ کوژرا، هێندەی ژمارەی بەدیل گیراوەکانی بەدر، بەمشێوەیە نەسائی و ترمزی لە فەرموودەی ئەبو داودی حەمزیەوە لە یەحیای کوڕی زەکەریاوە، لە ئەبی زائدەوە، لە سوفیانی کوڕی سەعیدەوە، لە هیشامی کوڕی حەسانەوە،لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە گێڕاویەتیەوە، پاشان ترمزی وتویەتی: فەرموودەکە حەسەنی غەریبە، نایناسین تەنها لە ڕێگەی فەرموودەی ئیبن ئەبی زائیدەوە نەبێت، ئەبو ئوسامەش لە هیشامەوە هاوشێوەی ئەمەی گێڕاوەتەوەو، ئیبن سیرینیش لە عوبەیدەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) بە مورسەلی گێڕاویەتیەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و ئیبن جورەیج و ڕەبیع و سەدی وتویانە ﴿قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ﴾ واتە بەهۆی سەرپێچیتانەوە بۆ پێغەمبەری خوا

(درودی خوای لێ بێت) کاتێك فەرمانی پێکردن شوێنەکانی خۆتان جێ مەهێڵن بەڵام ئێوە سەرپێچیتان کرد، مەبەستی تیرهاوێژەکانە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، واتە هەرچیەکی بوێت دەیکات و ئەو فەرمانە دەدات کە دەیەوێت و هیچ هێزێك لەبەردەم فەرمانی ئەودا خۆی راناگرێت و ناتوانێت رەخنەی لێ بگرێت. دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾، واتە راکردنتان لە بەردەستی دوژمنەکەتانداو کوژرانی کۆمەڵێکتان و بریندارکربوونی کۆمەڵێکی ترتان لەلای ئەوانەوە، هەمووی بە بڕیاری پەروەردگارو قەدەری ئەو بوو، لەمەشدا حیکمەت و دانایی هەیە ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە ئەوانەی ئارامیان گرت و دامەزراوبوون و نەلەرزین ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ﴾ مەبەستی لەمە کۆمەڵەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە ئەوانەی لەکاتی رۆشتن بەرەو ئوحوددا گەڕانەوەو پاشەکشەیان کرد، کۆمەڵێکیش لە ئیمانداران شوێنیان کەوتن تاکو هانیان بدەن لەسەر گەڕانەوەو جەنگ کردن و هاوکاریکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)، لەبەرئەمە دەفەرموێت ﴿أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ﴾ ئیبن عەباس و عەکرەمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زوحاك و ئەبو سالح و حەسەن و سەدی دەڵێن: واتە ژمارەی موسڵمانان زۆر بکەن، حەسەنی کوڕی سالحیش دەڵێت: واتە بە دوعا بەرەنگاربینەوە، جگە لەوان دەڵێن: پەیوەندی بکەنەوە بە موسڵمانانەوەو جیا مەبنەوە، بەڵام ئەوان بیانویان بەوە هێنایەوە وتیان ﴿لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ﴾، موجاهید دەڵێت: مەبەستیان ئەوەبوو کە ئەگەر بمانزانیایە جەنگ دەکەن لەگەڵتان دەهاتین، بەڵام ئێوە روبەڕووی جەنگ نابنەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: موحەممەدی کوڕی موسلیمی کوڕی شەهای زوهەری و موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی جەببان و عاسمی کوڕی قەتادەو حەسینی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعازو، زانایانی تری جگە لەوان بۆیان گێڕاوینەتەوە، هەموویان وتوویانە: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بەهەزار پیاو لە هاوەڵانیەوە هاتە ناومان لەوکاتەی دەرچوو بەرەو ئوحود، رۆشت تا گەشتە (الشوط) لە نێوان ئوحود و

مەدینەدا، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بە سێیەکی خەڵکەکەوە لێی جیابوویەوەو لایداو، وتی: موحەممەد بەگوێی ئەوانی کرد و سەرپێچی لەمن کرد، ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا نازانین لەسەر چی ئێمە لێرەدا خۆمان بەکوشت بدەین؟ ئیتر خۆی و ئەو کۆمەڵەی شوێنی کەوتن لە قەومەکەی لە دووڕووەکان و خاوەن گومانەکان، گەڕانەوە، عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرامی سەر بە تیرەی بەنی سەلەمە شوێنیان کەوت و، دەیوت: ئەی قەوم، خواتان بیر دەخەمەوە، پێغەمبەرەکەتان و قەومەکەتان سەرشۆڕ مەکەن کاتێك ڕوبەڕووی دوژمنەکەتان دەبێتەوە، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە ئێوە جەنگ دەکەن رادەستمان نەدەکردن، بەڵام نازانین ئایا جەنگ دەبێت یان نابێت، کاتێك سەرپێچی عەبدوڵلای کوڕی عەمریان کردو سوربون لەسەر دابڕان و جیابوونەوە لە موسڵمانان، وتی: خوای گەورە دوورتان بخاتەوە ئەی دوژمنانی خوا بەڕاستی خوای گەورە هیچ پێویستی بە ئێوە نیە، ئیتر پێغەمبەری خوا رۆشت بەرەو ئوحود.

لە دوای ئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ بەڵگەیان بەمە هێناوەتەوە وەك هۆکارێك بۆ ئەوەی بارودۆخ مرۆڤ ئاڵوگۆڕ پێدەکات و وەری دەگێڕێت، دەگونجێت لە بارێکدا لە بێ باوەڕیەوە نزیکتربێت و، لە بارێکی تردا لە ئیمانەوە، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ پاشان پەروەردگار فەرمووی: ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ واتە ئەوان قسەیەك دەکەن بڕوایان بەڕاستی ئەو قسە نیە، ئەمەش لەو قسانەی ئەوانە ﴿لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّاتَّبَعْنَاكُمْ﴾ ئەوان زۆر دڵنیابوون لەوەی ژمارەیەکی زۆر سەربازی بت پەرستەکان لە وڵاتێکی دورەوە هاتوون و دڵگەرمن بۆ جەنگی موسڵمانەکان بەهۆی ئەو کارەسات و بەدیل گرتنەی لە بەدردا بەسەریاندا هات، لەکاتێکدا ئەوان چەند قاتی موسڵمانەکان بوو، کەواتە بەدڵنیاییەوە لە نێوانیاندا جەنگ دەبێت، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾. دوای ئەوە فەرمووی: ﴿الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾، واتە ئەگەر گوێیان بگرتایە بۆ راوێژەکەی ئێمە کە پێمان وتن لە مەدینە مەچنە دەرەوە ئەوە نەدەکوژران لەگەڵ ئەوانەدا کە کوژران،

بـەڵام خـوای گـەورە فـەرمـووی ﴿قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، واتە ئەگەر دانیشتن مرۆڤ دەپارێزێت لە کوشتن و مردن، کەواتە پێویستە ئێوە نەمرن، بەڵام بە دڵنیاییەوە مردن دێت بۆلاتان ئەگەر لە بورجی توندو تۆڵ و بەرزو سەختیشدا بن، کەواتە ئەگەر ڕاست دەکەن مردن لە خۆتان لابدەن و مەیەڵن بمرن. موجاهید لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هاتە خوارەوە.

﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ
(١٦٩) فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِم
مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (١٧٠) يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ
مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ (١٧١) الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ
وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ
عَظِيمٌ (١٧٢) الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ
فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١٧٣) فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ
مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ
عَظِيمٍ (١٧٤) إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن
كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (١٧٥)﴾

خوای گەورە سەبارەت بە شەهیدەکان هەواڵ دەدات بەوەی ئەگەر چی ئەوان لەم دینایەدا کوژروان، بەڵام گیانەکانیان زیندوە و ڕزق و ڕۆزی دەدرێن لە ماڵی ئارامگرتن دا، موحەممەدی کوڕی جەریر دەڵێت: موحەممەدی کوڕی مەرزوق بۆی گێڕاینەوە، لە عەمری کوڕی یونسەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن ئیسحاقی کوڕی ئەبی تەڵحەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە سەبارەت بەو هاوەڵانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ناردی بۆ خەڵکی بیری (معونە)، وتی: نازانم چل یان حەفتا بوون، لەسەر ئاوەکەش عامری کوڕی توفەیلی جەعفەری هەبوو واتە ئەو خاوەنی بوو یان

سەرپەرشتیاری دەکرد، ئەو کۆمەڵە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ڕۆشتن تاکو گەشتنە ئەشکەوتێك کە دەیڕوانی بەسەر ئاوەکەداو لەوێدا دانیشتن، پاشان هەندێکیان بە هەندێکی تریان وت: کێتان نامەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەگەیەنێت بە خەڵکانی سەر ئەو ئاوە؟ وادەزانم میلحانی ئەنساری بوو کە وتی: من نامەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەگەیەنم، ڕۆشت تا گەشتە گوندێکیان و لەبەردەم ماڵەکاندا خۆی حەشاردا، پاشان وتی: ئەی خەڵکی بیری میعوەنە، من نێراوی پێغەمبەری خوام بۆلای ئێوە، من شاهیدی دەدەم کە جگە لەخوا هیچ خوایەکی تر نییەو، موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، بڕوا بهێنن بە خوداو پێغەمبەرەکەی، پیاوێك لە دەرگای ماڵێکەوە بە ڕمێکەوە بۆی ڕۆشتە دەرەوە و دای لە کەلەکەی و لەولایەوە ڕۆشتە دەرەوە، ئەویش وتی: ألله اکبر، سوێند بەخوای کە عبە بردمەوە، شوێنی جێ پێکانی کەوتن تاکو گەشتنە لای هاوەڵەکانی لە ئەشکەوتەکەداو هەرهەموویان کوشتن، دەڵێ، ئیسحاق وتی: ئەنەسی کوڕی مالیك بۆی گێڕامەوە کە خوای گەورە قورئانی سەبارەت بەوان نارده خوارەوە: (لە جیاتی ئێمە بە قەومەکەمان رابگەیەن کە ئێمە بەخوای خۆمان گەشتین و ئەو لە ئێمە رازی بوو ئێمەش لەو رازی بووین) پاشان (نەسخ) بویەوەو بەرز کرایەوە دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك ئێمە دەمانخوێند، وەخوای گەورە ئەمەی نارده خوارەوە ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾﴾.

موسلیم لە سەحیحەکەیدا دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی نومەیر بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو معاویەوە، لە ئەعمەشەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی مورەوە، لە مەسروقەوە، وتی: دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾﴾ پرسیارمان لە عەبدوڵلا کرد، وتی: بەڕاستی ئێمەش سەبارەت بەمە پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا کرد (دروودی خوای لێ بێت) و ئەویش فەرمووی: (ڕۆحەکانیان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە، کە چرای هەڵواسراوی هەیە بە عەرشەوە، هەرکات ویستی بە بەهەشتدا هاتوچۆ دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئەو چرایانە، خوای گەورەپرسیاری لێکردن و فەرمووی: ئایا حەز لە هیچ شتێك ناکەن؟ وتیان:

حەز لە چ شتێك بکەین لەکاتێکدا ئێمە لە بەهەشتدا بە ئارەزووی خۆمان دێین و دەچین؟ سێ جار خوای گەورە ئەمەی فەرموون، کاتێك بینیان وازیان لێ ناهێنرێت تاکو داوای شتێك نەکەن، وتیان: ئەی پەروەردگار دەمانەوێت ڕۆحەکانمان بگێڕیتەوە بۆناو جەستەکانمان تاکو جارێکی تر لە پێناوی تۆدا بکوژرێینەوە، کاتێك خوای گەورە بینی هیچ پێداویستیەکیان نیە، وازی لێ هێنان). هاوشێوەی ئەمە لە فەرموودەی ئەنەس و ئەبو سەعیدەوە ریوایەت کراوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: عەبدولسەمەد بۆی گێڕاینەوە، لە حەممادەوە، لە سابتەوە، لە ئەنەسەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هیچ نەفسێك نیە کە بمرێت و لای پەروەردگاری چاکەی بۆ ئامادە کرابێت و پێی خۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ دنیا تەنها شەهید نەبێت، چونکە شەهید پێی خۆشە بگەڕێتەوە بۆ دنیا تاکو جارێکی تر بکوژرێتەوە بەهۆی ئەو پلە بەرزەی شەهیدیەوە کە بینویەتی) بەتەنها موسلیم هێناویەتی لە ڕێگەی حەممادەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: عەلی کوڕی عەبدوڵڵای مەدینی بۆی گێڕاینەوە، لە سوفیانی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ڕەبیعەی سلمیەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیلەوە، لە جابرەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووم: (ئایا زانیوتە خوای گەورە باوکتی زیندو کردەوەو، پێی فەرموو: ئاواتی شتێك بخوازە تا بۆت بکەم، ئەویش پێی وت: بمگێڕەرەوە بۆ دنیا تاکو جارێکی تر بکوژرێمەوە، فەرمووی: من بڕیاری ئەوەم یەکلایی کردۆتەوە کە مرۆڤەکان بۆدنیا ناگەڕێنەوە). لەم ڕووەوە بە تەنها ئەحمەد هێناویەتی، هەروەها لە هەردوو سەحیحەکەو جگە لەوانیشدا چەسپاوە کە: ئەبا جابر کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامی ئەنساریە (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە ڕۆژی ئوحوددا بە شەهیدی کوژرا، بوخاری دەڵێت: هەروەها ئەبو وەلید لە شوعبەوە، لە ئیبن مونکەدیرەوە دەڵێت: گوێم لە جابر بوو لەکاتێکدا باوکم کوژرا وتی: دەستم کرد بە گریان و جل و بەرگەکەم لەسەر دەموچاوی لابرد، هاوەڵانی پێغەمبەری

خوا ڕێگریان لێ دەکردم، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕێگری لێ نەکردم، و فەرمووی: (مەگری بۆی یان بۆچی بۆی دەگریت، بەردەوام فریشتە بە باڵەکانی سێبەری بۆ کردبوو تاکو بەرز بوویەوە) ئەو و موسلیم و نەسائی لە ڕێگەیەکی ترەوە، لە شوعبەوە، لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە ئیسنادیان کردووە لە جابرەوە کە دەڵێت: کاتێك باوکم لە ڕۆژی ئوحوددا کوژرا، جل و بەرگەکەم لەسەر دەموچاوی لادەبردو دەگریام، هەمووی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی پێشوو.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: یەعقوب بۆی گێڕاینەوە، لە باوکمەوە، لە ئیبن ئیسحاقەوە، لە ئسیماعیلی کوڕی ئومەییەی کوڕی عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبی زوبێری مەکیەوە، لە ئیبن عەباسەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (کاتێك براکانتان لە ئوحوددا شەهید بوون، خوای گەورە ڕۆحەکانیانی خستە نێو سکی باڵندەیەکی سەوزەوە، بەسەر ڕووبارەکانی بەهەشتدا دەگەڕان، لە بەرووبومەکانیان دەخوارد و، دەڕۆشتن بۆلای کۆمەڵە چرایەکی ئاڵتونی لەژێر سێبەری عەرشدا، کاتێك خۆشی و پاکی خواردن و خواردنەوەکانی خۆیان بینی، کاتێك شوێن و ڕێی خۆشی و پاکی خۆیان بینی، وتیان: خۆزگایە براکانمان دەیانزانی کە خوای گەورە چی بۆ ئێمە کردووە تاکو کەمتەرخەمیان لە جیهاددا نەکردایەو لە جەنگ خۆیان لانەدایە، خوای گەورە فەرمووی: من لە جیاتی ئێوە ئەمەیان پێدەگەیەنم، ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾﴾ و ئایەتەکانی دواتر. ئەحمەد بەمشێوەیە ڕیوایەتی کردووە.

بەهەمان شێوە ئیبن جەریر لە یونسەوە، لە ئیبن وەهەبەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە ڕیوایەتی کردووە، ئەبو داود و، حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا لە فەرموودەی عەبدوڵلای کوڕی ئیدریسەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی ئومەییەوە، لە ئەبی زوبەیرەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە. ئەمە سەلمێنراوترە.

بەهەمان شێوە سوفیانی سەوری لە سالمی ئەفتەسەوە، لە سەعیدی کوڕی

جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە گێڕاویەتیەوە. حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا لە فەرموودەی ئەبی ئیسحاقی فەزاریەوە، لە سوفیانەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبی خالیدەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەو، لە ئیبن عەباسەوە وتویەتی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾﴾ لەسەر حەمزەو هاوەڵەکانی هاتە خوارەوە.، پاشان وتی: فەرموودەکە سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە، بەهەمان شێوە قەتادەو رەبیع و زوحاك وتویانە: ئەم ئایەتە سەبارەت بە کوژراوەکانی ئوحود هاتە خوارەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە، لە هارونی کوڕی سولەیمانەوە، لە عەلی کوڕی عەبدوڵڵای مەدینیەوە، لە موسای کوڕی ئیبراهیمی نوری کەسیری کوڕی بەشیری کوڕی فاکیهەی ئەنساریەوە، دەڵێت: گوێم لە تەڵحەی کوڕی خەراشی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی خەراسی کوڕی سیمەی ئەنساری بوو وتی: بیستم لە جابری کوڕی عەبدوڵلا وتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بۆی روانیم و فەرمووی: (ئەی جابرە ئەوە چیە دەتبینم بێتاقەت و جەنجال دیاری؟) دەڵێت: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم شەهید بووەو قەرزو ماڵ و منالێکی زۆری بەجێهێشتووە. پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا هەواڵت پێ بدەم کە خوای گەورە قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردووە لە پشتی پەردەوە نەبێت، بەڵام ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ باوکتدا کرد، عەلی دەڵێت مەبەستی روبەڕووە. پاشان خوای گەورە فەرمووی: داوام لێ بکە پێت دەبەخشم، باوکیشت وتی: داوات لێ دەکەم کە بگەڕێنریمەوە بۆ دنیا تاکو جارێکی تر تیایدا بکوژرێمەوە، خوای گەورە فەرمووی: (پێشتر قسەم لەسەر ئەوە کردووە، کە مرۆڤەکان جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ دنیا، وتی: کەواتە ئەی پەروەردگاری من لە پاش منەوە ئەمە بگەیەنە، خوای گەورەش ئەمەی نارده خوارەوە ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًا﴾ هەموو ئایەتەکە).

پاشان لە رێگەیەکی ترەوە گێڕاویەتیەوە لە موحەممەدی کوڕی سولەیمانی کوڕی سەلیتی ئەنساریەوە، لە باوکیەوە، لە جابرەوە، بەهەمان شێوە. هەروەها

بەیهەقیش لە (دلائل النبوە)دا لە ڕێگەی عەلی کوڕی مەدینیەوە گێڕاویەتیەوە. هەر بەیهەقی لە فەرموودەی ئەبو عوبادەی ئەنساریەوە کە عیسای کوڕی عەبدولڕەحمانە - إنشاءالله - لە زوهەریەوە، لە عورووەوە، لە عائیشەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بە جابری فەرموو: (ئەی جابر ئایا مژدەت پێبدەم؟) وتی: بەڵێ، خوای گەورە مژدەی خێرت پێ بدات، فەرمووی: (هەستم کرد خوای گەورە باوکتی زیندو کردەوەو پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم هەرشتێکت دەوێت ئاواتی بۆ بخوازە پێت دەبەخشم، وتی: ئەی پەروەردگار بە تەواوی واتا بەندایەتیم نەکردوویت، لەتۆ دەخوازم بمگێڕیتەوە بۆ دنیا تاکو لەگەڵ پێغەمبەرەکەدا بجەنگم جارێکی تر لە پێناوی تۆدا بکوژرێمەوە، فەرمووی: ئەوە پێشتر لای منەوە بڕیاری لەسەر دراوە کە هیچ کەس بۆ دنیا ناگەڕێتەوە).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: یەعقوب بۆی گێڕاینەوە، لە باوکمەوە، لە ئیبن ئیسحاقەوە،لە حارسی کوڕی فوزەیلی ئەنساریەوە، لە مەحمودی کوڕی لەبیدەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (شەهیدەکانی لەسەر ڕوبارێکی ڕون و بریقەدارن لە بەردەرگای بەهەشتدا، لە گومەزێکی سەوزدا،لێوەی ڕزق و ڕۆزی خۆیان بۆ دێت لە بەهەشتەوە بە بەیانیان و ئێوارانەدا) تەنها ئەحمەد هێناویەتی. ئیبن جەریریش لە ئوبەی کوڕی کورەیبەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سولەیمان و عوبەیدەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە، گێڕاویەتیەوە، ئەویش ئیسنادێکی جەیدە.

شەهیدەکانیش بەش بەشن: هەندێکیان ڕۆحەکانیان لە بەهەشتدا دەفڕێت، هەندێکی تریان لەسەر ئەو ڕوبارەن لەبەردەم دەرگای بەهەشتدایە، دەگونجێت ئەوپەڕی ڕۆشتنیان تا ئەو ڕوبارە بێت و لەوێدا کۆببنەوە و، لەوێدا ڕزق و ڕۆزیان بۆ بێت و بڕوات - خوای گەورە زاناترە.

لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا فەرموودەیەکمان گێڕایەوە کە مژدەی بۆ هەموو ئیمانداراێك تێدابوو بەوەی کە ڕۆحی ئەویش بەهەمان شێوە لە بەهەشتدا دەفڕێت و، لە بەروبومەکانی دەخوات و، ئەو هەموو خۆش و شادیە دەبینێتکە لە بەهەشتدایە، هەروەها ئەو ڕێزو پلەو پایە دەبینێت کە خوای گەورە ئامادەی

کردووە، ئەمەش بە ئیسنادێکی سەحیحی بەهێزو بەتوانا کەسیان لە چوار پێشەوای مەزهەبەکانی تێدا کۆ بوەتەوە، چونکە ئیمام ئەحمەد بەرەحمەت بێت لە موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە مالیکی کوڕی ئەنەسی ئەسبەحیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، ئەویش لە زوهەریەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (گیانی ئیماندار باڵندەیەکە بەسەر درەختی بەهەشتەوە دەخوات تاکو خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆناو جەستەکەی دەیگێڕێتەوە).

لەم فەرموودەیەدا (ڕۆحی ئیماندار لە شێوەی باڵندەیەکدایە لە بەهەشتدا)، بەڵام ڕۆحی شەهیدەکان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە، وەك ئەستێرەکان وایە بە بەراورد بۆگیانی سەرجەم ئیماندارانی تر، چونکە ئەو خۆی دەفڕێت، داوا لە پەروەردگاری بەخشندە دەکەین لەسەر ئیمان بمان مرێنێت.

پاشان کە دەفەرموێت: ﴿فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، واتە شەهیدەکان ئەوانەی لە پێناوی خوادا کوژران لای پەروەردگاریان زیندوون، ئەوان دڵخۆشن بەو خۆشی و شادیەی تیایدان، مژدە دەدەن بەو برایانەیان کە لەدوای ئەمانەوە لە پێناوی خوادا دەکوژرێن کە ئەوان پێشوازیان لێ دەکەن و پێش ئەوان کەوتون، وە ناترسن لەوەی کە لە پێش دەمیانەوە، خەفەتیش ناخۆن بۆ ئەوەی پاش خۆیان بەجێیان هێشتووە. داوای بەهەشت لە پەروەردگار دەکەین.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت ﴿وَيَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ واتە دڵخۆشن بە هاتن و پێگەشتنەوەی براکانیان لەدوای خۆیانەوە پێیان بەهۆی بەردەوامیان لەسەر جیهادو تێکۆشانیان، سەدی دەڵێت: شەهید نوسراوێکی دەدرێتێ تیایدا نوسراوە: ڕۆژی ئەوەو ئەوە فلانەکەس دێت بۆلات، فلانە کەسی تریش ڕۆژی ئەوەو ئەوە دێت بۆلات، ئەویش بەمە زۆر دڵخۆش دەبێت هەروەك چۆن کەسێك لە دنیادا دڵخۆش دەبێت بە سەردانی کەسێك بۆلای کە ماوەیەکی زۆرە نەیبینیوە.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: کاتێك ڕۆشتنە بەهەشتەوەو ئەو هەموو ڕێزو کەرامەتەیان بینی بۆ شەهیدەکان، وتیان: خۆزگایە براکانمان لە دنیا ئەوەیان بزانیایە کە ئێمە دەیزانین سەبارەت بە ڕێزو کەرامەتی شەهید، چونکە ئەگەر بزانن ئەوکاتە هەر جەنگێك هاتە پێش پەیوەندی پێوە دەکەن تاکو شەهید ببن و ئەو خێرەی دەستی ئێمە کەوتووە دەستی ئەوانیش بکەوێت، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێ بێت) هەواڵی شەهیدەکانی گەیاند بە هاوەڵان و پێی وتن کە لەچ نازو نیعمەت و پلەیەکدان، پەروەردگاریان ئەوەی بە شەهیدەکانیش ڕاگەیاند کە ئایەتم بۆ پێغەمبەرەکەتان دابەزاندو باسی پلەوپایە و ئاواتەکەی ئێوەم بۆ کرد، ئێوەش بەوە دڵخۆش بن، ئەمەش واتای ئەوەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە چەسپاوە سەبارەت بە چیرۆکی هاوەڵانی بیری (معونە) کە حەفتا کەس لە ئەنسارەکان لە بەرەبەیانێکدا تیایدا کوژران، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێ بێت) قونوتی خوێندو دوعای لەوانە کرد کە کوشتنیان و بە نەفرەتی کردن، ئەنەس دەڵێت: قورئان سەبارەت بەوان هاتە خوارەوەو ئێمەش خوێندمانەوە تا ئەوکاتەی ئەو ئایەتە بەرز کرایەوە کە دەفەرموێت (أنْ بلِّغوا عنّا قومنا أنّا لقينا ربّنا، فرضي عنّا وأرضانا).

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٧١﴾، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: مژدە بدەن و دڵخۆش بن بەوەی کە بەچاوی خۆتان ئەو پەیمانەی پێتان درابوو بە پاداشت و بەخشش بینیتان.

عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش دەڵێت: ئەم ئایەتە هەموو ئیمانداران دەگرێتەوە بە شەهیدان و جگە لەوانیشەوە، زۆرکەم خوای گەورە باسی ڕێزو بەخشینێکی کردووە بۆ پێغەمبەران لەگەڵ پاداشتێکدا کە پێیان دەدات بێ ئەوەی باسی پاداشتی کردبێت بۆ ئیماندارانیش لەدوای ئەوانەوە.

دواتر دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ﴾. ئەوە لە ڕۆژی (حمراء الأسد)دا ڕویدا، ئەویش ئەوە بوو کە بت پەرستەکان ئەوەی توانیان لە زیان بە موسڵمانەکانیان گەیاندو بەڵایان بەسەردا

هێنان، بەڵام کاتێك بەردەوام بوون لە ڕۆشتنەوەیان پەشیمان بوون کە بۆچی بە تەواوی نەیاندا بەسەر خەڵکی مەدینەداو ئەو ڕۆژەیان نەکردە ڕۆژی لەناوبردنی یەکجارەکی، کاتێك ئەمە بە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) گەشتەوە هانی موسڵمانەکانی دا تاکو شوێنیان بکەون بەو مەبەستەی کە بیان ترسێنن و نیشانیان بدەن کە موسڵمانان هێزو خۆ ڕاگریان هەیە، بۆ ئەم دواکەوتنەش جگە لەو کەسانەی لە ڕۆژی ئوحوددا بەشداریان کردبوو ڕێگەی بەهیچ کەسێکی تر نەدا لە گەڵیاندا بڕوات جگە لە جابری کوڕی عەبدوڵلا نەبێت (درودی خوای لێ بێت) ئەمەش بەو مەبەستەی کە دواتر باسی دەکەین، موسڵمانەکان ئەو هەموو برین و ئازارەی کە پێیانەوە بوو کردیانە هۆکارێك بۆ ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی و نزیك بوونەوە لە خوا.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی یەزید بۆی گێڕاینەوە، لە سوفیانی کوڕی عویینەوە، لە عەمرەوە، لە عەکرەمەوە، وتی: کاتێك بت پەرستەکان لە ئوحوود گەڕانەوە، وتیان: نە موحەممەدتان کوشت و، نە مەمکەکانتان گوشی، بەڕاستی کارێکی خراپتان کرد، کەواتە بگەڕێنەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) ئەوەی بیست، هانی موسڵمانەکانی دا بۆ شوێنکەوتنی بت پەرستەکان، ئەوانیش وەڵامی پێغەمبەریان دایەوەو شوێنی بت پەرستەکان کەوتن تاگەشتنە (حمراء الأسد) یان بیری المعونە گومان لە سوفیاندایە، بت پەرستەکان وتیان: (نرجع من قابل)، ئیتر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) گەڕایەوە، ئەم هێرشەش بە جەنگ و غەزا حساب دەکرێت، خوای گەورەش ئەمەی ناردە خوارەوە ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾﴾.

ئیبن مەردەویەش لە فەرموودەی موحەممەدی کوڕی مەنسورەوە، لە سوفیانی کوڕی عویینەوە، لە عەمرەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە بەهەمان شێوەی گێڕاوەتەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ڕۆژی ئوحود ڕۆژی شەممەی نیوەی شەعبان بوو، کاتێك ڕۆژی سبەینێی یەك شەممە هات دە ڕۆژ لە مانگی شەوال تێپەڕی بوو، بانگ دەری پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بانگی

خەڵکەکەی کرد بۆ جیهاد و شوێنکەوتنی دوژمنان، بانگ کەرەکە ڕایگەیاند کە هیچ کەس لە گەڵماندا نایەت جگە لە بەشداربوانی جەنگی ئوحود کە لە ڕۆژی ڕابردوودا ئامادەبوون، بەڵام جابری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەرام قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باوکم منی بەسەر حەوت خوشکمەوە جێ هێشت و وتی: ئەی کوڕی خۆم نە بۆمن و نە بۆ تۆ ڕەوا نیە ئەم ئافرەتانە بەجێ بێڵین و پیاوێکیان لەناودا نەبێت، منیش تۆ ناخەمە پێش خۆمەوە لە جیهادکردن لەگەڵ پێغەمبەری خواداو فەزڵت نادەم بەسەر خۆمدا، لەبەرئەوە لە لای خوشکەکانت بمێنەرەوە، منیش لەلای ئەوان مامەوە، ئیتر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ڕوخستە بەشداری کردنی پێداو لەگەڵ ئەواندا لە مەدینە دەرچوو، پێغەمبەری (دروودی خوای لێ بێت) کە دەرچوو لە مەدینە مەبەستی ترساندنی دوژمنان بوو، ئەوەشی مەبەست بوو کە قورەیشیەکان بزانن موحەممەد و هاوەڵەکانی شوێنیان کەوتوونەتەوەو بەهێزن، وەئەوەی کە بەسەریاندا هات نەیترساندون لە دوژمنەکانیان.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابت لە ئەبی سائیبی مەولای عائیشەی کچی عوسمانەوە بۆی گێڕامەوە کە: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر کە سەربە تیرەی بەنی عەبدولئەشهەل بوو بەشداری ئوحودی کردبوو، وتی: من و براکەم بەشداری ئوحودمان کردو بە برینداری گەڕاینەوە، کاتێك بانگ کەرەکەی پێغەمبەری خوا بانگی کرد بۆ دەرچوون لە مەدینە بەدوای دوژمناندا، بە براکەم وت - یان پێی وتم -: ئایا بێڵین ئەم غەزایەمان لەدەست دەربچێت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، سوێند بەخوا هیچ وڵاغێکمان نیە سواری ببین، ئەو برینەشی کە پێمانەوەیە قورسە؟، بەڵام هەرلەگەڵ پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لێ بێت) دەرچووین و، برینەکەی من سوك تربوو لەوی ئەو، هەرکات ئازار زۆری بۆ بهێنایە ماوەیەك هەڵم دەگرت و ماوەیەکی تر بەپێ دەڕۆشت، تاکو گەشتینە ئەو شوێنەی موسڵمانان پێی گەشتن.

بوخاریش دەڵێت: موحەممەدی کوڕی سەلام بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو معاویەوە، لە هیشامەوە، لە باوکیەوە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)

سەبارەت بە ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ ئایەتەکە. وتم بە عورروە: ئەی خوشکەزای خۆم هەردوو باوکت لەو کۆمەڵە بوون زوبەیرو ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێ بێت) کاتێك ئەو بەڵاو نارەحەتیە هات بەسەر پێغەمبەری خوادا لە ڕۆژی ئوحوددا، ئەوەبوو بت پەرستەکان گەڕانەوەو ڕۆشتن، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ترسا کە بگەڕێنەوە، فەرمووی: (کێ بەدوایاندا دەگەڕێتەوە) حەفتا پیاویان خۆیان پێشکەش کرد لەوانە ئەبوبەکرو زوبەیربوو (ڕەزای خوایان لێ بێت). بەمشێوەیە بوخاری گێڕاویەتیەوەو بەم چوارچێوەیە تەنها ئەو گێڕاویەتیەوە.

بەمشێوەیەش حاکم لە موستەدرەکەکەیدا لە ئەسەممەوە، لە عەبباسی دوریەوە، لە ئەبی نەزرەوە، لە ئەبی سەعیدی موئەدەبەوە، لە هیشامی کوڕی عورروەوە گێڕاویەتیەوە. پاشان وتوویەتی: سەحیحە، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە بەمشێوەیەی وت.

هەروەها ئیبن ماجە لە هیشامی کوڕی عەممارو هەدیەی کوڕی عەبدولوەهابەوە، لە سوفیانی کوڕی عویینەوە، لە هیشامی کوڕی عورروەوە گێڕاویەتیەوە، هەروەها سەعیدی کوڕی مەنسورو ئەبوبەکری حەمیدی لە موستەدرەکەکەیدا لە سوفیانەوە گێڕاویەتیەوە، بەهەمان شێوە حاکم لە فەرموودەی ئیسماعیلی کوڕی ئەبی خالیدەوە، لە بەهیەوە لە عورروەوە، دەڵێت: عائیشە پێی وتم: ئەی کوڕی خۆم بەڕاستی باوکت لەو کەسانەبوو وەڵامی خواو پێغەمبەری خوای دایەوە پاش ئەوەی بەڵاو نارەحەتی بەسەر ئیمانداراندا هات، پاشان دەڵێت: سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم. بەڵام ئیخراجیان نەکردووە، بەهەمان شێوە ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە دەڵێت، عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر لە خودی کتێبەکەیدا دەڵێت: سەمەویهی هەواڵی پێداین، لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێرەوە، لە سوفیانەوە، لە هیشامەوە، لە باوکیەوە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی وتم: (هەردوو باوکت لەو کەسانەبوون وەڵامی خواو پێغەمبەری خوایان دایەوە پاش ئەوەی بەڵاو نارەحەتی بەسەر ئیمانداراندا هات، کە ئەبوبەکرو زوبێربوون (ڕەزای خوایان لێ بێت)). ڕەفع کردنی ئەم فەرموودەیە هەڵەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لە لایەنی ئیسنادەکەیەوە بەهۆی دژایەتیکردنی

لەگەڵ گێڕانەوەی متمانە پێکراوەکاندا، لەوەستانیدا لەسەر عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وەك پێشکەشمان کرد، وە لەلایەنی واتاکەشیەوە چونکە زوبێر لە باوانی عائیشە نەبووە، بەڵکو عائیشە ئەمەی بە زوبێری کوڕی عەوام وتووە، چونکە خوشکەزای بووە و کچی ئەسمای کچی ئەبو بەکر بووە(ڕەزای خوای لێ بێت).

ئیبن جەریر دەڵێت: موحەممەدی کوڕی سەعید بۆی گێڕامەوە، لە باوکمەوە، لە مامەوە، لە باوکمەوە، لە باوکیەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتی: خوای گەورە لە ڕۆژی ئوحودا ترسی خستە دڵی ئەبو سوفیانەوە پاش ئەو ڕوداوەی کە ڕویداو، گەڕایەوە بۆ مەککە، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەبو سوفیان توانی زیانتان پی بگەیەنێت و دەستان لێ بوەشێنێت، بەڵام گەڕایەوەو خوای گەورە ترسی فڕێدایە نێو دڵیەوە).

ڕوداوی ئوحود لە مانگی شەوالدابوو، بازرگانەکانیش لەمانگی (ذي القعدة)دا دەهاتن بۆ مەدینە، لە هەموو ساڵێکدا جارێك لە بەدری بچوك لایان دەدا، بەڵام ئەوان پاش ڕووداوی ئوحود هاتن و، لەوکاتەدا موسڵمانان بەڵاو نارەحەتی گەورەیان بەسەردا هاتبوو، شکایەتی ئەمەیان برد بۆلای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) چونکە زۆر لەسەر دڵیان سەخت بوو. پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێ بێت) بانگی لە خەڵکەکە کرد تاکو دەربچن و لەگەڵ ئەودا بەدوای بت پەرستەکان بکەونەوە، فەرمووی: (ئەوان ئێستە دەڕۆن و دەچنە حەج، تا ساڵێکی تر ناتوانن هاوشێوەی ئەمە بکەنەوە) شەیتان هات و دۆست و هاوڕێکانی دەترساند، دەیوت: بەڕاستی هەموو خەڵکی لە دژی ئێوە کۆبونەتەوە، خەڵکەکەش شوێنی پێغەمبەر نەکەوتن، پێغەمبەر فەرمووی: (من دەڕۆم ئەگەر یەك کەسیش شوێنم نەکەوێت دەچم هانی خەڵکەکە دەدەم). ئەوەبوو ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و زوبێرو سەعد و تەڵحەو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو حوزەیفەی کوڕی یەمان و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح لەگەڵ حەفتا پیاودا شوێنی پێغەمبەر کەوتن و دەرچوون بەدوای ئەبو سوفیاندا بەو هیوایەی پێیان بەگەنەوە تاکو گەشتنە (الصفراء) خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ﴾.

پاشان ئیبن ئیسحاق وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە مەدینە ڕۆشتە دەرەوە تا گەشتە (حمراء الأسد)، کە هەشت میل لە مەدینەوە دوورە، ئیبن هیشام دەڵێت: ئیبن ئوم مەکتومی بە سەرپەرشتیاری مەدینەدانا، ڕۆژی دوو شەممەو سی شەممەو چوار شەممە لە (حمراء الاسد) مایەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە، وەك عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر بۆی گێڕامەوە - موعبەدی کوڕی ئەبو موعبەدی خوزاعی بەلای پێغەمبەردا تێپەڕی، بەنی خوزاعەش بە موسڵمانان و بت پەرستیانەوە هاوپەیمان بوون لەگەڵ پێغەمبەری خواداو (دروودی خوای لێ بێت) و لە توهامە گرێبەستیان هەبوو،هەروەها هیچ شتێکیان لە پێغەمبەر نەدەشاردەوە کە جێگەی سەرنجیان بوایە، موعبەد لەوکاتەدا بت پەرست بوو، وتی: ئەی موحەممەد، سوێند بەخوا زۆرمان پێ ناخۆش بوو کە ئەو نارەحەتیە بەسەر خۆت و هاوەڵەکانتدا هات، ئاواتە خواز بووین خوا بیپارستنایە لە دەستیان، پاشان موعبەد ڕۆشت و لە (روحاء) گەشت بە ئەبو سوفیان و کۆمەڵەکەی، کە خۆیان ئامادە کردبوو بگەڕێنەوە سەر پێغەمبەرو هاوەڵەکانی، وتیان: بەڕاستی ژمارەیەکی باشمان لە هاوەڵ و سەرکردە و ناودارەکانیانیان کوشت، ئەمجارەیان دەگەڕێنەوەو لەرەگ و ریشە دەریان دێنین؟ دەدەین بەسەر ئەوانەیاندا کە ماونەتەوەو پاشان بە تەواوی خۆمانیان لێ ڕزگار دەکەین؟ کاتێك ئەبو سوفیان موعبەدی بینی، وتی: ئەی موعبەد، چیت لە پشتەوەیە؟ وتی: موحەممەدو هاوەڵەکانی بە کۆمەڵێکەوە هاتوون کە هەرگیز هاوشێوەی ئەوانم نەبینیوە، بە تەواوی رقیان لێتان هەستاوەو گڕیان گرتووە بۆتان، ئەوەشی لە ئوحودا دواکەوتبوو ئەمڕۆ هەمووی لەگەڵیدا هاتونەتەوەو پەشیمانن لەوکارەی کردیان، رق و قینێکیان تێدایە بەرامبەر ئێوە کە هەرگیز هاوشێوەیم نەبینیوە، ئەبو سوفیان وتی: تیاچیت، ئەوە چی دەڵێیت؟ وتی: سوێند بەخوا پێم باش نیە بڕۆیت تا نێوچاوانی ئەسپەکان نەبینم، وتی: سوێند بەخوا هەرچیمان لەتوانادایە کۆمان کردۆتەوە لە دژیان تاکو ئەوانەشیان کەماونەتەوە لە رەگ و ریشە دەربێنین، موعبەد وتی: بەڕاستی من بەرگریت لێ دەکەم لەم کارە، سوێند بەخوا ئەوەی کە من بینیم لێیان وای لێکردم ئەم چەند دێڕە شیعرە دەربارەیان بڵێم، ئەبو سوفیان وتی: چیت وت؟ دەڵێت: وتم:

كـادَتْ تَـهُـدّ مـنَ الأصـوات راحِـلَـتـي
إذْ سـالَـت الأرضُ بـالـجُـرْدِ الأبـابـيـلِ
تَـرْدِي بـأسْـدٍ كِـرامٍ لا تـنـابـلـةٍ
عـنْـدَ الـلّـقـاءِ ولا مـيـلٍ مَـعـازيـلِ
فَـظَـلْـتُ عَـدْوًا أظُـنّ الأرض مـائـلَـةً
لَـمّـا سـمـوا بـرئـيـس غـيـر مَـخْـذولِ
فقلتُ: ويل ابن حَرْب من لقائكُمُ
إذا تَـغَـطْـمَـطَـت الـبـطـحـاء بـالـجـيـل
إنـي نـذيـر لأهـل الـبَـسْـل ضـاحِـيَـةً
لـكـل ذي إرْبَـة مـنـهـم ومـعـقـولِ
مـن جَـيْـشِ أحـمـدَ لا وَخْـشٍ تَـنـابِـلـة
ولـيـس يُـوْصَـفَ مـا أنـذرتُ بـالـقِـيـلِ

دەڵێت: ئەبو سوفیان و ئەوانەی لەگەڵیدابوون ستایشی ئەمەیان کردو بەهۆیەوە خۆیان لادا لە گەڕانەوە بۆسەر پێغەمبەر و هاوەڵانی، دواتر کاروانێکی عەبدولقەیس بەلای ئەبو سوفیاندا تێپەڕی، وتی: ئەتانەوێت بۆ کوێ بچن؟ وتیان: بەرو مەدینە دەچین. وتی: بۆچی؟ وتیان: خواردنی سەفەرمان دەوێت وتی: ئایا لەلایەن منەوە نامەیەك بە موحەممەد دەگەیەنن ئەگەر پێتاندا بینێرم، وەئەگەر گەیاندتان و وەفاداربوون لە داهاتوودا لە بازاڕی عوکاز شەرابتان پێشکەش دەکەم؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەگەر گەشتنە لای موحەممەد هەواڵی پێبدەن کە سوپامان لە دژی کۆ کردۆتەوە تاکو خۆی و هاوەڵەکانی و ئەوانەی ماونەتەوە لە ڕەگ و ڕیشە دەربهێنین و لەناویان بەرین، کاروانەکەش بەلای پێغەمبەری خوادا تێپەڕین کە هێشتا لە (حمراء الاسد) مابویەوە، ئەو هەواڵەیان دا بە پێغەمبەر کە ئەبو سوفیان پێ ڕاگەیاندبوون، ئەوانیش وتیان: حسبنا الله ونعم الوكيل. واتە خوامان بەسەو ئەو چاکترین وەکیلە.

ئیبن هیشام لە ئەبو عوبەیدەوە باسی کردووە، وتویەتی: کاتێك هەواڵی گەڕانەوەیان بە پێغەمبەری خوا گەشت فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی گیانی

منی بەدەستە بەردێکیان بۆ ئامادەکرابوو ئەگەر بەریان بکەوتایە وەك دوێنێی ڕابردویان لێ دەهات).

حەسەنی بەسری سەبارەت بە ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ﴾: دەڵێت: ئەبو سوفیان و هاوەڵەکانی ئەو بەڵاو ناڕەحەتیەیان بەسەر موسڵماناندا هێنا کە هێنایان، پاشان گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەبو سوفیان گەڕایەوەو، خوای گەورە ترسی فڕێدایە نێو دڵیەوە، کێ ئامادەیە بەدوای کەوین؟ ئەوەبوو پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) و ئەبوبەکرو عومەر و عوسمان و عەلی و کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی هەستان و شوێنیان کەوتن، هەواڵ بە ئەبو سوفیان گەشت کە پێغەمبەر دوای کەوتووە، کاروانێکی بازرگانی پێ گەشت و پێی وتن: موحەممەدم لێ بگێڕنەوە ئەوەندەو ئەوەندە ..... (مجل) شتتان دەدەمێ، ئەوەش بە موحەممەد و هاوەڵانی ڕابگەیەنن کە من سوپایەکی گەورەم بۆ ئامادەو کۆکردۆتەوەو، دەگەڕێمەوە سەریان، بازرگانەکان هاتن و ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەر گەیاند، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾. و ئەم ئایەتەش هاتە خوار.

عەکرەمەو قەتادەو لە کەسێك زیاتر هەر بەمشێوەیەیان وتووە: ئەم باسە دەربارەی کارەکەی حمرا و الاسد هاتە خوارەوە، هەروەها وترا: سەبارەت بە بەدر هاتۆتە خوارەوە، بەڵام یەکەمیان ڕاستە.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا﴾ واتە ئەوانەی خەڵکی هەڕەشەیان لێ دەکردن بە سوپای زۆرو دەیان ترساندن بە زۆری ژمارەی دوژمنان، بەڵام ئەوان لایان بەلای ئەم هەڕەشەیەدا نەکردەوە بەڵکو پشتیان بەخوا بەست و داوای هاوکاریان لەو کرد ﴿وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾. بوخاری دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی یونس بۆی گێڕاینەوە، وتی: وادەزانم وتی: ئەبوبەکری کوڕی ئەبی حسین بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی زوحاوە، لە ئیبن عەباسەوە کە ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ ئەو ڕستەیەیە کە ئیبراهیم (درودی خوای لێ بێت) لەوکاتەدافڕێدراوەتە ناو ئاگرەکەوە وتویەتی،موحەممەدیش لەوکاتەدا خەڵکی

لەدژی کۆبونەوەو پێیان وت: قورەیشیەکان و دوژمنەکانتان هەرهەموویان لە دژی ئێوە کۆبوونەتەوە تاکو لەناوتان بەرن، بەڵام ئەم و هاوەڵانی ئیمانیان زیادی کردو، وتیان: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾

نەسائیش ریوایەتی کردووە لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم و هارونی کوڕی عەبدڵلاوە، هەردوکیان لە یەحیای کوڕی ئەبی بەکیرەوە، لە ئەبو بەکرەوە کە ئیبن عەیاشە. ئەوەی جێگەی سەر سوڕمانە ئەوەیە حاکم ئەبا عەبدوڵلا لە فەرموودەی ئەحمەدی کوڕی یونسەوە گێڕاویەتیەوە، پاشان وتویەتی: فەرموودەکە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم سەحیحە، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە. پاشان بوخاریش گێڕاویەتیەوە لە ئەبی غەسان مالیکی کوڕی ئیسماعیلەوە، لە ئیسرائیلەوە، لە ئەبی حەسیەوە، لە ئەبی زوحاوە، لە ئیبن عەباسەوە، دەڵێت: دوا قسەی ئیبراهیم (درودی خوای لێ بێت) کە هەڵدرایە ناو ئاگرەکەوە ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾. بوو.

عەبدولڕەزاقیش دەڵێت: ئیبن عویینە وتی: زەکەریا لە شەعبیەوە بۆی گێڕامەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە، وتی: ئەوە وشەی ئیبراهیم بوو (درودی خوای لێ بێت) لەوکاتەدا کە هەڵدایە ناو ئاگرەکەوە. ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە.

ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە دەڵێت: موحەممەدی کوڕی موعەممەر بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبراهمی کوڕی موسای سەوریەوە، لە عەبدولڕەحیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی زیادی سوکەریەوە، لە ئەبوبەکری کوڕی عەیاشەوە، لە حەمیدە درێژەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە، کە لە ڕۆژی ئوحوددا بە پێغەمبەر وترا: بەڕاستی هەموو خەڵکی بۆ لەناو بردنتان کۆبونەتەوە، لێیان بترسن، خوای گەورە ش ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە. بەهەمان شێوە بە سەنەدی خۆی لە موحەممەدی کوڕی عوبەیدوڵلای رافیعیەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە - ئەبی رافیع - ەوە گێڕراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) عەلی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانیدا نارد بەدوای ئەبو سوفیاندا، لە ڕێگەدا ئەعەرابیەکی سەر بەهۆزی خوزاعەی پێ گەشت و، وتی: قورەیشیەکان لە دژی ئێوە کۆبونەتەوە، ئەوانیش وتیان: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾. پاشان ئەم ئایەتەیان لەسەر هاتە

خوارەوە. پاشان ئیبن مەردەویە دەڵێت: دەعلەجی کوڕی ئەحمەد بۆی گێڕاینەوە، لە حەسەنی کوڕی سوفیانەوە، لە ئەبو خەیسەمە موسعەبی کوڕی سەعیدەوە، لە موسای کوڕی ئەعیونەوە، لە ئەعمەشەوە، لە ئەبی سالحەوە، لە ئەبی هورەیرەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەگەر کەوتنە ناو کارێکی گەورەوە بڵێن: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾.) ئەمە لەم ڕووەوە فەرموودەیەکی غەریبە: هەروەها ئیمام ئەحمەد دەڵێت: حەیوەتی کوڕی شورەیح و ئیبراهیمی کوڕی ئەبی عەباس بۆیان گێڕاینەوە، وتیان: بە قیبە بۆی گێڕاینەوە، لە بەحیری کوڕی سەعدەوە، لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە، لە سەیفەوە، لە عەوفی کوڕی مالیکەوە بۆی گێڕاونەتەوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دادوەری کردووە لەنێوان دوو پیاودا، ئەوەی حوکمەکەی بەسەردا درا پاش پشت هەڵکرتن وتی: (حسبي الله ونعم الوكيل). پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئەو پیاوە بگێڕنەوە بۆلام) فەرمووی: (چیت وت؟) وتی: وتم: (حسبي الله ونعم الوكيل). پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (خوای گەورە سەرزەنشتی بێدەسەڵاتی و نەتوانایی دەکات، بەڵام من فەرمانت پێدەکەم بەزیرەکی و وریایی، ئەگەر فەرمانێکیش بەسەرتا زاڵ بوو، بڵێ: حسبي الله ونعم الوكيل) بەهەمان شێوە ئەبو داودو نەسائی لە فەرموودەی بەقییەوە، لە بەحیرەوە، لە خالیدەوە، لە سەیفەوە کە شامییە، گێڕاویانەتەوە، بەڵام نەدراوەتە پاڵ عەوفی کوڕی مالیك کە لە پێغەمبەرەوە بەوشێوەیە گێڕابێتیەوە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئەسبات بۆی گێڕاینەوە، لە موتریفەوە، لە عەتییەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (چۆن تام و چێژ لە نیعمەتەکان وەرگرم و لەناویاندا بژیم لەکاتێکدا خاوەنی کەڕەناکە کەڕەناکەی بەدەمەوە گرتووەو ناوچاوی داخستووە گوێ دەگرێت بزانێت کەی فەرمانی پێدەکرێت فوی پیا بکات؟) هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) وتیان چی بڵێین؟ فەرمووی: (بڵێن: حسبنا الله ونعم الوكيل على الله توكلنا) ئەمە بەچەند شێوەیەك ریوایەت کراوە، فەرموودەیەکی جەیدە.

هەروەها بۆمان گێڕراوەتەوە لە دایکی ئیمانداران عائیشەو زەینەبەوە (ڕەزای

خوایان لێ بێت) کە فەخرو شانازیان کردووە بەسەر یەکتردا، زەینەب وتوویەتی: خوای گەورە منی مارە کردووە، بەڵام ئێوە کەس و کارەکانتان مارەیان کردوون، عائیشە وتویەتی: پاکێتی من لە ئاسمانەوە لە قورئاندا هاتە خوارەوە، زەینەب تەسلیم بوو، پاشان وتی: کاتێك سواری وشترەکەی سەفوانی کوڕی موعەتەل بوویت چیت وت؟ عائیشە وتی: وتم: حسبي الله ونعم الوكيل. زەینەب وتی: وشەی ئیماندارانت وتووە.

لەبەرئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾، واتە کاتێك پشتیان بەخوا بەست خوای گەورە ئەو ترس و خەمەی لابرد کە لەسەریان بوو، پیلان و فێڵی ئەوانەشی بەرپەرچ دایەوە کە دەیان ویست لەناویان بەرن و هەموویانی گێڕایەوە بۆ شارەکەیان ﴿بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾، ئەوەی کە دوژمنەکەیان بۆیان لە مەلاسدا بوون و دەیانخواست ﴿وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ﴾.

بەیهەقی دەڵێت: ئەبو عەبدوڵڵای حافز بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبوبەکری کوڕی داودی ناهیدەوە، لە موحەممەدی کوڕی نەعیمەوە، لە بیشری کوڕی حەکەمەوە، لە موبەشیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەزینەوە، لە سوفیانی کوڕی حسەینەوە، لە یەعلای کوڕی موسلیمەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە، سەبارەت بە ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ﴾، وتویەتی: نعمە ئەوەبوو کە سەلامەت بوون، فەزڵیش ئەوەبوو کە کاروانێك تێپەڕی ئەوکاتەش وەرزی حەج کردن بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کڕی و پارەیەکی لێ قازانج کردوو دابەشیکرد لەنێو هاوەڵەکانیدا.

ئیبن ئەبی نەجیح لە موجاهیدەوە سەبارەت بە فەرموودەی پەروەردگار: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ﴾ دەڵێت: ئەو کەسە ئەبو سوفیان بوو، بە پێغەمبەری وت (دروودی خوای لێ بێت)، وادەتان بەدرە ئەوەبوو هاوەڵەکانی ئێمەتان کوشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لەوانەیە)، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ڕۆشت بۆ مەوعید و وادەکە تا گەشتە بەدرو لەوێ دابەزی و، لەوێ ئەو معامەلەیان بۆ ڕێ کەوت، ئەمەش وتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ

سوره‌﴾ دەڵێت: ئەمە غەزای بەدری بچوکە، ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە.

هەروەها لە قاسمەوە گێڕراوەتەوە، لە حسەینەوە، لە حەجاجەوە، لە ئیبن جورەیجەوە، وتویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بەرەو مەوعیدەکەی ئەبو سوفیان دەڕۆشت لە ڕێگە دا بت پەرستەکانیان پێ دەگەشت و سەبارەت بە قورەیش پرسیاریان لێدەکردن، ئەوانیش وتیان: بەڕاستی بۆ ئێوە کۆبوونەتەوە، بەوە فێڵیان لە موسڵمانان دەکرد، دەیان ویست بیانترسێنن، ئیماندارانیش دەیان وت: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ تا گەشتنە بەدر، بینیان بازاڕەکانی سەلامەت و کراوەن و کەس نیە ڕکەبەریان بکات تیایدا، دەڵێت: پیاوێك لە بت پەرستەکان ڕۆشت هەواڵی ئەم سوپایەی پێغەمبەری دا بە مەککەو، لەم بارەیەوە ئەم شیعرەی خوێندەوە: (الرجز)

نَفَرَتْ قَلُوصِي من خُيول محمّد

وَعَجْوَةٍ مَنْثُورَةٍ كالعُنْجُدِ

واتَّخَذَتْ ماء قُدَيْدِ مَوْعدي

واتخذت ما و قدير موعدي

ئیبن جەریر دەڵێت: بەمشێوە قاسم ئەم شیعرەی داناوە بەڵام هەڵەیەو، خۆی بەم شێوەیە:

قَدْ نَفَرَتْ من رُفْقَتَيْ مُحَمَّد

وَعَجْوَةَ مِنْ يَثْرب كالعُنْجُدِ

تَهْوِي عَلَى دين أبِيها الأتْلَد

قدْ جَعَلَتْ ماءَ قُدَيْدِ مَوْعِدِ

وَماء ضَجْنان لَها ضُحَى الغَدِ

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ﴾، واتە دۆستەکانی شەیتان دەتان ترسێنن، گومانتان بۆ دروست دەکەن کە ئەوان خاوەن هێزو دەسەڵاتێکی توندو بەهێزن، خوای گەورەش فەرمووی ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾، واتە ئەگەر خورپەیەك بە دڵتاندا هات و گومانتان بۆ دروست بوو کە ئەوان بەو شێوەیەن ئەوە پشت بەخوا ببەستن و پەنا بۆ ئەو

بەرن، چونکە خوای گەورە بەسە بۆ سەرخستنی موسڵمانان بەسەر بت پەرستەکاندا، وەك دەفەرمویت: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ﴾، تا دەگاتە ﴿قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾ [الزمر: ٣٦ ـ ٣٨]، یان دەفەرمویت ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ [النساء: ٧٦]، یان دەفەرمویت ﴿أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ [المجادلة: ١٩]، هەروەها دەفەرمویت ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ [المجادلة: ٢١]. یان دەفەرمویت ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ﴾ [الحج: ٤٠]، هەروەها دەفەرمویت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ﴾ [محمد: ٧] هەروەها دەفەرمویت ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ [غافر: ٥١ ـ ٥٢].

﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ
ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
ٱشْتَرَوُاْ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾
وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ
لِيَزْدَادُوٓاْ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ
مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى
ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن
تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ
ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ
بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ
﴿١٨٠﴾﴾

خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەمان دەفەرمویت ﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ﴾، ئەمەش بەهۆی سوربوونی پێغەمبەری خواوە لە خەمخواردنی

خەڵکیدا، دەست پێشخەری و هاندانی بت پەرستەکان بۆ سەرپێچی کردن و کەلله رەقی و بەربەرە کانێ پێغەمبەری خەفەت بار دەکرد، خوای گەورە پێی فەرموو: ئەوە خەفەتبارت نەکات ﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الْآخِرَةِ﴾ واتە حیکمەت و دانایی پەروەردگار لەو بت پەرستانەدا کە ئەو کارە دەکەن بۆ ئەوەیە بە ویست و دەسەڵاتی خۆی هیچ بەش و پاداشتێکی قیامەتیان بۆ نەمێنێت و بە تەواوی بی بەش بن تیایدا ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾، پاشان خوای گەورە سەبارەت بەمە هەواڵ دەدات هەواڵێکی بڕیار لێدراو، دەفەرموێت ﴿إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْكُفْرَ بِالْإِيمَانِ﴾، واتە ئەمەیان گۆڕیەوە بەوە ﴿لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا﴾، واتە تەنها خۆیان زەرەردەکەن و زیان بەخۆیان دەگەیەنن ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾. پاشان فەرمووی ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْمًا وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾﴾، وەك ئەم ئایەتەی تر کە دەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾ [المؤمنون: ٥٥ - ٥٦]. یان وەك ئەم ئایەتەیە ﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا الْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [القلم: ٤٤] یان ﴿وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَأَوْلَادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِي الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ [التوبة: ٨٥].

دوای ئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾.

موجاهید دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا جیاوازی لە نێوانیاندا کرد، قەتادە دەڵێت: بە جیهادو کۆچکردن جیاوازی لە نێوانیاندا کرد، سەدی دەڵێت: وتیان: ئەگەر موحەممەد ڕاست دەکات با هەواڵمان پێ بدات بزانین کێ لە ئێمە بڕوای پێ دەهێنێت و کێ بڕوای پێ ناهێنێت، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ واتە تاکو ئیماندارەکان لەناو بت پەرستەکاندا نەکاتە دەرەوە، هەموو ئەمە ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە.

دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾ واتە ئێوە غەیبی خوا نازانن سەبارەت بە بەدیهێنراوەکانی هەتاکو ئیماندارتان بۆ

جیانەکاتەوە لە دوڕووەکان بەهۆی ئەو هۆکارانەوەی کە ئەم جیاوازیە دەردەخەن، پاشان فەرمووی: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ﴾، وەك ئەم ئایەتەی تر وایــــە: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾﴾ [الــجــن: ٢٦ ـ ٢٧]. پــاشــان فەرمووی: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ﴾، واتە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن و شوێنی بکەون لەو بەرنامەیەدا بۆی داناون، ﴿وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ﴾.

دواتــر فــەرمــووی ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ﴾، واتە مرۆڤی چرووك با وانەزانێت کۆکردنەوەی سەروەت و سامان قازانجی پێدەگەیەنێت بەڵکو ئەوە زیانی پێدەگەیەنێت لە ئاینەکەیدا، تەنانەت دەشگونجێ زیان لە دنیای بدات، پاشان هەواڵی سەرەنجامەکەشی رادەگەیەنێت کە لە قیامەتدا چی دەبێت، دەفەرموێت ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾.

بوخاری دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی مونیر بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبا نەزرەوە، لە عەبدولڕەحمانەوە کە عەبدوڵلای کوڕی دینارە، لە باوکیەوە، لە ئەبی سالحەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس خوای گەورە سامانێکی پێ بەخشی و زەکاتەکەی نەدا بۆی دەکرێتە مارێکی کوێر کە دوو شاخی هەیەو لە ڕۆژی قیامەتدا چواردەوری دەدات، قەپ دەکات بە هەردوو شەویلگەیداو دەڵێت: من ماڵەکەتم، من سامان و گەنجینەکەتم) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە. بە تەنها بوخاری بەمشێوەیە هێناویەتی بەبێ موسلم، ئیبن حەبانیش لە سەحیحەکەیدا لە ڕێگەی لەیسی کوڕی سەعدەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەجلانەوە، لە قەعقاعی کوڕی حەکیمەوە، لە ئەبی سالحەوە گێڕاویەتیەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: حەجینی کوڕی موسەنا بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەلمەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی دینارەو، لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی

خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (ئەوکەسەی زەکاتی ماڵەکەی نادات خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا مارێکی کوێری بۆ دروست دەکات کە دوو شاخی هەیە، پاشان خۆی تێ دەئاڵێنێت و دەوری دەدات و دەڵێت: من گەنجینەکەتم، من گەنجینەکەتم) وە بەمشێوەیە نەسائی لە فەزلی کوڕی سەهلەوە، لە ئەبی نەزر هاشمی کوڕی قاسمەوە، لە عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلەمەوە گێڕاویەتیەوە. پاشان نەسائی دەڵێت: گێڕانەوەکەی عەبدولعەزیز لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە، لە ئیبن عومەرەوە جێگیر بووە لە گێڕانەوەکەی عەبدولڕەحمانەوە، لە باوکیەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە، لە ئەبی ساڵحەوە، لە ئەبی هوڕەیڕەوە، (وتم): هیچ ناکۆکیەك لە نێوان هەردوو گێڕانەوەکەدا نیە. دەگونجێت لە دوو ڕووەوە لای عەبدوڵڵای کوڕی دینار هەبووبێت. خوای گەورە زانا ترە. حافز ئەبو بەکریش دایڕشتۆتەوە لە ئیبن مەردەویەوە، لە رویەکی ترەوە، لە ئەبی ساڵحەوە، لە ئەبی هوڕەیڕەوە، هەروەها لە فەرموودەی موحەممەدی کوڕی ئەبی حەفیدەوە، لە زیادی خەتمیەوە، لە ئەبی هوڕەیڕەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێ: سوفیانی کوڕی جامیع بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی وائیلەوە، لە عەبدوڵڵاوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەربەندەیەك زەکاتی ماڵەکەی نەدات خوای گەورە مارێکی کوێری بۆ دروست دەکات شوێنی دەکەوێت و، ئەویش لێی رادەکات و ئەمیش هەر شوێنی دەکەوێت و، دەڵێت: من گەنجینەکەتم) پاشان عەبدوڵڵا سەلمێنەری ئەمەی لە قورئان خوێندەوە ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِۦ يَوْمَ الْقِيَـٰمَةِ﴾ هەر بەمشێوەیە ترمزی و نەسائی و ئیبن ماجە لە فەرموودەی سوفیانی کوڕی عویینەوە، لە جامیعی کوڕی ئەبی راشیدەوە گێڕاویانەتەوە. ترمزی عەبدولمەلیکی کوڕی ئەعیونی بۆ زیاد کردووە، لە هەردووکیشیان لە ئەبی وائیل برای ئیبن سەلەمەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە.

ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی سەحیحە. هەروەها حاکم لە موستەدرەکەیدا لە فەرموودەی ئەبوبەکری کوڕی عەیاش و سوفیانی سەورییەوە، هەردووکیان لە ئەبی ئیسحاقی سوبەیعیەوە، لە ئەبی وائیلەوە، لە ئیبن

مەسعودەوە ریوایەتی کردووە، ئیبن جەریریش لە رویەك زیاترەوە لە ئیبن مەسعودەوە بەمەوقوفی ریوایەتی کردووە.

فەرموودەیەکی تر: حافز ئەبو یەعلا دەڵێت: لە مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحەوە، لە سەوبانەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەرکەس لەپاش خۆی گەنجینەیەك بەجێ بهێڵێت مارێکی کوێری بۆ دروست دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا کە دوو شاخی هەیە، شوێنی ئەو کەسە دەکەوێت. دەڵێت: تۆ کێیت؟ تیاچوون بۆ تۆ. مارەکە دەڵێت: من ئەو گەنجینەتم کە پاش خۆت بەجێت هێشت، بەردەوام داوی دەکەوێت تاکو قەپ دەکات بەدەستیداو قوتی دەدات، دواتر هەموو جەستەی قوت دەدات). ئیسنادەکەی جەید و بەهێزە، بەڵام ئیخراجیان نەکردووە، بەهەمان شێوە تەبەرانی لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجیلەوە گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ئیبن جەریرو ئیبن مەردەویە لە فەرموودەی بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (هەر پیاوێك بچێتە لای گەورەکەی خۆی و داوای پارەیەکی زیادەی لێ بکات کە لای بێت بەڵام نەیداتێ ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا مارێکی بۆ بانگ دەکرێت پەلاماری ئەو زیادەیە دەدات کە پێی نەداوە) ئەمە بە زاری ئیبن جەریر. هەر ئیبن جەریر دەڵێت: ئیبن موسەنا بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولئەعلاوە، لە داودەوە، لە ئەبی قزعەوە، لە پیاوێکەوە، لە پێغەمبەبی خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەر خزمێك کە خزمایەتی لەگەڵ کەسێکدا هەبێت و بچێت بۆلای و داوای یارمەتی لێ بکات لەو زیادەیەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوەو لای ئەو دایناوە، بەڵام ئەو چروکی بنوێنێت و نەیداتێ، ئەوە بە دڵنیاییەوە لە دۆزەخدا مارێکی بۆ دەهێنرێتە دەرەوە هەردوو شەویلگەی دەکاتەوەو پەلاماری دەدات هەتاکو کۆتی دەکات و تێی دەئاڵێت) پاشان لە رێگەیەکی ترەوە ریوایەتی کردووە لە ئەبی قزعەوە کە ناوی حوجەیری کوڕی بەیانە، لە ئەبی مالیکی عەبدیەوە بە مەوقوفی، هەروەها بەشێوەیەکی تر لە ئەبی قزعەوە بە مورسەلی گێڕاویەتیەوە.

عەوفی لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: ئەم ئایەتە سەبارەت بە گاورو جولەکە

هاتە خوارەوە لەسەر ئەو چروکیەی دەیان کرد لە ئاشکراکردنی ئەوەی لە کتێبەکانیاندا هاتبووە خوارەوە کە لە خەڵکیان دەشاردەوە، ئیبن جەریر ڕیوایەتی کردووە. بەڵام یەکەم بۆچوون ڕاستە ئەگەرچی ئەمەی دووەمیشیان لەژێر واتاکەیدا جێگەی دەبێتەوە. هەروەها وتراوە: ئەمەیان لە پێشترە کە بچێتە نێو ئەو مەبەستەوە. خوای گەورە زاناترە.

کە دەشفەرموێت ﴿وَلِلَّهِ مِيرَاثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتە ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾ [الحديد: ٧] چونکە هەموو فەرمانەکان سەرچاوەکەیان هەر پەروەردگارەو هەربۆلای ئەو دەگەڕێنەوە. کەواتە لە ماڵەکانتان ئەوە پێش خۆتان بخەن کە بۆ ڕۆژی قیامەتتان سودتان پێ دەگەیەنێت ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾، واتە شارەزایە بە نیەت و ویژدانەکانتان.

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا
قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾
ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ
قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ
تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ
فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ
رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾﴾

سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾ [البقرة: ٢٤٥] گاورەکان وتیان: ئەی موحەممەد، خواکەی تۆ هەژار کەوتووەو داوای قەرز لە بەندەکانی دەکات؟ خوای گەورە ئەمەی نارده خوارەوە ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾ ئیبن مەردەویەو ئیبن حاتەم گێڕاویانەتەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاقیش دەڵێت: موحەممەدی کوڕی ئەبی موحەممەد بۆی گێڕامەوە، لە عەکرەمەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)

گیڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕۆشتە خانووی قوتابخانەکانەوە ژمارەیەکی زۆر لە جولەکەی بینی کۆبوونەوە لە دەوری پیاوێکیان کە پێیان دەوت (فنحاص)، کە لە زاناو پیاوە ئاینیەکانیان بوو، کەسێکی زانای تری لەگەڵ بوو پێیان دەوت (ئەشیع)، ئەبوبەکر پێی وت: هاوار بۆ تۆ ئەی فنحاس لە خوا بترسەو موسڵمان ببە، سوێند بەخوا زۆر چاك دەزانی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایەو لەلایەن خواوە حەقی بۆ هێناون، چونکە لە تەورات و ئینجیلی لای خۆتاندا ئەمەی تێدایەو دەیبینن، فنحاس وتی: سوێند بەخوا ئەی ئەبا بەکر ئێمە هیچ موحتاجی و هەژاریەکمان نیە و پێویستمان بەخوا نیە، بەڵکو خوا هەژارەو پێویستی بە ئێمەیە، ئەوچۆن دەپاڕێتەوە لە ئێمە، ئێمە وا ناپاڕێینەوە لەو، بەڵکو ئێمە دەوڵەمەندین هیچ پێویستمان بەو نیە. خۆ ئەگەر خوا دەوڵەمەندبوایەو پێویستی بە ئێمە نەبوایە داوای قەرزی لێ نەدەکردین وەك هاوەڵەکەتان بانگەشە دەکات و رایدەگەیەنێت، سووی لە ئێوە قەدەغە کردووە، بەڵام بە ئێمەی داوە، جا ئەگەر دەوڵەمەند بوایە سووی نەدەداینێ، ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) توڕەبوو بە لێدانێکی توند کێشای بە دەموچاوی فنحاسداو، وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بەهۆی ئەو پەیماننامەیەوە نەبوایە کە لە نێوان ئێمە ئێوەدایە دەمدا لە گەردنت ئەی دوژمنی خوا، ئەگەر راست دەکەن چەندە دەتوانن بە درۆماندا بخەنەوە، فنحاس رۆشت بۆلای پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) و، وتی: ئەی موحەممەد، ببینە هاوەڵەکت چی پێکردووم؟ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بە ئەبوبەکری فەرموو: (چی وای لێکردیت ئەو کارە بکەیت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دوژمنی خوایە قسەیەکی زۆر گەورەو گرانی کرد، رایگەیاندو وتی خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، کاتێك ئەبوبەکر ئەمەی وت، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) توڕەبوو، ئەمیش کێشای بە ناوچاویدا، بەڵام فنحاس ئینکاری کردو وتی: من قسەی وام نەکردووە، خوای گەورەش بۆ بەرپەرچدانەوەی فنحاس و سەلماندنی راستگۆیی ئەبوبەکر ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾ هەموو ئایەتەکە. ئیبن ئەبی حاتەم گێڕاویەتیەوە.

کە دەشفەرموێت ﴿سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ﴾ هەڕەشەو پەیمانە، لەبەرئەمە خوای

گەورە بەراوردی کردووە بەم وتەیەی خۆی کە دەفەرموێت ﴿وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ واتە ئەوە قسەیان بوو بەرامبەر بە پەروەردگار و ئەوەش ڕەفتاریان بوو لەگەڵ پێغەمبەرەکانی خوادا، خوای گەورەش لەسەر ئەو ڕەفتارەیان خراپترین سزایان دەدات، لەبەرئەوە فەرمووی ﴿وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾﴾، واتە ئەمەیان بۆ سەرزەنشت و شکاندن و ریسواکردن و بچوك کردنەوە پێ دەوترێت.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ﴾ بەهەمان شێوە خوای گەورە بۆ بەدرۆدا خستنەوەی ئەوانەی کە دەیان وت خوا لە کتێبەکەماندا پەیمانی پێداوین کە بڕوا نەهێنین بە هیچ پێغەمبەرێك تاکو یەکێك لە موعجیزەکانی ئەوە نەبێت: ئەگەر کەسێك لە ئوممەتەکەی خێرێکی کرد و خوا لێی وەرگرت، ئەوە ئاگرێك لە ئاسمانەوە دابەزێت و قوربانیەکە دەخوات، ئیبن عەباس و حەسەن و جگە لەوانیش وایان وتووە.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت ﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، واتە بە بەڵگەو نیشانەوە، ﴿وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ﴾ واتە بەو ئاگرەوەی کە قوربانیە وەرگیراوەکەی دەخوارد ﴿فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ﴾ واتە بۆچی ڕوبەڕوویان بونەوە بە سەرپێچیکردن و بەدرۆدا خستنەوەو کەللە ڕەقیتان و پاشان پێغەمبەرەکانتان کوشت ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ واتە ئەگەر ڕاست دەکەن ئێوە شوێنی حەق دەکەون و گوێڕایەڵی پێغەمبەرانن.

دوای ئەمە خوای گەورە دڵنەوایی پێغەمبەرەکەی دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾﴾، واتە بەدرۆدا خستنەوەت لەلا یەن ئەوانەوە نەت ترسێنێت، چونکە پێغەمبەرانی پێش تۆ نموونەن بۆ تۆ، ئەو پێغەمبەرانەی کە بەڵگەو نیشانەی گومان هەڵنەگرو یەکلایی کەرەوەیان پێ بوو بەڵام ئەوان هەر بڕوایان پێ نەهێنان و بەدرۆیاندا دەخستنەوە ﴿وَٱلزُّبُرِ﴾، بریتیە لەو کتێبانەی لە ئاسمانەوە وەرگیراون و دابەزیونەتە سەر پێغەمبەران ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾، واتە روون و ئاشکراو دیار.

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ لَتُبْلَوُنَّ فِيٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًاۚ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾

خوای گەورە هەواڵێكی گشتی ڕادەگەیەنێت، هەموو بەدیهێنراوەكان دەگرێتەوە، ئەویش ئەوەیە كە: هەموو خاوەن نەفسێك مردن دەچێژێت، وەك لەم ئایەتەی تردا دەفەرموێت ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾ [الرحمن: ٢٦ ـ ٢٧] تەنها پەروەردگارە كە هەمیشە زیندووەو نامرێت، مرۆڤ و جنۆكەكان هەرهەموویان دەمردن، بەهەمان شێوە فریشتەكان و هەڵگرانی عەرشی پەروەردگاریش دەمرن، بە تەنها و تەنها پەروەردگاری باڵا دەست و خاوەن هێز دەمێنێتەوەو، مانەوە هەربۆئەوە، خوا كۆتایە هەروەك چۆن سەرەتایە.

ئەم ئایەتە دڵنەوایی هەموو خەڵكیشی تێدایە، چونكە هیچ یەكێك نامێنێت لەسەر زەوی كە نەمرێت، كاتێكیش ماوەكە تەواو بوو، هەموو ئەو تۆوانەی خوای گەورە لە پشتی ئادەمدا بڕیاری دابوو بێنە دنیاوە هاتن و، هەموو گیانەوەرانی تریش هاتن و تەواو بوون، ئەوكاتە پەروەردار قیامەت هەڵدەسێنێت و، پاداشتی بەدیهێنراوەكانی لەسەر كردەوەكانیان دەداتەوە بە چاك و خراپیەوە، بە كەم و زۆریەوە، بە گەورەو بچوكیەوە، هیچ كەس هێندەی مسقاڵە زەڕەیەك ستەمی لێ ناكرێت، لەبەرئەمە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۖ﴾.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: باوكم بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولعەزیزی ئاویسیەوە، لە عەلی كوڕی ئەبی عەلی لەهیبەوە، لە جەعفەری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەلی كوڕی حسەینەوە، لە باوكیەوە، لە عەلی كوڕی ئەبی تالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: كاتێك پێغەمبەری خوا وەفاتی كردو تەعزیە دانرا، كەسێك هات كە دەنگیان دەبیست بەڵام شێوەیان نەدەبینی،

وتی: السلام عليكم يا أهل البيت ورحمه الله وبركاته، ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾. بەڕاستی خوای گەورە لە هەموو بەڵاو موسیبەتێکدا دڵنەوایی داناوە، دەسکەوتێکی داناوە، کەواتە ئێوە متمانەتان بە پەروەردگار هەبێت و تەنها لەو بپاڕێنەوە، چونکە بەڵاو موسیبەتدار کەسێکە لە پاداشت بێ بەش بێت، و السلام علیکم ورحمه الله وبرکاته. جەعفەری کوڕی موحەممەد دەڵێت: باوکم بۆی گێڕامەوە کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: دەزانن ئەمە کێ بوو؟ ئەمە (خضر) بوو (سڵاوی خوای لێ بێت).

دواتر فەرمووی: ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾، واتە هەرکەس لە ئاگر بەدوربوو، لێی رزگار بوو، چوویە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی بردویەتیەوە.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەنسارییەوە، لە عەمری کوڕی عەلقەمەوە، لە ئەبی سەلەمەوە، لەئەبو هورەیرەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (جێ قامچیەك لە بەهەشتدا باشترە لە دنیاو لەوەی لە دنیادایە، ئەگەر ویستتان ئەمە بخوێننەوە ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾). ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا چەسپاوە، نە بەمشێوەیە و، نە بەو زیادەیەشەوە.

ئەبو حاتەمیش بەبێ ئەم زیادەیە گێڕاویەتیەوە، هەروەها ئیبن حەبان لە سەحیحەکەی و حاکم لە موستەدرەکەکەیدا، وە لە فەرموودەی ئەم موحەممەدی کوڕی عەمرەوە، ئیبن مەردەویەش بە شێوازێکی تر گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی یەحیاوە، حەمیدی کوڕی مەسعەدە هەواڵی پێداین، لە عەمری کوڕی عەلییەوە لە ئەبی حازەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (جێ قامچی کەسێکتان لە بەهەشتدا باشترە لە دنیاو لەوەی کە تیایدایە) دەڵێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾.

پێشتریش لە ئایەتی ﴿وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢] دا

باسمان کرد کە ئیمام ئەحمەد لە وەکیعی کوڕی جەراحەوە، لە ئەعمەشەوە، لە یەزیدی کوڕی وەهەبەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبد ڕەبولکەعبەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە، گێڕاویەتیەوەو، دەڵێت: پێغەمبەرە خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس پێی خۆشە لە ئاگر دەربازی ببێت و بچێتە بەهەشتەوە با کاتێك مەرگ یەخەی دەگرێت بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت و، ئەوە بدات بە خەڵکی کە پێی خۆشە خەڵکی بۆی بهێنن).

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾ بچوك کردنەوەی نرخی دنیایە، سوك سەیرکردنی خۆشیەکانیەتی، کە نزم و بڕاوەیە، کەم و کۆتایی پێهاتووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٦﴾ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٧﴾﴾ [الأعلى: ١٦ ـ ١٧].

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَاۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓۚ﴾ [القصص: ٦٠]. لە فەرموودەشدا هاتووە (سوێند بەخوا دنیا لە چاو قیامەتدا هیچ نیە جگە لە وێنەی کەسێکتان کە پەنجەی دەخاتە نێو دەریایەکەوەو دەڕوانێت بزانێت چەندە ئاوی لەگەڵ خۆی دەرهێناوە) قەتادە سەبارەت بە ئایەتە ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾ وتویەتی: بریتیە لە تاموچێژێکی واز لێ هێنراو کە نزیکە - سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە - کە بتوێتەوەو نەمێنێت لە دەستی خاوەنەکەیدا، لەم تاموژێژو شتە کەمە بەشی خۆتان ببەن لە گوێڕایەڵی پەروەردگار ئەگەر توانیتان، هیچ هێزێکیش نییە تەنها لای خواوە نەبێت.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت ﴿لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ﴾ وەك ئـەم ئـایـەتـەیـە: ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ﴾ [البقرة: ١٥٥] تا کۆتایی دوو ئایەتەکە. واتە پێویستە مرۆڤی موسڵمان تاقی بکرێتەوە لە بەشێك لە سامانەکەی یان خۆی یان منداڵەکانی یان کەسوکارەکەیدا، ئیمانداریش بەپێی ئاستی ئیمانەکەی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر ئاینەکەی پتەو و دامەزراو بێت، بەڵاو ناڕەحەتیەکانی زیاد دەکات ﴿وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ﴾

خوای گەورە بە ئیمانداران دەفەرموێت لەکاتی چونە مەدینەیان پێش رووداوی بەدر بۆ دڵنەوایی دانەوەیان لەسەر ئەو ئازارانەی لەلایەن جولەکەکان و بت پەرستەکانەوە بەسەریاندا هات، فەرمانیشیان پێدەکات بە چاوپۆشی و ئارامگرتن و لێبوردن تا ئەوکاتەی خوای گەورە دەرگای خێرو خۆشیان لێ دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾. ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو یەمانەوە، لە شوعەیبی کوڕی ئەبی حەمزەوە، لە زوهەریەوە، لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە، ئوسامەی کوڕی زەید هەواڵی پێداوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) و هاوەڵەکانی دەبوران لە بت پەرستەکان و جولەکەکان وەك چۆن قورئان فەرمانی پێکردبوون، بەهەمان شێوە لەسەر ئازارەکانیان ئارامییان دەگرت، خوای گەورە فەرمووی ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا﴾ دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) تا ئەوپەڕی لێیان دەبوراو عەفوی دەکردن تا ئەوکاتەی خوای گەورە روخسەتی پێدا کە لەسەر کردەوەخراپەکانیان سزایان بدات، بەمشێوە بە کورتی باسی کردووە.

بەڵام بوخاری بە دوورودرێژی لەکاتی تەفسیری ئەم ئایەتەدا باسی کردووە، دەڵێت: ئەبو یەمان بۆی گێڕاینەوە، لە شوعەیبەوە، لە زوهەریەوە، لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە، لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە، بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) سواری گوێ درێژێك بوو کە پارچە قوماشێکی بەسەر پشتەوە بوو، ئوسامەی کوڕی زەیدیشی لەدوای خۆیەوە سوارکردبوو، سەعدی کوڕی عوبادە لە هۆزی بەنی حارسی کوڕی خەزرەجەوە دەگەڕایەوە لە پێش رووداوی بەدردا، دەڵێت: رۆشت تاکو تێپەڕی بەلای کۆڕێکدا کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی تێدابوو، ئەمەش پێش ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی موسڵمان بونی راگەیەنێت، لە کۆڕو مەجلیسەکەدا هەموو جۆرێکی تێدابوو لە موسڵمان و بت پەرست و جولەکەو گاور، لە مەجلیسەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی تێدابوو، کاتێك مەجلیسەکە تەواو بوو، ئاژەڵێك تەپوتۆزی کرد بەسەریدا، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە

عەباکەی لوتی گرت و وتی: تەپوتۆز مەکەن بەسەرماندا، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) سەلامی کرد و، پاشان وەستاو دابەزی و، بانگی کردن بۆلای خوای گەورەو قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی وتی: ئەی پیاو، ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت حەق بێت ئەوە لەوە چاکتر نیە بەلام لەم مەجلیسەماندا ئازارمان مەدە و، بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆت، هەرکەس هات بۆلات بۆی باس بکە، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا قسەکانتمان بۆ بکە لە کۆڕوکۆبوونەوەکانماندا، چونکە ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە، ئیتر موسڵمان و بت پەرست و جولەکەکان کەوتنە قسە وتن تاکو گەشتە ئەوەی هەڵچوون و تورە بوون، بەردەوام پێغەمبەری خواش بێدەنگی دەکردن تاکو بە تەواوی بێدەنگ بوون، پاشان پێغەمبەر سواری ولاغەکەی بوو رۆشت تا گەشتە لای سەعدی کوڕی عوبادەو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (ئەی سەعد ئایا ئەوەت نەبیست کە ئەبو حەباب وتی؟) مەبەستی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بوو، ئەوەو ئەوەی وت، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بیبەخشەو چاوپۆشی لێ بکە، سوێند بەو خوایەی قورئانی بۆسەر تۆ ناردۆتە خوارەوە خوای گەورە ئەوەی بۆ سەر تۆ ناردوویەتیە خوارەوە هەمووی حەقە، خەڵکی ئەم نیوەو دورگەیەش ڕێکەوتون لەسەر ئەوەی کە تاجی لەسەر بنێن و دەستەو تاقمێکی بۆ دروست بکەن، بەلام کاتێك خوای گەورە بەو حەقەی کە بەخشی بەتۆ ئەمەی بەرپەرچدایەوە، بەمە رووناك بوویەوە، ئەوە ئەوەیە کە رەفتاری پێ کردو تۆ بینیت، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) لێی خۆش بوو، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) و هاوەڵەکانی لەسەر داواو فەرمانی قورئان لە بت پەرست و جولەکەکان خۆش دەبوون و لەسەر ئازارەکانیان ئارامیان دەگرت، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا﴾ هەموو ئایەتەکە، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ﴾ [البقرة: ١٠٩] ئایەتەکە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) چاوپۆشی دەکردە کاری یەکەمی

و تیایدا ڕۆ دەچوو لەبەر فەرمانی پەروەردگاری کە فەرمانی بەوە پێکردبوو تا ئەوکاتەی مۆڵەتی پێدا کە لەسەر کارە خراپەکانیان سزایان بدات، کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) جەنگی بەدری کرد و، خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە سەرانی بت پەرستانی قورەیشی کوشت، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و ئەوانەی لەگەڵیدابوون لە بت پەرست و هاوەڵ پەیداکەرەکان وتیان: ئەمە کارێکە جێگەی سەرنجە بڕۆن پەیمان بە پێغەمبەری خوا بدەن لەسەر ئیسلام و موسڵمان بن.

بەڕاستی هەرکەس هەستا بە چەسپاندنی حەق یان فەرمانکردن بە چاکە، یاخود بەرگریکردن لە خراپە ئەوە بەدڵنیاییەوە ئازار دەدرێت و پێویستە دەرمانی ئارامگرتن بەکار بهێنێت لەبەر ڕەزامەندی خوا، وە پێویستە پشت بە خوا ببەستێت و داوای هاوکاری لێ بکات و بگەڕێتەوە بۆلای ئەو (جل جلاله).

﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ
فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾
لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا
تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾﴾

ئەمە سەرزەنشت کردن و هەڕەشەکردنە لای پەروەدگارەوە بۆ شوێنکەوتەی کتێبە پێشینەکان ئەوانەی خوای گەورە لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکان پەیمانی لێ وەرگرتن کە بڕوا بە موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) بهێنن و، ناوی ئەو موحەممەدە لەناو خەڵکیدا باس بکەن و بڵاوی بکەنەوە، تاکو خەڵکی کە ئامادەبن بۆ کاتی هاتنەکەو هەرکات خوای گەورە ناردی شوێنی بکەون، بەڵام ئەوان ئەمەیان شاردەوەو لە بەرامبەر دنیاو دەستکەوتە نزمەکانیدا ئەو پاداشتەی کە پەیمانیان پێدرابوو لە دنیاو قیامەتدا لە دەستی خۆیان دا، گۆڕیانەوە بە دەسکەوتێکی دنیایی بێ نرخ، بەڕاستی خراپترین بازرگانی و ئاڵوگۆڕیان کرد، بەڕاستی خراپترین بەیعەتیان دا، خراپترین بەیعەت و بازرگانی ئەوەی ئەوان

بوو. لەمەدا ئاگادارکردنەوەی زانایانیشی تێدایە کە بەو ڕێگەو ڕێبازەی ئەواندا نەڕۆن تاکو ڕوبەڕووی هەمان سەرەنجام نەبنەوە، پێویستە لەسەر زانایان هێندەی لە توانایاندایە زانست و زانیاری بگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە، چونکە ئەو کەسەی ڕێنومایی دەکات بۆ خێرو چاکە وەك ئەو کەسە وایە کە چاکەکە دەکات، نابێت هیچ شتێك بشارنەوە، چونکە فەرموودە هەیە کە لەچەند ڕێگایەکی جیاجیاوە ریوایەت کراوە لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (هەرکەس سەبارەت بە زانستێك پرسیاری لێ کراو شاردیەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بە لەغاوی ئاگرین لەغاو دەکرێت).

پاشان دەفەرموێت ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ مەبەستی لەو ڕووپاماکارانەیە کە وایان نیشاندەدا کاری زۆریان کردووە ئەوەشی نەیان کردبوو بەکاری خۆیان دەیانخستەڕوو، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەرکەس بانگەواز و ئیدعایەکی درۆ بکات تا خۆی پێ گەورەو کارەکانی پێ زیاد بکات، ئەوە خوای گەورە جگە لە بچوکی و کەمی هیچی تری پێ نابەخشێت). هەروەها لە سەحیح دا هاتووە: (ئەوکەسەی تێرە بەوەی پێی نەدراوە، وەك ئەو کەسەیە کە جلءبەرگی درۆی لەبەردایە).

ئیمام ئەحمەد دەڵێت: حەجاج بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبن جورەیجەوە، لە ئیبن ئوبەی مەلیکەوە، کە حەمیدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هەواڵی پێداوە، کە مەروان وتویەتی بە دەرگاوانەکەی: ئەی ڕافیع بڕۆ بۆلای ئیبن عەباس و پێی بڵێ: ئەگەر هەرکەسێك لە ئێمە ئەشکەنجە بدرێت لەسەرئەوەی پێی خۆشە سوپاس بکرێت لەسەر کارێك کە نەیکردووەو لەسەرئەوەی بۆی هاتووە ئەوە هەرهەموومان ئەشکەنجە دەدرێین. ئیبن عەباس وتی: ئێوە و ئەوە دوورن لەیەك، چونکە ئەو ئایەتە لەسەر ئەهلی کیتاب هاتە خوارەوە، پاشان ئیبن عەباس ئایەتەکەی خوێندەوە ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ ئایەتەکە. ئیبن عەباس وتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ

پێشت) سەبارەت بە شتێك پرسیاری لێکردن، بەڵام ئەوان لێیان شاردەوەو بە کەسی تری جگە لەویان وت، پاشان چونە دەرەوە وایان نیشاندا کە وەڵامی پرسیارەکەیان داوەتەوەو ئەوەی ویستویەتی پێیان وتووە، بەمە ستایش و سوپاسیان لەسەری وەرگرت، لەکاتێکدا دڵخۆش بوون بەوەی کە شتەکەیان لە پێغەمبەر شاردەوەو وەڵامیان نەدایەوە.

بوخاری بەمشێوەیە لە تەفسیردا گێڕاویەتیەوە، موسلیم و ترمزی و نەسائیش لە تەفسیرەکەیاندا، ئیبن حاتم و ئیبن جەریرو حاکم لە موستەدرەکەکەیدا، لەگەڵ ئیبن مەردەویەدا، هەرهەموویان لە فەرموودەی عەبدولمەلیکی کوڕی جورەیجەوە، هاوشێوەی ئەوەیان گێڕاوەتەوە و بەهەمان شێوە بوخاریش لە فەرموودەی ئیبن جورەیجەوە، لە ئیبن ئەبی مەلیکەوە، لە عەلقەمەی کوڕی وەقاسەوە، گێڕاویەتیەوە، کە مەروان بەدەرگاوانەکەی وتووە. ئەی رافیع بڕۆ بۆلای ئیبن عەباس، ئاوا باسی کرد.

بوخاری دەڵێ: سەعیدی کوڕی ئەبی مەریەم بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی جەعفەرەوە، لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە عەتای کوڕی یەسارەوە، لە ئەبی سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە: کۆمەڵێك پیاو لە دووڕووەکان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێ بێت) ئەگەر پێغەمبەر دەربچوایە بۆ جیهاد ئەوان خۆیان دوادەخست و بەجێ دەمان، زۆریش دڵخۆش دەبوون بەم بەجێ مانەیان لە پێغەمبەری خوا، کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لە جەنگەکە دەگەڕایەوە بیانویان بۆ دەهێنایەوەو سوێندیان بۆ دەخوارد، پێیان خۆش بوو لەسەر شتێك سوپاس بکرێن کە نەیان کردبوو، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾ ئایەتەکە. بەهەمان شێوە موسلیم لەفەرموودەی ئیبن ئەبی مەریەمەوە هاوشێوەی ئەمەی گێڕاوەتەوە.

ئیبن مەردەویەش لە تەفسیرەکەیداو، لە فەرموودەی لەیسی کوڕی سەعدەوە، لە هیشامی کوڕی سەعدەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە گێڕاویەتیەوە، دەڵێت: ئەبو سەعید و رافیعی کوڕی خودەیج و زەیدی کوڕی سابت لای مەروان بوون، وتی: ئەی ئەبا سەعید ئەم فەرموودەیەی

پەروەردگارت بینیوە: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ لەکاتێکدا ئێمە دڵخۆشین بەوەی پێمان دراوە و پێمان خۆشە سوپاس بکرێین لەسەر ئەوەی نەمانکردووە؟ ئەبو سەعید وتی: ئەمە لەوە نیە، بەڵکو ئەوە مەبەستی کۆمەڵێك لە دووڕووەکانە کە لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دوادەکەوتن ئەگەر پێغەمبەر سوپاسی بکردایە، جا ئەگەر موسڵمانان بەڵاو شکستیان بەسەردا بهاتایە بەدواکەوتنەکەیان دڵخۆش دەبوون بە مانەوەو بەجێمانیان لە پێغەمبەری خوا، وە ئەگەر لەلایەن خواوە سەرکەوتن و کرانەوەیان بۆ ببوایە ئەوا سوێندیان بۆ پێغەمبەرو موسڵمانان دەخوارد تاکو ڕازیان بکەن و لەسەر دڵخۆشیەکەیان بەسەرکەوتنی موسڵمانان سوپاسیان بکەن، مەروان وتی: ئەمە لە کوێ و ئەوە لەکوێ؟ ئەبو سەعید وتی: ئەمەش ئەوە دەزانێت؟ مەروان وتی: ئایا بەو شێوە نیە ئەی زەید؟ وتی: بەڵێ، ئەبو سەعید ڕاستی کرد، پاشان ئەبو سەعید وتی: ئەمەش ئەوە دەزانێت - واتە ڕافیعی کوڕی خودەیج - بەڵام دەترسێت ئەگەر هەواڵی پێ بدایتایە کە دەست بگرتایەتەوە لە خێرو بەخشیندا، کاتێك ڕۆشتنە دەرەوە زەید بە ئەبو سەعیدی خودری وت: ئایا سوپاسم ناکەیت لەسەر ئەوەی بۆم گێڕایتەوە، ئەبو سەعید وتی: ڕاستیت ڕون کردەوەو وتت. زەید وتی: ئایا لەسەرئەوەی حەق و ڕاستیم وتووە سوپاسم ناکەیت؟

پاشان ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی مالیکەوە، لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە ڕافیعی کوڕی خودەیجەوە، کە: ئەوو زەیدی کوڕی سابت لای مەروانی کوڕی حەکەم بوون لەکاتێکدا مەروان ئەمیری مەیدنە بوو، مەروان وتی: ئەی ڕافیع، ئەم ئایەتە سەبارەت بە چی هاتە خوارەوە؟ ئەویش بۆی باسکرد وەك پێشتر لە ئەبو سەعیدەوە گێڕامانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) مەروان دوای ئەمە ناردی بۆلای ئیبن عەباس و پرسیاری لێکرد، وەك پێشتر باسکرا، ئەویش ئەوەی پێ وت کە باسمان کرد. هیچ ناکۆکیەك نیە لەنێوان ئەوەی ئیبن عەباس باسی کردووە لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسانە باسیان کردووە، چونکە ئایەتەکە گشتییە سەبارەت بە هەموو ئەوەی کە باسکرا. خوای گەورە زاناترە.

هەروەها ئیبن مەردەویە لەفەرموودەی موحەممەدی کوڕی ئەبی عەتیق و

موسای کوڕی عوتبەوە دەگێڕێتەوە، لە زوهەریەوە، لە موحەممەدی کوڕی سابتی ئەنساریەوە، کە سابتی کوڕی قەیسی ئەنساری وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا ترساوم لەوەی تیاچوویم، فەرمووی: (بۆچی؟) وتی: خوای گەورە قەدەغەی کردووە مرۆڤ پێی خۆش بێت لەسەر شتێك سوپاس بکرێت کە نەیکردبێت بەڵام ئەوەتە دەمبینی من سوپاسکردنم پێ خۆشە، هەروەها خوای گەورە خۆ بەزلزانین و کەش و فشی قەدەغە کردووە ئەوەتە دەمبینی حەزم لە جوانیە، هەروەها خوای گەورە قەدەغەی کردووە دەنگمان بەسەر دەنگی تۆدا بەرز بکەینەوە بەڵام من مرۆڤێکی دەنگ بەرزم، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا رازی دەبیت بە سوپاسکراوی بژیت و، بە شەهیدی بمریت و، بچیتە بەهەشتەوە؟) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. ئەوەبوو بە سوپاس کراوی ژیاو لە ڕۆژی موسەیلەمەی درۆزندا بە شەهیدی مرد.

دواتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ﴾ واتە: وا حساب نەکەن ئەوان رزگاریان بووە لە ئەشکەنجەو براوەن، بەڵکو دەبێت بیچەژن و بچنە ناوی، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ دواتر فەرمووی: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾﴾، واتە خوا خاوەنی هەموو شتێکەو، دەسەڵاتدارە بەسەر هەمووشتێکداو، هیچ لەژێر دەستی دەرناچێت و، کەواتە لێی بترسن و سەرپێچی مەکەن، خۆتان لە رق و قین و تۆڵەسەندنەوەی بپارێزن چونکە ئەو ئەو مەزنەیە کە هیچ لەو مەزنتر نیە، ئەو بە دەسەڵات و زاڵە و هیچ لەو بە دەسەڵات و زاڵتر نیە.

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى
ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ
وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ
فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ وَمَا
لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ

ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا
مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ
إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾

تەبەرانی دەڵێت: حسەینی کوڕی ئیسحاقی تەسەتوری بۆی گێڕاینەوە، لە یەعقوبی قومیەوە، لە جەعفەری کوڕی ئەبی موغیرەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە، وتی: قورەیش هاتن بۆلای جولەکەو وتیان: موسا چی بۆ هێناون؟ وتیان: گۆچانەکەی و دەستە سپیەکانی کە هەموو کەس دەیانبینی، ڕۆشتن بۆلای گاورەکان و پێیان ووتن: عیسا چۆن بوو؟ وتیان: ئەو نابیناو گەڕو بەڵەکاوی چاك دەکردەوەو، مردووی زیندو دەکردەوە. ڕۆشتن بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) و وتیان: داوا لە خوا بکە کە (سەفا)مان بۆ بکات بە ئاڵتون، ئەویش لە پەروەردگار پاڕایەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾، بڕۆن بیر لەوە بکەنەوە.

ئەمە گومان دروست دەکات، چونکە ئەم ئایەتە لە مەدینە هاتۆتە خوار، داوای ئەوانیش کە سەفا بکات بە ئاڵتون لە مەککە بوو، خوای گەورە زاناترە. بەڵام واتای ئایەتەکە ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، واتە لە فراوانی و بەرزیەکەیدا، لە نزمی و چڕی و پڕیەکەیدا، لەوەی کە تیایدایەو دەبینرێت وەك هەسارە گەڕۆکەکان و، ئاژەڵ و کانزاکان و، هەموو شتە سودبەخشە فرە ڕەنگ و فرە بۆن و تام و تایبەتمەندیەکان، ﴿وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾، واتە بەدوای یەکدا هاتنیان و کورت و درێژ بونەوەیان، جارێك ڕۆژ درێژ دەبێت و شەو کورت دەبێتەوە، جارێك بە پێچەوانەوە، جارێکی تر یەکسان دەبن، ئەمەش بەردەوام ڕو دەدات. ئەم لەو دەبات درێژ دەبێت و ئەو لەم دەبات کورت دەبێتەوە، هەموو ئەمانەش بە بڕیارو نەخشەی پەروەردگاری بەدەسەڵات و زانایە، لەبەرئەوە فەرمووی ﴿لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾، واتە خاوەن عەقڵ تەواو و ژیرەکان کەشتەکان لەسەر ڕونی و دیاری خۆیان هەست پێدەکەن و، وەك کەڕولاڵەکان نین ئەوانەی کە بیر

ناکەنەوەو ژیری بەکارناهێنن، ئەوانەی خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾﴾ [یوسف: ١٠٥ ـ ١٠٦]. پاشا خوای گەورە وەسفی خاوەن ژیریەکان دەکات، دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ﴾. هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا چەسپاوە لە عیمرانی کوڕی حەسینەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەت توانی بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەتتوانی بە راکشانەوە) کەواتە یادی خوا ناپچڕێنین لە هەموو بارودۆخێکیاندا لە نهێنی و ئاشکرایانداو لەناو ناخ و لە سەر زوبانیاندا، ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، واتە تێدەگەن لەو داناییەی کە تیایداو هەمووی بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و مەزنی پەروەردگارو هێزو دەسەڵات و زانیاری و دانایی و هەڵبژاردن و رەحمەتی ئەو.

شێخ ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت: من کە لە ماڵم دەردەچم چاوم بکەوێتە سەر هەرشتێك ئەوا تیایدا نیعمەتێکی خوا دەبینم لەسەرم و پەندێکی تێدا دەبینم بۆ خۆم، ئیبن ئەبی دنیا لە کتێبی (التوكل والاعتبار)دا ریوایەتی کردووە، لە حەسەنی بەسریشەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: بیرکردنەوەی سەعاتێك باشترە لە شەونوێژی شەوێك، خوزەلیش دەڵێت: حەسەن وتی: بیرکردنەوە ئاوێنەیە چاکەو خراپەکانی خۆت نیشان دەدات. سوفیانی کوڕی عویینەش دەڵێت: بیرکردنەوە نورێکە دەچێتە دڵتەوە، دەگونجێت نموونەی بەم دێڕە شیعرە هێنابێتەوە (المتقارب):

إذا المـرء كـانـت لـه فـكْـرَةٌ

فـفـي كـلِّ شـيء لـه عـبـرَةٌ

لە عیساوە (دروودی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە، وتویەتی: سەر فرازی بۆ ئەوکەسەی قسەکردنی بیرخستنەوە بێت و بێدەنگ بوونی بیرکردنەوە بێت و، روانینی پەند وەرگرتن بێت. لوقمانی حەکیمیش دەڵێت: زۆر بە تەنیایی مانەوە سەرچاوەی فیکرەو بیکردنەوەیە، زۆر بیرکردنەوەش بەڵگەی لێدانە لە دەرگای بەهەشت. وەهەبی کوڕی مونەبیهیش وتویەتی: بیرکردنەوەی مرۆڤێك درێژەی نەکێشاوە کە تێنەگەشتبێت، هەرگیز مرۆڤێك تێنەگەشتووە کە شارەزا نەبووبێت،

هەرگیز مرۆڤێك شارەزا نەبووە کە کاری نەکردبێت. عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش دەڵێت: قسە کردن بە یادی پەروەردگاری باڵا دەست چاکە، بیرکردنەوەش لە نیعمەتەکانی خوای گەورە باشترین بەندایەتیە.

موغیسی ئەسوەدیش دەڵێت: هەموو ڕۆژێك سەردانی گۆرستان بکەن بیرتان پێ دەکاتەوە، هەڵوێستەکەش بە دڵتان ببینن، بشڕوانن بۆ هەردوو کۆمەڵەکە کە جیابوونەتەوە بۆ بەهەشت و بۆ دۆزەخ، بە دڵ و جەستەشتان هەست بە ئاگرو ئازارو سوتاندنەکانی بکەن. لەم کاتەدا دەستی بەگریان دەکردو فێی لێ دەهات و بەو جۆرە لەناو هاوەڵەکانیدا هەڵدەستا کە ژێری دەڕۆشت و نەدەما. عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەڵێت: پیاوێك بەلای ڕاهیبێك دا ڕۆشت کەلای گۆڕستان و زبڵدانێکدا بوو، پێی وت: ئەی ڕاهیب، تۆ دوو گەنجینە لە گەنجینەکانی دنیات لایە کە پەندو ئامۆژگاریان تێدایە: گەنجینەی پیاوان و، گەنجینەی سەروەت و سامان، هەروەها لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕنەوە کە: هەرکات بیویستایە دڵی بە ئاگابێنێتەوە دەچووە بەردەمی خانویەکی روخاوو یان شوێنێکی کاول و خاپورو لەسەر دەرگاکەی دەوەستا و بە دەنگێکی مەلولەوە بانگی دەکرد و، دەیوت: کوا کەس و کارەکەت؟ پاشان دەگەڕایەوە بۆ دەروونی خۆی و دەیوت: ﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ﴾ [القصص: ٨٨].

هەروەها لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: دووركاتی ئامانجدار لە بیرکردنەوەدا، باشترە لە هەستانی شەوێك بە دڵێکی بێ ئاگاوە. حەسەنی بەسری دەڵێت: ئەی ئادەمیزاد، بخۆ لە سێ یەکی سکتا، بخۆرەوە لە سێ یەکەکەی تردا، سێ یەکی کۆتایی دابنێ بۆ هەناسەدان بۆ بیرکردنەوە. هەندێك لە دانایان وتویانە: هەرکەس بۆ دنیا بڕوات بەبێ پەند وەرگرتن، بینی دڵی بەهێندەی ئەو بێ ئاگاییە کز دەبێت. بیشری کوڕی حارسی حامنی دەڵێت: ئەگەر خەڵکی بیریان لە گەورەیی و مەزنی خوا بکردایەتەوە سەرپێچیان نەدەکرد. حەسەنیش لە عامری کوڕی عەبدولقەیسەوە دەڵێت: وتی: بیستم لە زیاتر لە کەسێك و دوکەس و سی کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) دەیان وت: روناکی یان ڕۆشنایی ئیمان بیرکردنەوەیە.

لە عیساوە (دروودی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە، وتویەتی: ئەی ئادەمیزادی

لاواز لە هەرکوێ هەیت لەخوا بترسەو سنوری بەرنامەی خوا بپارێزە لە دنیادا وەك میوان وابە، مزگەوتەکان بکە بە مالأ و، چاوەکانت فێری گریان بکەو، لاشەت فێری ئارامگرتن و، دڵت فێری بیکردنەوەو، گرنگی بە رزقی سبەینێ مەدە...

هەروەها لە ئەمیری موسڵمانان عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە دەگێڕنەوە، ڕۆژێکیان لەنێو هاوەڵەکانیدا گریاوە، سەبارەت بە هۆکەی پرسیاری لێکرا، وتی: بیرم لە دنیاو تاموچێژو ئارەزواتەکانی کردەوە، هەربەوانە پەندم لێیان وەرگرت ئەوەتە ئارەزووەکان هێشتا تەواو نەبوون دەشێوێن و تاڵیەکانیان بەدوایاندا دێت، جا ئەگەر پەند و ئامۆژگاری تێدا نیە بۆ کەسێك کە پەند وەرگرێت، ئەوا ئامۆژگاری تێدایە بۆ کەسێك کە تێك دەشکێت. (ادکر):

ئیبن ئەبی دنیاش دەڵێت: حسەینی کوڕی عەبدولڕەحمان ئەم سرودەی بۆ خوێندمەوە:

نُـزْهَـةُ الـمـؤمـن الـفِـكَـرْ
لَـذَّةُ الـمـؤمـن الـعِـبَـرْ
نـحـمـدُ الله وَحْـدَه
نَـحْـنُ كـل عَـلَـى خَـطَـرْ
رُبَّ لاهٍ وعُـمْـرُه
قـد تَـقَـضَّـى ومـا شَـعَـرْ
رُبَّ عـيـشٍ قَـدْ كـانَ فـو
قَ الـمُـنَـى مُـونـقَ الـزَّهَـرْ
فـي خَـرِيـر مـن الـعُـيـو
ن وظِـلٍ مـن الـشَّـجَـرْ
وسُـرُورٍ مـن الـنَّـبـا
تِ وطِـيـبٍ مـنَ الـثَّـمَـرْ
غَـيَّـرَتْـه وَأَهْـلَـهُ
سُـرعـةُ الـدَّهْـر بـالـغِـيَـرْ

نَـــحْـــمَـــدُ الله وَحْـــدَه

إنَّ فـــي ذا لَـــمُـــعْـــتَـــبَـــرْ

إنَّ فـــي ذا لَـــعـــبـــرةً

لِـــلـــبـــيـــبٍ إنِ اعْـــتَـــبَـــرْ

ئەوەتە خوای گەورە بە خراپە باسی ئەو کەسانە دەکات کە پەند وەرناگرن لەو بەدیهێنراوانەی کە هەموویان بەڵگەن لەسەر زات و سیفات و دەسەڵات و بەرنامەو ئایەتەکانی پەروەردگار، دەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾﴾ [يوسف: ١٠٥ ـ ١٠٦]، لە بەرامبەردا ستایش و وەسفی بەندە ئامانجدارەکانی دەکات و دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ دەڵێـن ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا﴾ واتە ئەم بەدیهێنراوەت بێ هودە بەدی نەهێناوە، بەڵکو بەحەق و ڕەوایەتی، تاکو پاداشتی خراپەکاران بدەیتەوە بە کردارەکانیان و، پاداشتی چاکەکارانیش بدەیتەوە بە باشتر لە کردارەکانیان، دواتر پاك و بێگەردی بۆ خوا بڕیاردەدەن لەوەی بێ هودە بەدیهێنراوەکانی بەدی ناهێنێت و دەڵێن (سبحانك) واتە ئەی ئەو کەسەی بەدیهێنراوەکانت بە حەق و دادپەروەری بەدیهێنا، ئەی ئەو کەسەی بێگەردو دوریت لە هەموو کەموکوڕی و ناتەواویەك و بێ هودەییەك، بە دەسەڵات و هێزی خۆت بمان پارێزە لە ئاگری دۆزەخ و یارمەتیمان بدە بۆ ئەو کارانەی بەهۆیەوە لێمان ڕازی دەبیت، تەوفیقمان بدە بۆ ئەو کارە چاکانەی ڕێنومایمان دەکەن بەرەو بەهەشتی پڕ لە نازو نعمەت و بەهۆیەوە دەمانپارێزێت لە ئەشکەنجەی بە ئازار.

دواتر وتیان ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ﴾، واتە سوکایەتیت پێکردووەو سەرشۆڕیەکەیت بۆ هەموو لایەك دەرخستووە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ واتە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ ڕزگارکەرێکیان نیە لە دەستی تۆ، وە ناتوانن خۆیان لەوە ڕزگار بکەن کە تۆ بڕیاری دەدەیت بۆیان ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ﴾ واتە بانگخوازێك بانگ دەکات بۆ ئیمان، کە پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لێ بێت) ﴿أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا﴾، واتە ئەو

دەڵێت ئیمان بەخوای خۆتان بهێنن و ئێمەش ئیمانمان هێنا، واتە وەلامان دایەوەو شوێنی کەوتین، ئەمەش بە بڕوا داهێنانمان و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەت ﴿رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ واتە دایپۆشە ﴿وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا﴾ لە نێوان ئێمە و تۆدایە ﴿وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ﴾، واتە بمانگەیەنەرەوە بە ئەوەی پیاو چاکان ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ﴾ وتراوە: واتاکەی ئەمەیە: لەسەر بڕواهێنان بە پێغەمبەرەکەت، وە وتراوە: واتاکەی ئەمەیە: لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکەت. ئەمەیان ئاشکراترە.

ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئەبو یەمان بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، لە عەمری کوڕی موحەممەدەوە، لە ئەبی عوقالەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی (عەسقەلان یەکێکە لە دوو بوکەکەو خوای گەورە لەوەوە لە ڕۆژی قیامەتدا حەفتا هەزار زیندوو دەکاتەوە کە حسابیان لەسەر نیە، هەروەها پەنجا هەزار شەهیدی لێوە زیندو دەکاتەوە کە بە وەفد دەچن بۆ خزمەتی پەروەردگار، ڕێزی شەهیدەکانیش هەر لەوێیە کە سەریان بڕاوەو بە دەستیانەوەیە، خوێن بەسەرو ملیانەوەیە، دەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَـٰمَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾ خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکانم ڕاست دەکەن، بە ڕوباری سپی بیان شۆرن، لەو ڕوبارەوە بە پاکی و سپێتی وەك هێلکەوە لێی دێنە دەرەوە، لە بەهەشتدا دەفڕن هەرچۆنێکیان بوێت) ئەم فەرموودەیە لە سەیرو غەریبەکانی مەسنەد دادەنرێت و، هەندێکیان هەر بە مەوزوعی دادەنێن. خوا زاناترە.

﴿وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَـٰمَةِ﴾ واتە لە بەرچاوی هەموو بەدیهێنراوەکاندا ﴿إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾، واتە پێویستە ئەو ڕۆژە وادە پێدراوەبێت کە هەواڵت ڕاگەیاندوە کە بریتیە لە ڕاوەستان لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەردەستی تۆدا، حافز ئەبو یەعلا دەڵێت: حارسی کوڕی سورەیج بۆی گێڕاینەوە، لە موعتەبەرەوە، لە فەزلی کوڕی عیساوە، لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە، کە جابری کوڕی عەبدوڵڵای بۆی گێڕاوەتەوە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (شەرمەزاری و سوکایەتی ئادەمیزاد لەبەردەم پەروەردگاردا لەڕۆژی قیامەتدا

دەگاتە ئاستێك ئەو بەندەیە ئاوات دەخوازێت فەرمانی پێ بکرێت بۆ ناو دۆزەخ) فەرموودەیەکی غەریبە.

ئەوە چەسپاوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) ئەم دە ئایەتەی کۆتایی سورەتی (ئل عمران)ی دەخوێند کاتێك هەڵبستایە بۆ شەونوێژ لە شەودا، بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: سەعیدی کوڕی ئەبی مەریەم بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی جەعفەرەوە، لە شەریکی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی نەمرەوە، لە کورەیبەوە، لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لای مەیمونەی پورم مامەوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) سەعاتێك قسەی لەگەڵ خێزانەکەی کرد و پاشان ڕاکشا، کاتێك سێ یەکی کۆتایی شەو داهات هەستایەوەو ڕوانی بۆ ئاسمان و فەرمووی ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾ ئایەتەکان، پاشان هەستایەوەو دەستنوێژی گرت و دەستی کرد بە نوێژی سوننەت، یانزە ڕکاتی کرد، پاشان بیلال بانگی داو دوو ڕکات نوێژی کرد، دواتر ڕۆشتە دەرەوەو نوێژی بەیانی بۆ خەڵکەکە کرد، هەر بەمشێوەیە موسلیم لە ئەبی بەکری کوڕی ئیسحاقی سەنعانیەوە، لە ئیبن ئەبی مەریەمەوە گێڕاویەتیەوە، هەروەها بوخاری لە ڕێگەی مالیکەوە، لە مەخرەمەی کوڕی سولەیمانەوە، لە کورەیبەوە گێڕاویەتیەوە کە ئیبن عەباس هەواڵی پێداوە لای مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) شەو ماوەتەوە کە پوری بووە، دەڵێت: من لەسەر پانی ڕاخەرەکە ڕاکشام و، پێغەمبەر و هاوسەرەکەشی لەسەر درێژیەکەی ڕاکشان، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) نوست تا نیوەی شەو داهات یان پێش یان دوای نیوەی شەو بە کەمێك، ئیتر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لە خەوەکەی هەستاو بەدەستی خەوی لە دەموچاوی دەسڕی، پاشان ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێند، پاشان هەستایەوە بۆ جەوەنەیەکی هەڵواسراو دەستنوێژی لێ گرت، پاشان هەستایەوەو دەستی کرد بە نوێژ کردن، ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: منیش هەستامەوەو ئەو چی کردبو منیش وامکرد، پاشان ڕۆشتم و چوومە تەنیشتیەوە، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێ بێت) دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم و پاشان دوو

ڕکات و پاشان دوو ڕکات و پاشان دوو ڕکاتی تری کردو دوایی ویتری کرد. پاشان ڕاکشایەوە تاکو بانگ بێژ هات ئیتر هەستایەوەو دوو ڕکات نوێژی کورتی کرد، دواتر ڕۆشتە دەر بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی کرد. هەر بەمشێوەیە ئەوانی تر لە ڕێگەی مالیکەوە گێڕاویانەتەوە. هەروەها موسلیم و ئەبو داودیش لە ڕوویەکی ترەوە لە مەخرەمەی کوڕی سولەیمانەوە گێڕاویانەتەوە.

ڕێگەیەکی تر بۆ ئەم فەرموودەیە: لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت): ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە وتی: موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو یەحیای کوڕی ئەبی مەسەڕەوە، لە خەلادی کوڕی یەحیاوە، لە یونسی کوڕی ئەبی ئیسحاقەوە، لە مەنهالی کوڕی عەمرەوە، لە عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە دەڵێت: عەباس فەرمانی پێکردم شەو لە ماڵی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بمێنمەوەو فێری نوێژەکەی ببم و لەبەری بکەم، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) نوێژی عیشای بە خەڵکە کرد و مایەوە لە مزگەوت تاکو هیچ کەس لە مزگەوتەکەدا نەمایەوە جگە لە خۆی، هەستایەوەو بەلای مندا تێپەڕی و فەرمووی: ئەمە کێیە؟ عەبدوڵلایە؟ وتم: بەڵێ. فەرمووی: (بۆچی لێرەی؟) وتم: عەباس فەرمانی پێکردم ئەمشەو لە ماڵی ئێوە بمێنمەوە. فەرمووی: (بەڕاستی کارێکی چاکە) کاتێك چوویە ژوورەوە، فەرمووی: (جێگە بۆ عەبدوڵلا داخەن). ڕاخەرێکی لە. (سموح) دروست کراویان بۆ هێنا، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) لەسەری نوست تا گوێم لە پرخە پرخی بوو پاشان لەسەر ڕاخەرەکەی ڕێك بویەوەو دانیشت، دەڵێت: سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو فەرمووی: (سبحان ملك القدوس) سێ جار ئەمەی وت، دواتر ئەم ئایەتانەی کۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێند تا تەواو بوون.

موسلیم و ئەبو داود و نەسائیش لە فەرموودەی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە، لە باوکیەوە، فەرموودەیەکیان لەم بارەیەوە گێڕاوەتەوە.

ڕێگەیەکی تر: ئیبن مەردەویە لە فەرموودەی عاسمی کوڕی بەهدەلەوە، لە هەندێك لە هاوەڵانەوە، لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە

ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا شەوێکیان هەندێك لە شەو تێپەڕی کرد ڕۆشتە دەرەوەو بۆ ئاسمانی ڕوانی و ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾ تاکۆتایی سورەتەکە، پاشان فەرمووی: (اللهم اجعل في قلبي نورًا، وفي سمعي نورًا، وفي بصري نورًا، وعن يميني نورًا، وعن شمالي نورًا، ومن بين يديّ نورًا، ومن خَلْفي نورًا، ومن فوقي نورًا، ومن تحتي نورًا، وأعْظِم لي نورًا يوم القيامة) ئەم دوعایە لە هەندێك ڕێگەی سەحیحەوە چەسپاوە لە گێڕانەوەی کورەیبەوە لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)

پاشان ئیبن مەردەویەو ئیبن ئەبی حاتەم لە فەرمودەی جەعفەری کوڕی ئەبی موغیرەوە، لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە ئیبن عەباسەوە گێڕاویانەتەوە، وتویەتی: قورەیش ڕۆشتن بۆلای جولەکەکان و، وتیان: موسا چ بەڵگە نیشانەیەکی هێنا بۆتان؟ وتیان: گۆچانەکەی و هەردوو دەستە سپیەکەی کە بینەران دەیانبینی، پاشان ڕۆشتن بۆلای گاورەکان و وتیان: عیسا لەناو ئێوەدا چۆن بوو؟ وتیان: ئەو کەڕولاڵ و بەڵەك و گەڕی چاك دەکردەوەو مردوی زیندوو دەکردەوە، هاتن بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) و وتیان: داوا لە پەروەدگارت بکە سەفامان بۆ بکاتە ئاڵتون، ئەویش لە خوا پاڕایەوە، ئەم ئایەتە دابەزی ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾ وتی: بابیری تێدا بکەنەوە، ئەمە دەربڕینی ئیبن مەردەویەیە.

پێشتر ئەم فەرموودەیە باسکرا لە گێڕانەوەی تەبەرانی و لە سەرەتای ئایەتەکەدا، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە ئەو ئایەتانە لە مەککە هاتبنە خوارەوە، بەڵام ئەوەی بڵاوە ئەوەیە کە لە مەدینە هاتونەتە خوار، بەڵگەش فەرموودەیەکی ترە، ئیبن مەردەویە دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی عەلی کوڕی ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوە، لە ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی حەرانیەوە، لە شوجاعی کوڕی ئەشرەسەوە، لە حەشرەجی کوڕی نەباتی واسیتی ئەبو مەکرەمەوە، لە کەلەبیەوە کە ئەبو جەنابە، لە عەتاوە، وتویەتی: من و عومەر و عوبەیدی کوڕی عومەیر ڕۆشتین بەرەو لای عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت)، چوینە ژوورەوە بۆلای و لەنێوان ئێمە و ئەودا پەردە هەبوو، وتی: ئەی عوبەید چی ڕێگری لێکردوویت

لە سەردانمان؟ وتم: قسەی شاعیر کە دەڵێت: درەنگ سەردان بکە خۆشەویستیت زیاد دەکات، ئیبن عومەر وتی: واز لەوە بێنین هەواڵمان پێ بدە سەبارەت بە سەیرترین شت کە لە پێغەمبەری خودا بینیبێتت؟. ئەویش گریاو وتی: هەموو فەرمانەکانی سەیر بوون، لە سەرەشەوی خۆمدا هات بۆلام تاکو پێستی بەر پێستم کەوت، پاشان فەرمووی: (روخسەتم دەدەیت بەندایەتی بۆ پەروەردگارم بکەم؟) عائیشە وتی: وتم: سوێند بەخوا نزیکی تۆم پێ خۆشە ـ وەمن پێم خۆشە تۆ پەروەردگارت بپەرستی و، سوجدەی برد و گریا تاکو زەویەکە تەڕبوو، دواتر ڕاکشا لەسەر لایەکی و گریا تا ئەوکاتەی بیلال هات و بانگی نوێژی بەیانی دا، عائیشە دەڵێت: بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی دەگریت لە کاتێکدا خوای گەورە لە تاوانی رابردو داهاتوت خۆش بووە؟ فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ ئەی بیلال، چی ڕێگریم لێ دەکات کە بگریم لە کاتێکدا ئەمشەو ئەم ئایەتەم بۆ دابەزیوە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾) پاشان فەرمووی: (تیاچوون و هاوار بۆ ئەو کەسەی خوێندویەتی و بیری تێدا نەکردۆتەوە).

هەروەها عەبدی کوڕی حەمید لە تەفسیرەکەیدا لە جەعفەری کوڕی عەونەوە، لە ئەبی جەنابی کەلبیەوە، لە عەتاوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من و عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عوبەیدی کوڕی عومەیر ڕۆشتینە ژورەوە بۆلای عائیشەی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لێ بێت) کە لە ژورەکەی خۆیدا بوو، سڵاومان لێکردو، وتی: ئەی عوبەیدی کوڕی عومەیر چی ڕێگریت لێ دەکات لەسەردانمان؟ وتی: ئەوەی پێشینان وتویانە: سەردان کەم بکە خۆشەویستیت زیاد دەکات. وتی: بەڕاستی ئێمە سەردانءمیوانداری تۆمان پێ خۆشە، عەبدوڵلای کوڕی عومەر وتی: واز لەم قسەی بێکارانەیەتان بێنن، ئەی عائیشە سەیرترین شتمان پێ بڵێ کە لە پێغەمبەری خوات بینیبێت؟ دەڵێت: عائیشە گریاو پاشان وتی: هەموو فەرمانەکانی سەیر بوون، لە سەرە شەوی خۆمدا هاتە لام و تاکو ئەوەی هاتە سەر جێگەکەم و لەگەڵمدا ڕاکشا، تاکو پێستی بەر پێستم کەوت، پاشان فەرمووی: (ئەی عائیشە روخسەتم بدە پەرستش بۆ پەروەردگارم بکەم) دەڵێت: وتم: بەڕاستی من نزیکی تۆم پێخۆشە و

ئارەزووەکەی تۆشم پێ خۆشە، دەڵێت: هەستا ڕۆشت بۆلای دەفری ئاوەکە و ئاوی زۆر نەڕشت، پاشان هەستاو قورئانی خوێند، پاشان گریا تاکو بینیم فرمێسکەکانی گەشتونەتە لا ملی دەڵێت: دواتر دانیشت و سوپاسی خوای کردو ستایشی کرد، پاشان دەستی کردەوە بە گریان تاکو بینیم فرمێسکەکانی گەشتنە گەردنی، دەڵێت: پاشان لەسەر لای ڕاستی ڕاکشاو دەستی خستە ژێر ڕومەتی، دەڵێت: پاشان گریایەوە تاکو بینیم فرمێسکەکانی گەشتنە سەر زەوی و لەوکاتەدا بیلال هاتە لای مۆڵەتی بدات بۆ بانگی نوێژی بەیانی، پاشان بیلال وتی: نوێژ ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام کاتێك بیلال پێغەمبەری بینی دەگری، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دەگریت لەکاتێکدا خوای گەورە لە تاوانی ڕابردوو داهاتوت خۆش بووە؟ فەرمووی: (ئەی بیلال ئایا نابێت بەندەیەکی سوپاس گوزار بم؟) چۆن نەگریم لەکاتێکدا ئەمشەو ئەم ئایەتەم بۆ هاتە خـــوارەوە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠)﴾ تـا دەگـاتـە ﴿سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾. پـاشـان فـەرمـووی: (تیاچوون و هاوار بۆ ئەو کەسەی ئەم ئایەتانەی خوێندەوە بەڵام بیری تێدا نەکردەوە). بەمشێوەیە ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن حەبان لە سەحیحەکەیدا لە عیمرانی کوڕی موساوە گێڕاویەتیەوە، لە عوسمانی کوڕی ئەبی شەیبەوە، لە یەحیای کوڕی زەکەریاوە، لە ئیبراهیمی کوڕی سوەیدی نەخەعیەوە، لە عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبی سولەیمانەوە، لە عەتاوە، وتویەتی: من و عوبەیدی کوڕی عومەیر چوینە ژوورەوە بۆلای عائیشە، ئەمیش وەك ئەوەی پێشوی گێڕایەوە.

هەربەهەمان شێوە عەبدوللای کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبی دنیا لە کتێبی (التفكير والاعتبار)دا لە شوجاعی کوڕی ئەشرەسەوە گێڕاویەتیەوە، پاشان وتویەتی: حەسەنی کوڕی عەبدولعەزیز بۆی گێڕامەوە، وتی: بیستم لە سونەید کە لە سەوریەوە بەرزی کردبوەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی خوێندو تیایدا بیری نەکردەوە، تیاچوون و هاوار بۆ ئەو) بە پەنجەکانی دە دەژمێرێت - حەسەنی کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: عوبەیدی کوڕی سائیب هەواڵی پێدام و وتی: بە

ئەوزاعی وترا: ئامانج چیە لە بیرکردنەوە تیایاندا؟ وتی: ئەوەیە دەیخوێننەوەو لێی تێدەگەن.

ئیبن ئەبی دنیا دەڵێت: قاسمی کوڕی هاشم بۆی گێڕامەوە، لە عەلی کوڕی عەیاشەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سولەیمانەوە، وتی: پرسیارم لە ئەوزاعی کرد سەبارەت بە کەمترین ئاستی پابەندبوونی فیکری کەسێك بەو ئایەتانەوە کە بیپارێزێت لەوەی تیاچوون و هاوار بۆ ئەو بێت؟ گفتوگۆی لەگەڵ هەنییەدا کردو پاشان وتی: ئەوەیە بیانخوێنێتەوەو لێیان تێ بگات.

فەرموودەیەکی تر: نامۆییەکی تێدایە: ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی بەشیری کوڕی ئەمیر بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی بەشتیەوە دەڵێت: وە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی زەید بۆی گێڕاینەوە، لە ئەحمەدی کوڕی عەمرەوە، وتی: هیشامی کوڕی عەمار هەواڵی پێداین، لە سولەیمانی کوڕی موسای زوهەریەوە، لە مەزاهیری کوڕی ئەسلەمی مەخزومیەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبی سەعیدی مەقبیریەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دە ئایەتی کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی هەموو شەوێك دەخوێند. مەزاهیری کوڕی ئەسلەم زەعیفە.

﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ﴾ واتە پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە.

شاعیر دەڵێت:

وداعٍ دعا: یا من یُجیب إلى النَّدى

فَلم یَسْتَجِبْه عِنْدَ ذاك مُجیبُ

سەعیدی کوڕی مەنسور دەڵێت: سوفیان لە عەمری کوڕی دینارەوە بۆی گێڕاینەوە، لە سەلەمەوە کە پیاوێك بوو لە هۆزی ئوم سەلەمە، دەڵێت: ئوم سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوێمان لێ نەبوو خوای گەورە باسی ئافرەتان بکات لە هیجرەتدا بەهیچ جۆرێك، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. ئەنسار دەڵێت: ئەوەیە کە ئافرەتێکی موسافیر پێشکەشکرا بە سەرماندا.

حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا لە فەرموودەی سوفیانی کوڕی عویینەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێت: سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و، ئیخراجیان نەکردووە، هەروەها ئیبن ئەبی نەجیح لە موجاهیدەوە، لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: دوا ئایەت هاتە خوارەوە ئەم ئایەتە بوو ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. ئیبن مەردەویە ریوایەتی کردووە.

واتای ئایەتەکە ئەوەیە ئیمانداره خاوەن ژیریەکان کاتێك داوایان کرد داوای ئەوەیان نەکرد کە پێشتر باسکرابوو، خوای گەورەش راستەوخۆ بەدوای ئەمەدا داواکەی لێ وەرگرتن و وەڵامی دانەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ﴾ [البقرة: ١٨٦].. کە دەشفەرموێت ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ﴾ ئەمە تەفسیرە بۆ وەڵامدانەوە، واتە خوای گەورە پێی فەرموون وەك وەڵامدانەوە بۆ ئەوان کە ئەو کاری هیچ کارکەرێك لای خۆی ون ناکات و بێ پاداشت نیە، بەڵکو هەرکەس هەر کارێکی کردووە پیاو بووە یان ئافرەت بەپێی کردارەکەی خۆی پاداشت دەدرێتەوە، کە دەشفەرموێت ﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾، واتە هەرهەمووتان لە پاداشتدا لای خوا یەکسانن ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾، واتە ئەوانەی ولاتی هاوەڵپەیداکردنیان چۆڵ کرد و رۆشتن بۆ ولاتی ئیمان و خۆشەویستی و براو خزم و دراوسێکانیان جێ هێشت ﴿وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ واتە بت پەرستەکان بە ئازاردانیان ژیانیان لێ تەسك کردنەوەو تەنگیان پێ هەڵچنین و ناچاریان کردن بۆ دەرچوون لە مەککەو نەمان

لە نێویاندا، لەبەرئەمە فەرمووی ﴿وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي﴾ واتە تاوانی ئەوان لای خەڵکە بت پەرستەکە ئەوە بوو کە ئەمان بڕوایان بەخوای تاك و تەنها هەبوو، وەك خوای گەورە لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت: ﴿يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ [الممتحنة: ١]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ [البروج: ٨].

کە دەشفەرموێت ﴿وَقَـٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ﴾ ئەمە بەرزترین پلەو پایەکانە کە مرۆڤ لە پێناوی خوادا بجەنگێت و ئەسپەکەی بگلێت و دەموچاوی بە خوێنی خۆی و خاکەکە ڕەنگ ببێت. لە هەردوو سەحیحەکەدا چەسپاوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ببنیت لە پێناوی خوادا کوژرام و ئارامگربووم و پاداشتی خۆم هەرلای خوا دەویست و ڕوم لە دوژمن بوو پشتم هەڵنەکرد، ئایا وادەبینیت خوای گەورە لە هەڵەکانم خۆش ببێت؟ فەرمووی (بەڵێ) پاشان فەرمووی (چۆنت وت؟) ئەویش ئەوەی بۆ دوبارە کردەوە کە وتبووی: پێغەمبەر فەرمووی: (بەڵێ، جگە لە قەرز، لەم دواییەدا جوبرەئیل ئەمەی پێ وتم).

لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾ واتە بەناویدا چەندین ڕوباری جۆراوجۆر لە خواردنەوە دەڕوات لە شیرو هەنگوین و شەراب و ئاوی سازگار، لەگەڵ شتانێکی تر کە نە چاو بینیویەتی و نەگوێ بیستویەتی و نە بە بیری مرۆڤیشدا هاتووە، کە دەشفەرموێت: ﴿ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ خوای گەورە ئەو پاداشتەی داوەتەوە پاڵ خۆی تاکو بەڵگە بێت لەسەر مەزنی پەروەردگار، چونکە ئەو مەزن و بەخشندەیە کە هەرگیز کەم نابەخشێت بەڵکو زیادو زۆر دەبەخشێت، وەك شاعیر دەڵێت:

إن يُعَذِّب يَكُن غَرامًا وإن يُعْـ
ـطِ جَزيلًا فإنَّه لا يُبالي

پاشان دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ﴾ واتە باشترین پاداشتی لایە بۆ ئەوکەسەی کاری چاکەی کردووە، ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: لە دومەیلی کوڕی ئیبراهیمەوە باسکراوە وتویەتی: وەلیدی کوڕی موسلیم وتی، حەریزی کوڕی عوسمان هەواڵی پێدام کە شەدادی کوڕی ئەوس دەیوت: ئەی خەڵکینە

خوا تۆمەتبار مەکەن لە بڕیارو دادوەریەکانیدا، چونکە مافی ئیماندار پێشێل ناکات، ئەگەر شتێك دابەزیە سەر کەسێکتان کە پێی خۆش بوو، با سوپاسی بکات، وە ئەگەر شتێك دابەزیە سەر کەسێکتان پێی ناخۆش بوو، با ئارامبگرێت و چاوەڕوانی پاداشت لای خوا بکات، چونکە خوای گەورە باشترین پاداشتی لایە.

﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَـٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: مەڕوانن بۆ ئەو بێ باوەڕانە کە لە چ نازو نیعمەت و خۆشی و شادیەکدا دەژین، چونکە لە ماوەیەکی کەمدا هەموو ئەمانەیان نامێنێت و گیرۆدە دەبن بە کردارە خراپەکانیانەوە، چونکە ئێمە بۆ زیاتر ڕۆچونیان لە خراپەدا مۆڵەتیان دەدەین کە سەرەنجام لەناویان دەبات، هەموو ئەو خۆشیانەی ئەوانی تێدان ﴿مَتَـٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾﴾. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانەی تر وایە کە دەفەرموێت: ﴿مَا يُجَـٰدِلُ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَـٰدِ﴾ [غافر: ٤]؛ یان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَـٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ﴾ [یونس: ٦٩ ـ ٧٠]، وە ئەم ئایەتەش: ﴿فَمَهِّلِ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا﴾ [الطارق: ١٧] واتە کەمێك. وە ئەم ئایەتەش ﴿أَفَمَن وَعَدْنَـٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَـٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَـٰهُ مَتَـٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾ [القصص: ٦١].

ئا بەم شێوەیە کە باسی ژیان و ماڵی بێ باوەڕەکان دەکات لە دنیادا باسی پاشەڕۆژەکەشیان دەکات کە بۆ ناو ئاگرە، دوای ئەمە دەفەرموێت ﴿لَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا﴾ أي ضيافة من عند الله ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ﴾. ئیبن مەردەویە دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی

نەسر بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبو تاهیر سەهلی کوڕی عەبدوڵلاوە، کە هیشامی کوڕی عەممار پێی ڕاگەیاندین، سەعیدی کوڕی یەحیا پێی ڕاگەیاندین، عەبدوڵڵای کوڕی وەلیدی وەسافی لە مەحاریبی کوڕی دەسارەوە پێی ڕاگەیاندین، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی عاسەوە، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بۆیە ناونراون (الابرار) چونکە چاکە لەگەڵ باوك و دایك و منداڵەکاندا دەکەن، چونکە هەرچۆن دایك و باوکت مافیان لەسەرتە، بەهەمان شێوە منداڵەکەشت مافی لەسەرتە) بەمشێوەیە ئیبن مەردەویە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە بە مەوزوعی گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە ئەحمەدی کوڕی جەنابەوە، لە عیسای کوڕی یونسەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی وەلیدی وەسافیەوە، لە مەحاریبی کوڕی وەسارەوە، لە ئیبن عومەرەوە، وتی: بۆیە خوای گەورە ناوی نان (الأبرار) چونکە چاکەیان لەگەڵ دایك و باوك و منداڵەکاندا کردووە، چونکە هەروەك چۆن دایك و باوکت مافیان لەسەرتە، بەهەمان شێوە منداڵەکەشت مافی لەسەرتە، ئەمە باشترین پێچواندنە، خوای گەورەش زاناترە.

پاشان ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: باوکم بۆی گێڕاینەوە، لە موسلیمی کوڕی ئیبراهیمەوە، لە هیشامی دەستەوائیەوە، لە پیاوێکەوە، لە حەسەنەوە، وتویەتی: (الأبرار) ئەوانەن کە ئازاری منداڵ نادەن، هەروەها ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی سینان بۆی گێڕاینەوە، ئەبو معاویە لە ئەعمەشەوە بۆی گێڕاینەوە، لە خەیسەمەوە، لە ئەسوەدەوە، وتی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: هیچ کەسێکی چاکەکار یان خراپەکار نیە کە مردن بۆی چاکتر نەبێت، ئەگەر چاکەکار بوە ئەوە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ﴾ هەر بەمشێوەیە عەبدولڕەزاق لە ئەعمەشەوە، لە سەوریەوە گێڕاویەتیەوە، ئەم ئایەتەشی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾.

هەروەها ئیبن جەریر دەڵێت: موسەنا بۆی گێڕامەوە، لە ئیسحاقەوە، لە ئەبی جەعفەرەوە، لە فەرەجی کوڕی فەزالەوە، لە لوقمانی کوڕی ئەبی

دەردائەوە، کە وتویەتی: هیچ ئیمانداریك نیە کە مردن بۆ ئەو چاکتر نەبێت، هیچ بێ باوەڕێکیش نییە کە مردن بۆی چاکتر نەبێت، هەرکەسیش بڕوام پی ناکات ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ﴾، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۚ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾.

﴿وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾﴾

خوای گەورە سەبارەت بە کۆمەڵێك لە ئەهلی کیتاب هەواڵدەدات کە ئەوان بڕوایان بەخوا هێناوە بڕوایەکی ڕاستەقینە، وە هەروەها بڕوایان هەیە بەوەی بۆسەر موحەممەد دابەزیوە لەگەڵ ئەوەی بڕوایان بە کتێبەکانی پێشوو هەیە، وە ئەوان گەردن کەچ و گوێڕایەڵی پەروەردگارن و، سەرنەوەدەکەن و بێ دەسەلاتی خۆیان دەنوێنن لەبەردەستی پەروەردگاردا ﴿لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ﴾ واتە ئەو مژدانەی دەیزانن و لایانە سەبارەت بە هاتنی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) و باسکردنی وەسفەکانی و سیفەتەکانی و شوێنی هاتنەکەی و سیفەتی ئوممەتەکەی ناشارنەوە، ئەو کەسانە هەڵبژاردەترین و باشترین کەسانی ئەهلی کیتابن، ئەگەر جولەکە یان گاور بن، ئەوەتە خوای گەورە لە سورەتی (القصص)دا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ﴾ [القصص: ٥٢ ـ ٥٤] هەروەها دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ﴾ [البقرة: ١٢١] هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ﴾ [الأعراف: ١٥٩]، یان دەفەرموێت: ﴿لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ﴾ [آل عمران: ١١٣]، هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾

وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾﴾ [الإسراء: ١٠٧ ـ ١٠٩]؛ ئەم سیفەتا لە جولەکەکاندا هەیە، بەڵام زۆر بەکەمی، وەك لە عەبدوڵلای کوڕی سەلام و هەندێکی وەکو ئەودا بینراون لە زانایانی جولەکە، کە ژمارەیان نەگەشتە دە کەس، بەڵام گاورەکان زۆریان ڕێنومایییان وەرگرت و شوێنی حەق و ڕاستی کەوتن، وەك خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰ﴾ تا دەگاتە: ﴿فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ [المائدة: ٨٢ ـ ٨٥] بەمشێوەیە لێرەدا فەرمووی: ﴿أُولَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئایەتەکە.

ئەوە لە فەرموودەدا چەسپاوە کە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك سورەتی (کهیعص)ی خوێندەوە لە بەردەم نەجاشی پادشای حەبەشەدا کە بەتریقیەکان و قەشەکانی لابوو، گریاو ئەوانەشی لەگەڵیدابوون گریان تاکو ڕیشیان تەڕبوو، هەروەها لە هەردوو سەحیحەکەدا چەسپاوە کاتێك کە نەجاشی مرد پێغەمبەر باسی مردنەکەی بۆ هاوەڵەکانی کرد و تەعزیەی لێکردو، فەرمووی: (برایەکی ئێوە لە حەبەشە مرد، نوێژی لەسەر بکەن) ئەوەبوو ڕۆشتە دەرەوە بۆ بیابان و ڕیزی کردن و نوێژی لەسەر کرد.

هەروەها ئیبن ئەبی حاتەم و حافزو ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە لە فەرموودەی حەمادی کوڕی سەلەمەوە، لە سابتەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: کاتێك نەجاشی کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن) هەندێك لە خەڵکەکە وتیان: فەرمانمان پێدەکات داوای لێخۆشبوون بۆ (علجم)ێك بکەین لە زەوی حەبەشە مردووە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾ ئایەتەکە.

عەبدی کوڕی حەمید و ئیبن ئەبی حاتەم لە ڕێگەیەکی ترەوە لە حەمادی کوڕی سەلەمەوە، لە سابتەوە، لە حەسەنەوە، لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) ڕیوایەتی کردووە پاشان ئیبن مەردەویە لە ڕێگەیەکەوە لە حەمیدەوە، لە

ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، هاوشێوەی ئەوەی پێشوو گێڕاویەتیەوە، هەروەها ئیبن جەریر لە فەرموودەی ئەبوبەکری هەزەلیەوە، لە قەتادەوە، لە سەعیدی کوڕی موسییەبەوە، لە جابرەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا لەکاتی مردنی نەجاشیدا فەرمووی: (براکەتان لەسەر(علج)ێك مرد) پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) ڕۆشتە دەرەوەو وەك چۆن نوێژی لەسەر تەرمەکان دەکرد چوارجار (الله اکبر)ی لەسەر کرد، دووڕووەکان وتیان: نوێژ لەسەر کافرێك دەکات کە لە زەوی حەبەشە مردووە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾ ئایەتەکە.

ئەبو داودیش دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەمری رازی بۆی گێڕاینەوە، لە سەلەمەی کوڕی فەزڵەوە، لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە، لە یەزیدی کوڕی رومانەوە، لە عوروەوە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك نەجاشی مرد ئێمە باسمان لەوە دەکرد کە، بەردەوام لەسەر گۆڕەکەی نور دەبینرێت، هەروەها حافز ئەبو عەبدوڵلای حاکم لە موستەدرەکەکەیدا گێڕاویەتیەوە وتویەتی: ئەبو عەباسی سەیاری بیمەر هەواڵی پێداین، عەبدوڵلای کوڕی عەلی غەزال بۆی گێڕاینەوە، لە عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی شەقیقەوە، لە ئیبن موبارەکەوە، لە موسعەبی کوڕی سابتەوە، لە عامری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبێرەوە، لە باوکیەوە، دەڵێت: دوژمنێك هێرشی هێنایە سەر نەجاشی لە خاکی حەبەشەدا، کۆچکردووەکانیش ڕۆشتن بۆلای و، وتیان: پێمان خۆشە ئێمە بۆیان بچینەدەر تاکو لەگەڵیاندا لەگەڵ تۆدا لە دژی ئەوان بجەنگین و ببینیت چ بوێریەکمان هەیەو پاداشتی تۆش بدەینەوە لەسەر ئەو چاکەیەی لەگەڵ ئێمە کردت، وتی: نەخێر، چارەسەرکردن بە سەرکەوتنی خوای گەورەو باڵادەست باشترە لە چارەسەرکردن بە پشتیوانی خەڵکی، دەڵێت: لەسەر ئەم، ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾ ئایەتەکە. پاشان دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکە ئیسنادەکەی سەحیحەو، ئیخراجیان نەکردووە.

هەروەها ئیبن ئەبی نەجیح لە موجاهیدەوە دەڵێت ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە موسڵمانێکی ئەهلی کیتاب. هەروەها عوبادی کوڕی مەنسور

دەڵێت: پرسیارم لە حەسەنی بەسری کرد سەبارەت بەم ئایەتە ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾ ئایەتەکە. وتی: ئەوە ئەو ئەهلی کیتابانەن کە پێش موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) هەبوون و شوێنی ئەم کەوتن و، ئیسلامیان ناسی و، خوای گەورەش دوو پاداشتی دانەوە: دانەیەکیان لەسەر ئیمانەکەیان پێش هاتنی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) و، دانەکەی تریان لەسەر شوێنکەوتنی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت). هەردووکیان ئیبن ئەبی حاتەم ریوایەتی کردوون.

هەروەها لە هەردوو سەحیحەکەدا لە ئەبو موساوە چەسپاوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (سێ کەس دووجار پاداشتی خۆیان دەدرێتەوە) لەوانە ناوی پیاوێکی برد کە ئیمانی بە پێغەمبەرەکەی خۆی و ئیمانی بە موحەممەد هێنابوو.

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾، واتە ئەو زانیاریانەی لە دەستیاندایە نایشاردنەوە وەك چۆن هەندێك لە ریسواکانیان ئەو کارەیان کرد، نەك هەرئەوەندە بەڵکو بەخۆڕایی توانای خۆیان لە گەیاندنی ئەو زانیاریانەدا سەرف دەکرد، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾، موجاهید دەڵێت: ﴿سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ واتە سەرژمێری کردنی خێرا، ئیبن ئەبی حاتەم و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە.

دوای ئەمە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ﴾، حەسەنی بەسری بە رەحمەت بێت دەڵێت: فەرمانیان پێکراوە لەسەر ئەو ئاینەی کە خوا بۆ ئەوان پێی رازیە ئارامگرین کە بریتیە لە ئیسلام. نابێت نە بۆ خۆشی و نە بۆ ناخۆشی، نەبۆ خۆشگوزەرانی و نەبۆ نەبوونی دەستی لێ بەربدەن، تاکو بە موسڵمانی دەمرن، وە پێویستە ئارامگرین لەبەردەم دوژمنەکاندا ئەوانەی کە ئاینەکەی خۆیان دەشارنەوە، بەمشێوەیە زیاد لە کەسێك لە زانایانی سەلەف ئەمەی وتووە. بەڵام (رابطو) بریتیە لە دامەزراوی و مانەوە لە شوێنی بەندایەتی کردندا. هەروەها وتراوە: بریتیە لە چاوەڕوانی کردنی نوێژ لەدوای نوێژ، ئیبن عەباس و سەهلی کوڕی حەنیف و موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزی و کەسانی تر ئەمە بیروڕایان بوو.

لێرەدا ئیبن ئەبی حاتەم ئەو فەرموودەیە دەگێڕێتەوە کە موسلیم و نەسائی لە فەرموودەی مالیکی کوڕی ئەنەسەوە لەعەلای کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی یەعقوبی مەولای حەرقەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (ئایا ئەو شتەتان پێ بڵێم کە خوا بەهۆیەوە تاوانەکان دەسڕێتەوەو پلەکان بەرز دەکاتەوە؟ دەست نوێژگرتن لەکاتی ناڕەحەتیداو، زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت و، چاوەڕوانکردنی نوێژ دوای نوێژ، ئەوە ریباتە، ئەوە ریباتە، ئەوە ریباتە).

ئیبن ئەبی مەردەویە دەڵێت: موحەممەدی کوڕی ئەحمەد بۆی گێڕاینەوە، لە موسای کوڕی ئیسحاقەوە، لە ئەبی جەحیفەی کوڕی یەزیدی کوفیەوە، لە ئیبن ئەبی کەریمەوە، لە موحەممەدی کوڕی یەزیدەوە، لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە، وتی: ڕۆژێکیان ئەبو هورەیرە هات بۆلام و، وتی: ئەی برازای خۆم ئایا دەزانیت ئەم ئایەتە سەبارەت بە چی هاتە خوارەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟﴾،؟ وتم: نەخێر، وتی: بەڵام خۆ لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لێ بێت) غەزایەك نەبوو کە تیایدا بمێننەوەو ریبات بکەن، بەڵکو سەبارەت بە کۆمەڵێك هاتە خوارەوە کە مزگەوتەکان ئاوەدان دەکەنەوەو نوێژەکانیان لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدەن، پاشان یادی خوا لەناو مزگەوتەکەدا دەکەن، لەسەر ئەو کەسانە هاتە خوارەوە کە فەرمووی ﴿ٱصْبِرُوا۟﴾ واتە لەسەر پێنج نوێژەکە ﴿وَصَابِرُوا۟﴾ خۆتان و هەواو ئارەزووەکانتان ﴿وَرَابِطُوا۟﴾ لە مزگەوتەکەتاندا ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لەو شتەی کە لەسەرتان پێویستە و واجبە ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾.

هەر بەمشێوەیە حاکم لە موستەدرەکەکەیدا لەڕێگەی سەعیدی کوڕی مەنسوری کوڕی موبارەکەوە، لە موسعەبی کوڕی سابتەوە، لەداودی کوڕی سالحەوە، لە ئەبی سەلەمەوە، لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویەتیەوە.

هەروەها ئیبن جەریر دەڵێت: ئەبو سائیب بۆی گێڕامەوە، لە ئیبن فوزەیلەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی سەعیدی مەقبیریەوە، لە باپیریەوە، لە شەرحەبیلەوە، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا ئەو شتەتان پێ بڵێم کە تاوان و هەڵە دەسڕێتەوە؟

دەست نوێژگرتن لەسەر نارەحەتی و، چاوەڕوانکردنی نوێژ دوای نوێژ، ئەوەش ریباتە).

هەر ئیبن جەریر دەڵێت: ئەبو موسای کوڕی سەهلی رملی بۆی گێڕاینەوە، لە یەحیای کوڕی وازحەوە، لە موحەممەدی کوڕی موهاجیرەوە، لە یەحیای کوڕی یەزیدەوە، لە زەیدی کوڕی ئەبی ئەنیسەوە، لە شەرحەبیلەوە، لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ئایا ئەو شتەتان پێ بڵێم کە خوای گەورە بەهۆیەوە هەڵەکان دەسڕێتەوەو، لە تاوانەکان خۆش دەبێت)؟ وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (دەستنوێژگرتن لە شوێنەکانی خۆیداو، زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت و، چاوەڕوانکردنی نوێژ دوای نوێژ، ئەوەیە ریبات).

ئیبن ئەبی مەردەویەش دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەلی بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سەلامی بیروتیەوە، لە موحەممەدی کوڕی غالبی ئەنتاکیەوە، لە عوسمانی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە، لە وازعی کوڕی نافیعەوە، لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە، لە ئەبی ئەیوبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خوا لەسەرمان راوەستاو فەرمووی: (ئایا دەتانەوێت ئەوەتان پێ بڵێم کە خوا بەهۆیەوە تاوان دەسڕێتەوەو پاداشت گەورە دەکات؟) وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە چیە؟ فەرمووی: (دەست نوێژگرتن لەسەر نارەحەتی و، زۆر هەنگاوتان بەرەو مزگەوت و، چاوەڕوانکردنی نوێژ دوای نوێژ) فەرمووی: ئەوەش ئەو وتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾﴾، ئەوە بریتیە لە مانەوەو ئارامگرتن لە مزگەوتەکاندا - ئەوە ریباتە -. ئەم فەرموودەیە لەم ڕووەوە زۆر غەریبە.

عەبدوڵلای کوڕی موبارەکیش لە موسعەبی کوڕی سابتەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێرەوە، دەڵێت: داودی کوڕی سالح بۆی گێڕامەوە، وتی: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان پێی وتم: ئەی برازاکەم ئایا دەزانیت ئەم ئایەتە سەبارەت بەچی هاتۆتە خوارەوە ﴿ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟﴾؟. وتم: نەخێر. وتی: ئەی برازای خۆم لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا غەزایەك نەبوو

کە پێغەمبەر تیایدا بمێنێتەوە، بەڵکو ئەوە مەبەستی چاوەڕوانکردنی نوێژە لەدوای نوێژە، ئیبن جەریر گێڕاویەتیەوە. گێڕانەوەی ئیبن مەردەویەشمان لەم بارەیەوە خستەڕووە کە لە وتەی ئەبو هورەیرە بوو (ڕەزای خوای لێ بێت). خوای گەورەش زاناترە.

هەروەها وتراوە: مەبەست لە (الرباط) بریتیە لە مانەوە لە سەرنگەری ئیسلامدا دژ بە دوژمنان و پاراستنی سنورو سەنگەرەکان لە هاتنە ناوەوەی دوژمن بۆ وڵات و خاکی موسڵمانان، لەم بارەیەوە هەواڵ زۆرە کە هانی موسڵمانان دەدات و باس لە زۆری پاداشتی ئەوکارە دەکات، بوخاری لە سەحیحەکەیدا لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ڕیباتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا باشترە لە دنیاو لەوەی لەسەر دنیادایە).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بۆی گێڕاینەوە، لە ئیبن موبارەکەوە، لە حەیوەتی کوڕی شورەیحەوە، لە ئەبو هانی خەولانیەوە، دەڵێت: عەمری کوڕی مالیکی جەنەبی هەواڵی پێداوە کە گوێی لە فوزالەی کوڕی عوبەید بووە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (هەموو مردویەك مۆر لە کردارەکانی دەدرێت و کۆتاییان پێدێت جگە لەو کەسەی لە کاتی ڕیبات لە پێناوی خوادا مردووە، چونکە ئەو کردارەکانی بۆ گەشە پێدەدرێت تاکو ڕۆژی قیامەت، هەروەها لە فیتنەو بەڵای ناو گۆڕیش پارێزراو دەبێت)، بەمشێوەیە ئەبو داودو ترمزی لە فەرموودەی ئەبی هانیئی خەولانیەوە گێڕاویانەتەوە، ترمزی وتویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە، هەروەها ئیبن حەبان لە سەحیحەکەیدا ئیخراجی کردووە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: یەحیای کوڕی ئیسحاق و حەسەنی کوڕی موسا و ئەبو سەعید بۆیان گێڕاینەوە، وتیان: ئیبن لەهیعە بۆی گێڕاینەوە، لە موشەڕەحی کوڕی عاهانەوە، گوێم لە عوقبەی کوڕی عامر بوو دەیوت: بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (هەموو مردویەك مۆر لە کردارەکانی دەدرێت و کۆتاییان پێ دەهێنرێت جگە لەو کەسە نەبێت کە لە ڕیباتدا لە پێناوی خوادا مردووە، چونکە ئەو کردارەکانی بەدوایدا

دەڕۆن تا زیندو دەکرێتەوە، لە بەڵاو نارەحەتی ناو گۆڕیش پارێزراو دەبێت).

حارسی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبی ئوسامەش لە مەسنەدەکەیدا لە مەقبیریەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی یەزید گێڕاویەتیەوە، تا دەگاتە (تا زیندو دەکرێتەوە) بۆ ئەوەی (پارێزراو دەبێت لە بەڵاو نارەحەتی ناو گۆڕ)ی تێدابێت. ئیبن لەهیعەش هەرکات فەرموودەی وتبێت ئەوە حەسەن بووە بەتایبەتی کە ئەو هەموو بەڵگانەی ترمان خستە ڕوو.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن ماجە لە سونەنەکەیدا دەڵێت: یونسی کوڕی عەبدولئەعلا بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی وەهەبەوە، لە لەیسەوە، لە زەهری کوڕی مەعبەدەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (هەرکەس بە مورابیتی لە پێناوی خوادا بمرێت ئەو کردەوە چاکانەی دەیکرد بە دوایدا دەڕۆن و بەردەوام دەبن، رزقەکەشی بۆ دەڕوات، لە فیتنەو ئاشوبیش پارێزراو دەبێت و، خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوی دەکاتەوە بە ئارامی و بێ ئەوەی ترسی هەبێت).

ڕێگەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: موسا بۆی گێڕاینەوە، ئیبن لەهیعە لە موسای کوڕی وەردانەوە هەواڵی پێداین، لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس بە مورابیتی بمرێت دەپارێزرێت لە فیتنەو نارەحەتی قەبرو، لە دڵەراوکێ و ترسی مەزنیش ئەمین و پارێزراو دەبێت و،بەیانیان و ئێواران رزق و ڕۆزی خۆی لەبەهەشتەوە بۆدێت، هەروەها تا ڕۆژی قیامەت پاداشتی مورابیتی بۆ دەنوسرێت).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئیسحاقی کوڕی عیسا بۆی گێڕاینەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی عەیاشەوە، لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەلحەلەی دەئولیەوە، لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵاوە، لە ئوم دەردائەوە ئەم فەرموودەیە بەرز دەکرێتەوە، وتویەتی: (هەرکەس بە ئارامگری لەسەر شتێکی موسڵمانان لە قەراغ و سنوری موسڵماناندا بۆماوەی سێ ڕۆژ بمێنەوە جێگەی ریباتی ساڵێکی بۆ دەگرێت).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: موحەممەدی کوڕی جەعفەر

بۆی گێڕاینەوە، لە کەهمەسەوە، لە موسعەبی کوڕی سابیتی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرەوە، وتی: عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەر مینبەرەکەی وتاری دەدا، وتی: من فەرموودەیەکی پێغەمبەری خواتان بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) بیستومەو هیچ شتێك ڕێگری لێ نەکردوم بۆتان بگێڕمەوە گومان بردنم نەبێت پێتان، بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (پاسەوانی کردنی شەوێك لە پێناوی خوادا باشترە لە هەزار شەو کە شەوەکەی شەونوێژ بکرێت و ڕۆژەکەی ڕۆژوی تیا بگیرێت) هەر بەمشێوەیە ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە روحەوە، لە کەهمەسەوە، لە موسعەبی کوڕی سابتەوە، لە عوسمانەوە. ئیبن ماجەش گێڕاویەتیەوە لە هیشامی کوڕی عەمارەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە باوکیەوە، لە موسعەبی کوڕی سابتەوە، لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێرەوە، وتویەتی: عوسمانی کوڕی عەفان وتاری بۆ خەڵك داو، وتی: ئەی خەڵکینە من فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە، بەڵام ئەوەی نەیهێشتووە بۆتان بگێڕمەوە تەنها گومانم بووە بە ئێوەو بە هاوڕێکانتان، جا هەرکەس دەیەوێت هەڵی بژێرێت بۆ خۆی یان وازی لێ بهێنێت، بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس تەنها یەك شەو لەبەرخوا ریبات بکات وەك هەزار شەو وایە بەڕۆژووەکەی و شەونوێژەکەیەوە).

ڕێگەیەکی تر: لە عوسمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ترمزی وتی حەسەنی کوڕی عەلی خەلال بۆی گێڕاینەوە، لە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکەوە، لە لەیسی کوڕی سەعدەوە، لە ئەبو عەقیلی زەهرەی کوڕی مەعبەدەوە، لە ئەبی ساڵح مەلاوی عوسمانی کوڕی عەفانەوە، دەڵێت: گوێم لە عوسمان بوو کە لەسەر مینبەر دەیوت: من فەرموودەیەکم لێ شاردونەتەوە کە لە پێغەمبەری خوام بیستووە (دروودی خوای لێ بێت) لە ترسی ئەوەی لێم جیاببنەوە، پاشان وا بەباشم زانی بۆتان بگێڕمەوە، ئیتر هەرکەسێك بۆخۆی چی پێ باشە یا ئەوە هەڵبژێریت، لە پێغەمبەری خوام بیست (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ریباتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا باشترە لە هەزار ڕۆژی تر کە لەماڵەکاندا بەسەر ببرێت). پاشان ترمزی وتی: ئەمە فەرموودەیەکە لەم ڕووەوە

حەسەنی غەریبە. موحەممەد واتە بوخاری ئەبو سالح مەولای عوسمان کە ناوی ئەرکانە وتی، جگە لە ترمزی کەسی تر وتویانە ناوی حارسە، خوای گەورە زاناترە.

هەر بەمشێوەیە ئیمام ئەحمەد لە فەرموودەی لەیسی کوڕی سەعد و عەبدوڵلای کوڕی لەهیعەوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام لە کۆتایی فەرموودەکەدا زیادەیەکی وتووە، دەڵێت: عوسمانی وتی: هەرکەس هەرچۆنی ویست با بمێنێتەوەو ریبات بکات، ئایا گەیاندم؟ وتیان: بەڵێ. وتی: خوایەگیان شاهید بە.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو عیسای ترمزی دەڵێت: ئیبن ئەبی عومەر بۆی گێڕاینەوە، لە سوفیانەوە، لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە، وتی: سەلمانی فارسی بەلای شەرحەبیلی کوڕی سەمتدا تێپەڕی، کە لە ریباتدا بوو - لەسەر بەندایەتی مابویەوە - زۆریش لەسەر خۆی و هاوەڵەکانی سەخت بوو بوو، وتی: ئەی کوڕی سەمت فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) بیستوومە؟ وتی: بەڵێ. بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ریباتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا باشترە - یان وتی چاکترە - لە ڕۆژوی مانگێك و شەونوێژەکەی، هەرکەسیش لەو ریباتەدا بمرێت لە فیتنەی گۆڕ دەپارێزرێ و، کردارەکانی بۆ گەشە پێدەدرێت تا ڕۆژی قیامەت) تەنها موسلیم بەم جۆرە هێناویەتی و، وتویەتی. ئەم فەرموودەیە حەسەنە. لە هەندێك نوسخەشدا زیادەی لەگەڵدایە بەڵام ئیسنادەکەی نەگەیەنراوە، ئیبن مونکەدریش سەلمانی نەبینوە. (وتم): ئاشکراکەی ئەوەیە کە موحەممەدی کوڕی مونکەدیر لە شەرحەبیلی کوڕی سەمتی بیستووە، موسلیم و نەسائیش لە فەرموودەی مەکحول و ئەبێ عوبەیدەی کوڕی عوقبەوە گێڕاویانەتەوە، هەردووکیشیان لە شەرحەبیلی کوڕی سەمتەوە کە هاوڕێیەتی لەگەڵ سەلمانی فارسی هەبووە، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: (ریباتی ڕۆژێك و شەوەکەی لە ڕۆژوی مانگێك و شەونوێژی شەوەکەی چاکترە، ئەگەر مردیش ئەوکارەی کردوویەتی بۆی دەڕوات و بەردەوام دەبێت و رزقەکەشی بۆ دەڕوات و لە فیتنە پارێزراو دەبێت) پێشتر داڕشتنی موسلیممان بە تەنها پێشکەش کرد.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن ماجە دەڵێت: موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی سومرە بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی یەعلای سەلمیەوە، لە عەمری کوڕی سەبیحەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەمرەوە، لە مەکحولەوە، لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (ریباتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا، بۆ پاراستنی عەورەتی موسڵمانان کە چاوەڕوانی پاداشتەکەی لەخوا بکرێت لە مانگی ڕەمەزاندا پاداشتی گەورەترە لە بەندایەتی سەد ساڵ بە ڕۆژوەکەی و شەو هەستانەکەیەوە، ریباتی ڕۆژێکیش لە پێناوی خواداو بۆ پاراستنی عەورەتی موسڵمانان لە جگە لە مانگی ڕەمەزاندا لای خوا باشترەو پاداشتی زۆرترە - وادەزانم وای وت - لە بەندایەتی هەزار ساڵ بە ڕۆژوەکەی و شەوهەستانەکەیەوە، خۆ ئەگەر خوای گەورە بە سەلامەتی گێڕایەوە بۆناو کەسوکارەکەی ئەوە خراپەی هەزار ساڵی لەسەر نانوسێت و، چاکەکانی بۆ دەنوسێت و، پاداشتی ریباتەکەی تا ڕۆژی قیامەت بۆ دەڕوات).

ئەمە فەرموودەیەکی غەریبە، تەنانەت مونکەریشە بەم شێوەیە، عومەری کوڕی سەبیحیش تۆمەتبارە.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن ماجە دەڵێت: عیسای کوڕی یونسی رملی بۆی گێڕاینەوە، لە موحەممەدی کوڕی شوعەیبی کوڕی شاپورەوە، لە سەعیدی کوڕی خالیدی کوڕی ئەبی تەویلەوە، دەڵێت: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك بوو وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (پاسەوانیی شەوێك لە پێناوی خوادا چاکترە لە ڕۆژوگرتن و شەوهەستانی پیاوێك لە ماڵەکەیدا بۆماوەی هەزار ساڵ. ساڵێکیش سێ سەد و شەست ڕۆژە، هەر ڕۆژەی وەك هەزار ساڵە) بەهەمان شێوە ئەم فەرموودە غەریبە. ئەم سەعیدی کوڕی خالیدەش لەلایەن ئەبو زەرعەو زیاد لە کەسێکەوە بە زەعیف دانراوە، عوقەیلی دەڵێت: لەسەر فەرموودەکەی بەردەوام نابێت، ئیبن حەبانیش دەڵێت: ناکرێت بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە، حاکمیش دەڵێت: لە ئەنەسەوە فەرموودەی مەوزوعی گێڕاوەتەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیبن ماجە دەڵێت: موحەممەدی کوڕی سەباح بۆی

گێڕاینەوە، عەبدولعەزیزی کوڕی موحەممەد هەواڵی پێداین لە سالحی کوڕی موحەممەدی کوڕی زائیدەوە، لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە، لە عوقبەی کوڕی عامری جەهەنیەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی : (خوای گەورە ڕەحم بکات بە پاسەوانی پاسەوانەکان) لە نێوان عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو عوتبەی کوڕی عامردا پچڕان هەیە، چونکە ئەو نەیبینیوە، خوای گەورە زاناترە.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو داود وتی: ئەبو تەوبە بۆی گێڕاینەوە، لە معاویە واتە ئیبن سەلامەوە، لە زەید - واتە ئیبن سەلامەوە - کە گوێی لە ئەبو سەلام بووە وتویەتی: سەلولی بۆی گێڕامەوە، وتی سەهلی کوڕی هەنزەلیە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەوان ڕۆژی حونەین لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لێ بێت) ڕۆشتوون بەردەوام بوون لە ڕۆشتن تا ئێوارە داهات، نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کردووە، پیاوێکی فارس هاتووە، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من لای ئێوە دەرچووم ڕۆشتم تا گەشتمە چیای فڵان و فڵان، کاتێك گەشتمە هەوازن بینیم هەرچیان هەیە و نیانە بە وشترو مەڕو ئاژەڵیانەوە کۆیان کردبوەوە بۆ حونەین، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لێ بێت) زەردەخەنەیەکی کردوو فەرمووی: (ئەوە دەسکەوتی موسڵمانانە لە سبەینێ دا إنشاء الله) پاشان فەرمووی: (کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات؟) ئەنەسی کوڕی مەرسەد (غەنەوي) وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (کەواتە سواربە) ئەویش سواری ئەسپەکە بوو، هات بۆلای پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (ڕوبکەرە ئەم شیوە تا دەگەیتە بەرزترین شوێنی، نەهێڵیت ئەمشەو لەلای تۆوە زەفەرمان پێ بەرن و هێرش بکەنە سەرمان) کاتێك ڕۆژمان کردەوە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) ڕۆشتە دەرەوە بۆ جێ نوێژەکەی، دوو ڕکات نوێژی کرد، فەرمووی: (ئایا سوارچاکەکەتانتان بینی بێتەوە؟) پیاوێك وتی: پێغەمبەری خوا نەمان بینیوە، ئیتر دەستی کرد بە نوێژ، پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێت) لەکاتێکدا نوێژی دەکرد لای دەکردەوە بەلای شیوەکەدا تا نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان فەرمووی: (مژدە بدەن ئەوە سوار چاکەکەتان هاتەوە) ئێمە لەناو دارەکانەوە دەمان ڕوانی بۆی، کاتێك هات

لەلای پێغەمبەری (دروودی خوای لێ بێت) وەستاو، وتی: من ڕۆشتم تا ڕۆشتمە بەرزترین شوێنی شیوەکە وەك تۆ فەرمانت پێکردم، کاتێك ڕۆژم کردەوە هەردوو شێوەکە گەڕام بەڵام کەسم نەبینی، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (ئایا ئەمشەو دابەزیتە خوارەوە بۆناو شیوەکە؟) وتی: نەخێر، مەگەر بۆ نوێژ یان بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیی نەبێت. پێی فەرموو: (واجب و ئەرکی خۆت جێبەجێ کردو پاش ئەمە لەسەرت نیە کاربکەت) نەسائی گێڕاویەتیەوە لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی موحەممەدی کوڕی کەسیری حەرانیەوە، لە ئەبی تەوبەوە کە ڕەبیعی کوڕی نافیعە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: زەیدی کوڕی حەباب بۆی گێڕاینەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی شورەیحەوە، بیستم لە موحەممەدی کوڕی شەمیری ڕەعینی دەیوت: بیستم لە ئەبا عامری تەجیبی، ئیمام ئەحمەد دەڵێت: جگە لە زەید وتی ئەبا عەلی جەنبی دەڵێت: بیستم لە ئەبا ڕەیحانە دەیوت: ئێمە لە غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لێ بێت) بوین، شەوێکیان چوینە سەر گردێك، لەسەری ماینەوە، سەرمایەکی زۆرمان بوو تاکو بینیم کەسی وا هەبوو چاڵێکی هەڵدەکەندو تێی دەچوو جلی لاغەکەی دەدا بەخۆیدا، کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) ئەمەی لە خەڵکەکە بینی بانگی کردو فەرمووی: (کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات بە دوعایەك دوعای بۆ دەکەم بۆ ئەو فەزڵ و پلەوپایەی تێدایە؟) پیاوێك لە ئەنسارەکان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (نزیك بەرەوە) پیاوەکە نزیك بویەوە، فەرمووی: (تۆ کێیت؟). ئەنساریەکەش ناوی خۆی وت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەستی کرد بە پاڕانەوەو زۆر پاڕایەوە، ئەبو ڕەیحانە دەڵێت: کاتێك ئەو دوعایانەم بست کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) کردی، وتم: منیش کەسێکی ترم، فەرمووی (نزیك بەرەوە) نزیك بوومەوەو فەرمووی: (تۆ کێیت؟) وتم: من ئەبا ڕەیحانەم، بە پاڕانەوەیەك پاڕایەوە کەمترو نزمتر بوو لەو نزایانەی بۆ ئەنساریەکەی کرد، پاشان فەرمووی: (ئاگر حەرام کراوە لەسەر چاوێك فرمێسکی ڕژاند بێت - گریا بێت - لەترسی خوا، هەروەها ئاگر حەرام کراوە لەسەر چاوێك لەبەرخوا پاسەوانی کردبێت و شەو نەخەوتبێت).

نەسائی ئەمەی لێوە ریوایەت کردووە (ئاگر حەرامکراوە) تا دەگاتە کۆتاییەکەی لە عیسمەی کوڕی فەزڵ، لە زەیدی کوڕی حەبابەوە، هەروەها لە حارسی کوڕی مسکین، لە ئیبن وەهەبەوە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی شورەیحەوە، پاشان تەواوی کردووە، لە هەردوو گێڕانەوەکەدا وتویەتی: لە ئەبی عەلی جەنەبیەوە.

فەرموودەیەکی تر: ترمزی دەڵێت: نەسری کوڕی عەلی جەهرەمی بۆی گێڕاینەوە، لە بیشری کوڕی عومەرەوە، لە شوعەیبی کوڕی زورەیقی ئەبو شەیبەوە، لە عەتای خوراسانیەوە، لە عەتای کوڕی ئەبی رەباحەوە، لە ئیبن عەباسەوە، دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (دووچاو ئاگریان بەرناکەوێت: چاوێك گریابێت لەترسی خواو، چاوێك مابێتەوە پاسەوانی کردبێت لەپێناوی خوادا) پاشان وتی: حەسەنی غەریبە، نایزانین لە فەرموودەی شوعەیبی کوڕی زورەیقەوە نەبێت، لەهەمان بەشدا وتویەتی لە عوسمان و ئەبی رەیحانەوە، (منیش وتم) وەك لە پێشەوە باسم کردن، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

فەرموودەیەکی ترد: ئیمام ئەحمەد دەڵێت: یەحیای غەیلان بۆی گێڕاینەوە، لە روشدەینەوە، لە زیادەوە، لە سەهلی کوڕی موعازەوە، لە باوکیەوە، لە موعازەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس لە پشتی موسڵمانانەوە پاسەوانی بگرێت بە خۆبەخشی نەك بە پاداشتی فەرمانڕەوا، بە هەردوو چاوەکانی ئاگر نابینێت تەنها بۆ سوێندبردنە سەر نەبێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَاۚ﴾ [مريم: ٧١] تەنها ئەحمەد (بە رەحمەت بێت) هێناویەتی.

فەرموودەیەکی تر: بوخاری لە سەحەیحەکەیدا لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (رەنجەڕۆ بێت بەندەی دینارو بەندەی درهەم و بەندەی شتومەك، ئەگەر پێی درا رازی دەبێت و، ئەگەر پێی نەدرا دەڕەنجێت، رەنجە رۆیێت و رەجاڵ بێت، وەئەگەر گوشرا کەم ناکات، سەرفرازی بۆ بەندەیەك رەشۆی ئەسپەکەی دەگرێت لە پێناوی خوادا، سەری کژوبژ بووە، پێکانی قلیشاون،

ئەگەر لە پاسەوانیدا بێت پاسەوانیەکی باش دەکات، ئەگەر لە گروپی ئاوهێنان بێت ئاو هێنانەکەی بەباشی دەکات، ئەگەر داوای مۆڵەت بکات مۆڵەتی نادرێتێ و، ئەگەر داوای شەفاعەت بکات رێگەی پێ نادرێت) ئەمە کۆتا فەرمووده بوو کە تایبەت بەم باسە هێنامان، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار لەسەر نازونیعمەتە زۆرەکانی لەسەر بەدوای یەکدا هاتنی ڕۆژەکان و ساڵەکان.

هەروەها ئیبن جەریر دەڵێت: موسەنا بۆی گێڕاینەوە، لە موتریفی کوڕی عەبدوڵلای مەدینیەوە، لە مالیکی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەسلەمەوە، وتی: ئەبو عوبەیدە نامەیەکی نوسی بۆ عومەری کوڕی خەتاب و باسی مەترسی خۆی بۆ کردبوو بە هەموو سەربازەی ڕۆمەکان کۆیان کردبویەوە، عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆی نوسی: لەپاشاندا، بە ڕاستی هەرچەندە ئاستی ئەو نارەحەتیەی دادەبەزێت بۆسەر بەندەیەکی موسڵمان سەخت و قورس بێت خوای گەورە لەدوای ئەو نارەحەتیەوە رزگاری و دەروازەی داناوە، وە هەرگیز نارەحەتی و سەختی بەسەر ئاسانیدا سەرناکەوێت و نایبەزێنێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾. بەم شێوە حافزی ئیبن عەساکر ریوایەتی کردووە لە وەرگێڕانی عەبدوڵلای کوڕی موبارەکەوە، لە رێگەی ئیبراهیمی کوڕی ئەبی سەکینەوە، وتی: عەبدوڵلای کوڕی موبارەك ئەم بەیتە شیعرانەی بەسەردا خوێندمەوە لە تەرسوس، منیش خواحافیزیم لێکرد و شیعرەکانی برد بۆ فوزەیلی کوڕی عەیاز لە ساڵی سەدو حەفتادا، لە گێڕانەوەیەکی تردا لە ساڵی سەدو حەفتاو حەوتدا وتبوی:

يـا عـابـدَ الـحـرمـيـن لَـوْ أبـصـرْتَـنـا
لَـعَـلِـمْـتَ أنـكَ فـي الـعـبـادةِ تَـلْـعَـبُ
مَـن كـان يَـخْـضِـب خَـدَّه بـدمُـوعـه
فَـنُـحُـورُنـا بـدمـائـنـا تَـتَـخَـضَّـبُ
أو كـان يُـتْـعِـبُ خَـيْـلَـه فـي بـاطـل
فـخُـيـولـنـا يـوم الـصَّـبـيـحَـة تَـتْـعَـبُ

رِيحُ العبير لكم ونحنُ عَبِيرُنا
رهج السَّنابِكِ والغبارُ الأطيبُ
ولَقَد أتانا منْ مَقال نبينا
قَولٌ صَحِيحٌ صادقٌ لا يَكْذبُ
لا يستوي غُبار خيلِ الله في
أنفِ امرِيءٍ ودخان نار تَلْهَبُ
هذا كتاب الله يَنْطِقُ بيننا
ليسَ الشَّهيدُ بمَيِّتٍ لا يَكْذِبُ

دەڵێت: بە فوزەیلی کوڕی عەیاز گەشتم بە نوسراوەکەوە لە مزگەتی حەرام - لە کەعبە - دا، کاتێك خوێندیەوە چاوەکانی فرمێسکیان رشت و وتی، بەڕاستی ئەبو عەبدولڕەحمان راست دەکات و ئامۆژگاری منی کرد، پاشان وتی: ئایا تۆ ئەو کەسەیت فەرمووده دەنوسیتەوە؟ وتم: بەڵێ. وتی: کەواتە ئەم فەرموودەیە بنوسە وەك کرێی ئەو نوسراوەی ئەبی عەبدولڕەحمان کە بۆ ئێمەت هێنا، ئیمزای فوزەیلی کوڕی عەیازی لەسەر بکە.

مەنسوری کوڕی موعتەمەر لە ئەبی ساڵحەوە بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکم فێر بکە بە هۆیەوە پاداشتی تێکۆشەرانی رێگەی خوام دەست بکەوێت، فەرمووی: (ئایا دەتوانیت نوێژ بکەیت و دانەبڕێیت لە نوێژکردن و، بەڕۆژو بیت و نەیشکێنیت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من لەوە لاوازترم بتوانم ئەو کارە بکەم، پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر توانای ئەمەشت هەبوایە نەدەگەشتینە پلەی تێکۆشەرانی رێگەی خوا، ئایا نەتزانیوە کە ئەسپی تێکۆشەر (يستن في طوله) و بەمەش چاکەی بۆ دەنوسرێت).

دواتر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا ٱللَّهَ﴾ واتە لە هەموو کاروبارێکتاندا، وەك پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە موعازی فەرموو کاتێك ناردی بۆ یەمەن: (لە هەر کاروبارێکدا بوویت سنوری بەرنامەی خوا بپارێزە،

وە بەدوای خراپەیەکدا چاکەیەك بکە دەیسڕێتەوە، وە بە ڕەفتاری جوان هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکە) پاشان دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ واتە لە دنیا و قیامەتدا، ئەبو جورەیر دەڵێت: یونس بۆی گێڕامەوە، کە ئەبی وەهەب هەواڵی پێداوە، لە ئەبو سەخرەوە، لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرزیەوە، کە سەبارەت بە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ وتویەتی: خوا دەفەرموێت: لێم بترسن و سنور بپارێزن لەوەی لەنێوان من و ئێوەدایە تاکو سبەینێ کاتێك بەمن گەشتنەوە سەرفرازو رزگاربن.

## بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## سورەتی (النساء)

عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: سورەتی (النساء) لە مەدینە ناردراوەتە خوارەوە بەو شێوەیە ئیبنو مەردەویە دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرەوە و لە زەیدی کوڕی سابیتەوە و لە ڕێگای عەبدوڵڵای کوڕی لەهیعەوە لە عیسای برایەوە لە عەکریمەوە لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: کاتێ سورەتی (النساء) نێردرایە خوارەوە و پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (لا حبس) واتە: ئیتر بەندکردن نییە.

حاکم لە (المستدرك)دا لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: لەناو سورەتی (النساء)دا پێنج ئایەت هەیە ئەگەر دونیام هەبێت بە قەدەر ئەو پێنج ئایەتە دڵم پێی خۆش نییە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ [النساء: ٤٠]...، وە ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ﴾ [النساء: ٣١]...، وە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ [النساء: ٤٨]، و﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ﴾ [النساء: ٦٤]... الآية، ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾. پاشان وتوویەتی: ئەوە ئیسنادێکی (جید)ە، هەرچەندە عەبدوڕەحمان لە باوکی بیستووە.

ئیبنو حەجەر لە ڕێگای سالی مەریەوە لە قەتادەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: هەشت ئایەت هاتوونەتە خوارەوە لە سورەتی (النساء)دا کە خێرە بۆ ئەم نەتەوەیە لەو شوێنەوە ڕۆژی لێ هەڵدێ هەتا ئەو شوێنەی ڕۆژی لێ ئاوا دەبێت، هەروەها ئیبنو عەباس وتوویەتی: دەربارەی سورەتی (النساء) پرسیارم لێ بکەن، چونکە من هەر لە منداڵییەوە قورئان دەخوێنم.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ۝١﴾

خوای گەورە دەفەرموێ و فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە لێی بترسن، لێ ترسانیش پەرستنێتی بە تاك و تەنها و بێ شەریك و ئاگادارییان دەکاتەوە لەسەر توانای دروستکردنیان لە یەك نەفس ئەویش (ئادەمە) (سلاوی خوای لێ بێت) و ﴿وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾، وە هەر لەو نەفسە هاوسەرەکەی دروستکردووە ئەویش حەوایە (سلاوی خوای لێ بێت) لە پەراسووی لای چەپی دروستی کردووە لە لای دواوەی لە کاتێکدا خەوتبوو، کاتێ هەڵسا بینی ڕام بوو پێی و ئەویش بەم ڕام بوو.

ئیبنو ئەبی حاتیم لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئافرەت لە پیاو دروست بووە، خواردنەکەشی هەر لە پیاو بووە و پیاوی لە زەوی دروست کردووە خواردنەکەشی هەر لە زەویدا دروست کردووە، ئێوەش ژنەکانتان بەند بکەن، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (إن المرأة خُلِقَت من ضِلَع، وأن أعوجَ شيءٍ في الضِّلَع أعلاه، فإن ذهبت تُقِيمه كسرته، وإن استَمْتَعْتَ بها استمتعتَ بها وفيها عِوَجٌ). واتە: بەراستی ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە، لارترین شوێنی پەراسوو لە بەشی سەرەوەیەتی، ئەگەر هەوڵتدا ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، وە ئەگەر ویستت خۆشی لێوەربگری خۆشی لێوەربگرە با لاری تێدا بێت.

فەرمایشی: ﴿وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ﴾ واتە: لە ئادەم و حەوا پیاو و ژنی زۆری دروست کردوون، وە بەهەموو وڵاتانی جیهاندا بڵاوی کردوونەوە بەپێی جیاوازی جۆرەکانیان و سیفەتەکانیان و ڕەنگەکانیان و زمانەکانیان، پاشان دوای ئەوە دەیانگێڕێتەوە بۆ لای خۆی بۆ لێپرسینەوە.

پاشان خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ﴾ واتە: لە خوا بترسن بە ملکەچی بۆ کردنی و پەرستنی، ئیبراهیم و موجاهید و حەسەن وتوویانە: ﴿ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ﴾ وەك ئەوە وایە بڵێی (داوات لێ دەکەم بە خوا و بە ڕەحم).

زەحاك وتوویەتی: لەو خوایە بترسن کە پەیمانتان پێ بەستووە و ئاگاداری سیلەی ڕەحم بن نەیپچڕێنن، بەڵکو بە چاکی بیبەن بەڕێوەو بیگەیەنن، ئەوەش ئیبنو عەباس و عەکریمە و موجاهید و ڕەبیعە و چەند کەسی تر وتوویانە، هەندێکیان بە کەسرە و خوێندوویانەتەوە لە سەر (عطف) کردنی (ضمیر)، واتە: ﴿وَالْأَرْحَامِ﴾، وەك موجاهید و غەیری ئەویش وتوویانە.

کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ واتە: خوا هەمیشە چاودێرە بەسەرتانەوە لە هەموو بارودۆخێکتاندا و هەموو کردەوەیەکتاندا وەك فەرمایشی: ﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ [البروج: ٩]. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە (اعبد الله كانك تراه، فان لم تكن تراه فانه يراك) واتە: بەشێوەیەك خوا بپەرستە وەك ئەوەی چاوت لێی بێت ئەگەریش چاوت لێی نەبوو نەتبینی، ئەو تۆ دەبینێ.

ئەوە ڕێنماییە و فەرمانە بە چاودێری کردنی چاودێر لەبەر ئەوە خوای گەورە باسی ئەوەی کردووە کە بناغەی دروست کردنی خەڵك لە یەك باب و لە یەك دایکەوە بووە بۆ ئەوەی سۆزیان هەبێت بەرامبەر بە یەك و ئاگاداری لاوازەکانیان بن.

بێ سۆ لە سازەواری موسلیمدا چەسپاوە لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلییەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) کاتێ ئەو چەند کەسەی لە موضەرەوە هاتبوون جل دڕاو و ڕەش و رووت و هەژار بوون، دوای نوێژی نیوەڕۆ هەڵسا وتارێکی بۆ خەڵك داو لە وتارەکەیدا وتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە لەو خوایە بترسن کە لە یەك کەس بەدیهێناون. هەتا ئایەتەکە تەواو کرد و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ﴾ [الحشر: ١٨]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با هەر کەس سەیری خۆی بکات بزانێ چی پێش خۆی خستووە بۆ بەیانی. پاشان پاڵی پێوەنان بۆ خێر و سەدەقە کردن، فەرمووی: "تصدق رجل من ديناره ومن درهمه ومن صاع بره، من صاع تمره" واتە: هەر پیاوێك با لە دینارەکانی سەدەقە بکات یان لە درهەمەکانی یان لە مەنی گەنمەکەی یا لە مەنی خورماکەی، هەتا حەدیسەکەی بە تەواوەتی باس کردووە.

پاشان سێ ئایەتی خوێندووەتەوە کە ئەمەش لەوانەیە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ﴾... واتە: ئەی خەڵکینە خۆتان لە سزای خوایی بپارێزن.

﴿وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا ﴿٢﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴿٣﴾ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴿٤﴾﴾

خوای گەورە فەرمان دەدات بە دانەوەی ماڵ و سامانی هەتیو بە هەتیوەکە کاتێ باڵق بوون، وە قەدەغەی دەکات کە هیچی لێبخوورێت، یان لێی هەڵبگیرێت و بخرێتە سەر ماڵی خۆیان، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ﴾ سوفیانی سەوری لە ئەبی ساڵحەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پەلەمەکە بۆ بەدەستهێنانی ڕزقی حەرام پێش ئەوەی ڕۆژی حەڵاڵ کە خوای گەورە بۆی داناوی بێتە بەردەستت.

سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: شتی حەرام لە ماڵی خەڵك مەگۆڕن بە حەڵاڵی ماڵی خۆتان، وە دەڵێت: ماڵی حەڵاڵی خۆتان مەچێنن و ماڵی حەرامی خەڵك بخۆن.

سەعیدی کوڕی موسەیب و زوهری وتوویانە: لاواز مەدەن قەڵەو وەربگرن.

ئیبراهیمی نەخەعی و زەحاك وتوویانە: قەڵب مەدەن و چاك وەربگرن.

سوودی وتوویەتی: لەپێشەوە ئەچوون مەڕێکی قەڵەویان لەماڵی هەتیوو دەبرد و لەجێگەیدا مەڕێکی لاتیان دائەنا ئەیانوت: ئەوە مەڕ بەمەڕ. وە درەمی چاکیان وەردەگرت و خراپیان لە جێگەی دائەنا ئەیانووت: درەم بە درەمن هەموویان بەسەریەکەوە بخۆن.

فەرمایشی: ﴿وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ﴾ موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و موقاتیلی کوڕی حەیان و سوودی و سوفیانی کوڕی حوسەین

وتوویانە: واتە ماڵەکانیان تێکەڵ بەماڵی خۆتان مەکەن و بەسەریەکەوە بیانخۆن.

﴿إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾ ئیبنو عەباس وتوویەتی: واتە تاوانێکی گەورە زەبەلاحە.

ئیبنو مەردەویە لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: دەرباری ﴿حُوبًا كَبِيرًا﴾. پرسیار کرا، فەرمووی: واتە: تاوانێکی گەورەیە، بەڵام لە ئیسنادەکەیدا موحەممەدی کوڕی یوسفی کەدیمی هەیە، لاوازە.

ئیبنو مەردەویە بە ئیسنادی خۆی لە واسڵی مەولای ئەبی عویەینەوە لە ئیبنو سیرینەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ئەبو ئەیوب ژنەکەی تەڵاق دابوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (یا أبا أیوب، إن طلاق أم أیوب کان حُوبًا) واتە: ئەی ئەبو ئەیوب تەڵاقدانی دایکی ئەیوب تاوانێکی گەورەیە.

ئیبنو سیرین وتوویەتی: (حوب) واتە تاوان، ئیتر ئەبو ئەیوب ژنەکەی تەڵاق نەدا.

ئایەتەکە مانای ئەوەیە کە خواردنی ماڵی هەتیو لەگەڵ ماڵی خۆتاندا تاوانێکی گەورەیە و هەڵەیەکی زەبەلاحە لێی دوور بکەونەوە.

﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ﴾ واتە: ئەگەر کەسێکتان کچە بێ باوکێکتان بەخێو کرد لە ماڵەکەتاندا و ترسای کە مارەیی تەواوی نەدەیتێ کاتێ مارەی بکەی با ژنێکی تر بهێنی، چونکە ئافرەت زۆرن خوا ڕێی لێنەگرتووی بۆ ئەوە.

بوخاری وتوویەتی: ئیبراهیمی کوڕی موسا لە هیشامەوە لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕێتەوە کە هیشامی کوڕی عەروە لە باوکییەوە لە عائیشەوە بۆی گێڕاوەتەوە، کە پیاوێك کچێکی بێ باوکی لا بوو، مارەی کرد، ئەو کچە باخێکی هەبوو، لەگەڵ ماڵێکدا، ئەو ژنە هاوبەشی بوو لە باخ و ماڵەکەدا بێ ئەوەی ئەو پیاوە دادپەروەر بێت لە مارەیی و ماڵەکەیدا ئیتر ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟﴾.

پاشان بوخاری وتوویەتی: عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕاینەوە لە ئیبراهیمی کوڕی سەدەوە لە ساڵحی کوڕی کەیسانەوە لە ئیبنو شەهابەوە کە وتوویەتی: عەروەی کوڕی زوبێر دەربارەی ئایەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ﴾ لە عائیشەی پرسیووە ئەویش وتوویەتی: ئەی خوشکەزاکەم ئەو کچە بێ باوکە لەماڵی سەرپەرشتیکاریدایە هاوبەشی دەکات لە ماڵەکەیدا دوایی حەز بە ماڵ و جوانییەکەی دەکات سەرپەرشتیکارەکەی ئەیەوێ مارەی بکات بێ ئەوەی دادپەروەر بێت لە مارە پێدانیدا وەك خەڵك مارەیی بداتێ ئەوە جۆرە کەسانە لێیان قەدەغە بوو کە ئەو جۆرە ئافرەتانە مارە بکەن هەتا دادپەروەر نەبن لە پێدانی مارەییدا زیاد لە خەڵکیان بدەنێ، بۆیە فەرمانیان پێدراوە کە ژنێکی باشتر لەوان بۆ خۆیان مارە بکەن.

عەروە وتوویەتی: عائیشە وتوویەتی: خەڵك دەربارەی ئەو ئایەتە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾ [النساء: ١٢٧]. عائیشە وتوویەتی: خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾ [النساء: ١٢٧]. ئەوەیە کە یەکێ لە ئێوە حەزنەکات هەتیوی کەم ماڵ و کەم جوان مارە بکات لەبەر ئەوە ڕێگرییان لێ کرا ئەو هەتیوانە مارە بکەن کە ماڵ و جوانییان هەبوو بە دادپەروەری نەبێ ﴿مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾ واتە: بە ئارەزووی خۆتان ئەو ژنانە بهێنن کە حەزیان پێ ئەکەن، ئەگەر بتانەوێ دوو یان سێ چوار ژن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾ [فاطر: ١] واتە: فریشتەمان کردۆتە نێردراو، هەیانە جووت باڵی هەیە هەیانە سێ باڵ هەیانە چوار باڵ. ئەوە ئەوە ناگەیەنێ کە فریشتە هەیە لەوە زیاتر باڵی هەبێ بەپێچەوانەی پیاوانەوە کە تەنها ئەبێ چوار ژن زیاتر نەهێنن، لەم ئایەتەدا وەك ئیبنو عەباس و جەماوەری زانایان وتوویانە: لەبەر ئەوەی مەقامەکە مەقامی منەت کردن و ڕەواییە ـ ئەگەر دروست بوایە لە بوونی زیاد لە چوار ژن بەسەریەکەوە باسی دەکرد.

شافیعی وتوویەتی: سوننەتی پێغەمبەر کە لە خوا ڕوونکراوەتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆ هیچ کەس دروست نییە جگە لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە لە چوار ژن زیاتری بەسەریەکەوە هەبێت.

ئەوەی شافیعی بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت وتوویەتی، زانایان هەموو کۆن لەسەری جگە لە کۆمەڵێك لە شیعە کە دەڵێن: دروستە بوونی چوار ژن زیاتر هەتا نۆ ژن لە یەك کاتدا هەندێکیان دەڵێن: بەبێ سنوور، وە هەندێکیان لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە چوار ژن زیاتری هەبووە هەتا نۆ وەك لە هەردوو سازەواردا هاتووە، بەڵام بوونی یانزە، وە لە هەندێ زاراوەی بوخاری دا هاتوون، بوخاری بە هەڵواسراوی هێناوێتی نەك بە سازی.

لە ئەنەسەوە بۆیان گێڕاینەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پانزە ژنی هێناوە و سیانزەیانی گواستووەتەوە و لە یەك کاتدا یانزەی هەبووە کە مردووە نۆ ژنی بەجێهێشتووە ئەوە لای زانایان لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بووە بێ ئەوەی بۆ کەسی تر ببێ بەپێی ئەو فەرموودانەی باسی دەکەین کە ئەبێ پیاوی موسڵمان هەر چوار ژنی هەبێ بەسەریەکەوە لەوبارەیەوە چەند فەرموودەیەك دێنینەوە:

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: کە غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفی موسڵمان بوو، دە ژنی هەبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (اختر منهن اربعا) واتە: چواریان لێ هەڵبژێرە. لە سەردەمی عومەردا ژنەکانی تەلاق دا و ماڵەکەی لە نێوان کوڕەکانیدا دابەش کرد ئەوە کە گەیشتووە بە عومەر وتی: من وا ئەزانم شەیتان لەوانەدا کە لە ئاسمان دەیبیستێ گوێ لە کاتی مردنی تۆ بووە هاتووە داوێتی بە گوێتا لەوانەیە ماوەیەکی کەم بژیت، سوێند بە خوا ئەبێ ژنەکانت بگێڕیتەوە و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەت یان ئەیانکەمە میراتگر و فەرمان دەدەم گۆڕەکەت ڕەحم بکەن وەك چۆن گۆڕی ئەبی ڕەغال ڕەجم دەکەن. ڕووی بەڵگەیەتی حەدیسەکە ئەوەیە ئەگەر دروست بوایە پیاو بەسەریەوە چوار ژن زیاتر بوایە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) ڕێی پێ ئەدا هەموو ژنەکانی لا بمێننەوە، چونکە لەگەڵیدا هەموویان موسڵمان بوو بوون ئەوەبوو فەرمانی پێدا چواریان لای خۆی بهێڵێتەوەو لەوانی تر جیابێتەوە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروست نییە چوار ژن زیاتر بەسەریەکەوە مارەیان بکات.

فەرموودەیەکی تر لەو بارەیەوە هاتووە لە ئەبی داودەوە کە حاریسی کوڕی

قەیس کوڕی عومەیرەی ئەسەدی وتوویەتی: کە موسڵمان بووم هەشت ژنم هەبوو، لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) باسم کرد، فەرمووی: (اختر منهن أربعاً وفارق الأخرى)، واتە: چواریان کە خۆت حەزیان پێ ئەکەی هەڵبژێرە و دەست لەوانی تریان هەڵبگرە. ئەڵێ منیش کامیان زۆر لای مابوورەوە و پیرەژنێك بوو کە شەست ساڵ ژنم بوو تەڵاقم داو چوارەکەی ترم لای خۆم هێشتەوە.

ئەوانە هەموو شاهیدی راستی ئەو حەدیسەن کە غەیلان لە ئێشەوە هێنابووی وەك بەیهەقی وتوویەتی بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت.

﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ واتە: ئەگەر ترسی ژنی زۆرتان هەبوو کە نەك دادپەروەر نەبن لە نێوانیاندا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: با بەپەرۆش بن هەر ناتوانن دادپەروەر بن لە نێوان ژنەکانتاندا. جا هەر کەس لەوە ترسا با تەنها ژنێك بهێنێ، یان جاریە و کەنیزەکتان هەبێت، چونکە ئەوان دابەشکردنی کات بۆیان پێویست نییە، بەڵام دادپەروەری لە نێوان ئەوانیشدا هەر پەسەندە هەر کەس بیکات چاکە ئەگەر نەشیکرد خراپ نییە بۆی کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ﴾ [النساء: ١٢٩]،. هەندێ لە ڕاڤەکاران وتوویانە: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟﴾. مانای وایە خێزانتان زۆر نەبێ ئەوەش وەرگیراوە لە فەرمایشی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً﴾ واتە: لە هەژاری ترسان ﴿فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ﴾ [التوبة: ٢٨]، پاشان خودا بە فەزڵی خۆی هەر کاتێ ویستی دەولەمەندتان دەکات. عەرەب کاتێ پیاوێك هەژار دەکەوێت پێی دەڵێن (عال الرجل)، بەڵام ئەو ڕاڤەکردنە لەوێدا چاوپیاخشاندنەوەی دەوێ، چونکە ئەو کەسە وەك چۆن لە زۆری خاوخێزان دەترسێ کە ژنی زۆری ئازادی هەبێ، هەروەها کەنیزەکی زۆریشی هەبێ، بەڵام راستی ئەوەیە کە جەماوەر وتوویەتی: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟﴾ واتە ستەم نەکەن. عەرەب کاتێك حاکمێك ستەم و نادادپەروەری دەکات دەڵێن: (عال فی الحکم)، هوشەیم لە ئەبی ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوە کە ئەهلی کوفە سەرزەنشتی عوسمانیان دەکرد لە شتێکدا ئەویش بۆی نووسین (إنی لست بمیزان لا أعول) رواه ابن جریر...

لە عائیشەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ذلك أدنى الا تعولوا" واتە: "لا تجۆروا" ستەم مەکەن، ئیبنو ئەبی حاتەم دەڵێت: ئەو حەدیسە ڕاست نییە، ڕاستی ئەوەیە قسەی عائیشە خۆی بێت، بەڵام کۆمەڵێك دەڵێن لەوانە ئیبنو عەباس و عائیشە و موجاهید و عەکریمە و حەسەن و ئەبی مالیك و ئەبی ڕەزین و نەخەعی و شەعبی و زەحاك و عەتای خۆراسانی و قەتادە و سوودی و موقاتیلی کوڕی حەیان وتوویانە: واتە (لا تمیلوا) واتە: مەیلتان بە لای یەکێکیانەوە نەبێ بێ ئەوانی تر.

﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەلحە وتوویەتی: (النحله) مارەیە، وە عائیشە وتوویەتی: (النحله) (فريضة) فەرزە.

ئیبنو زەید وتوویەتی: (النحله) لە زمانی عەرەبیدا واجبە، واتە: مارەیی پێویستە کە لەسەر خۆتان داتاناوە بیدەن بە هاوسەرەکانتان واتە بەشێك نەبێت کە پێویست بێت بۆیان مارەیان مەدەن، وە دوای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بۆ کەس نییە ئافرەتێك مارە بکات بەبێ مارەیی پێویست، وە دروست نییە ناونانی مارەیی بە درۆ و بە ناهەق، واتە: لەسەر پیاو پێویستە مارەیی بدات بە ژنەکەی هەرچۆنێك بێت، وە ئەبێ بە دڵی فراوان بیداتێ بەو شێوەیە پێویستە ژن مارەیی بە دڵی فراوانەوە بدرێتێ ئەگەر ئەویش شتێکی لەو مارەیی ناونراوە دایەوە بە پیاوەکە با بیخوات حەڵاڵە و خاوێنە، لەبەر ئەوە خوا فەرموویەتی: ﴿فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا﴾ ئەگەر ئەوان هەر بۆ خۆیان شتێکیان لە مارەییەکە بە ئێوە بەخشی بیخۆن و نۆشی گیانی بێ.

لە عەلییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە وتوویەتی: "ئەگەر کەسێکتان شوێنێکی تووشی ئازار بوو با داوای سێ درەم لە ژنەکەی بکات یان وەك ئەوە با هەندێ هەنگوینی لێ بکرێ، پاشان لەگەڵ ئاوی باراندا تێکەڵی بکات ئەبێتە تێکەڵەیەك شیفایەکی چاك دەبێت، ئەبی سالح دەگێڕێتەوە ئەوسا کە پیاوێك کچەکەی دەدا بە مێرد مارەییەکەی هەڵدەگرت بۆ خۆی و هیچی نەئەدا بە کچەکەی، خوای گەورە ئەوەی لێ قەدەغە کردن و ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ﴾ (رواه ابن أبي حاتم وابن جرير).

وە ئیبنو ئەبی حاتە لە عەبدوڕەحمانی بەیلەمانییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی:

پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ﴾ وتیان ئەی نێردراوی خوا پەیوەندییەکانیان چییە لە نێوانیاندا؟ فەرمووی: ئەهلەکەی لەسەر چی ڕازی بوون.

هەر لە عەبدوڕەحمانی کوڕی بەیلەمانییەوە هاتووە کە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وتاری ئەدا بۆمان سێ جار فەرمووی: "ژنە ئازادەکان مارە بکەن" پیاوێك هەڵسا وتی: پەیوەندییەکان چییە لە نێوانیاندا؟ فەرمووی: ئەوەی کەس و کاریان لەسەری ڕازی بوون. (لەسەنەدەکەیدا لاوازی هەیە و پچڕاندنی تێدایە).

﴿وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٥ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ٦﴾

واتە:ماڵی خۆتان کە خوا کردوویەتییە مایەی خۆشگوزەرانیتان مەدەنە دەست کەمئاوەزان! بەڵام جلك و بژێوییان لە ماڵی خۆتان بۆ دابین بکەن و بە ڕووی خۆشییەوە بیاندوێنن، هەتیوان تاقیکەنەوە تا دەبینە گەنجی ڕەشید، جا ئەگەر دیتان خاس و خراپ لە یەکتر جوێ دەکەنەوە ئەوسا ماڵیان بدەنەوە لە ترسی ئەوەشدا نەوا گەورە ببن بەدەر لە ئەندازە و بەلەزماڵیان مەخۆن کێ زەنگینە خۆپارێزی کێش نەدارە هەر ئەوەندەی کە پێویستی ژیانێتی بە دابی ڕۆژ لێی هەڵگرێ، هەر کاتێکیش ماڵەکەیان دەدەنەوە با شایەت ئاگایان لێ بێ بۆ لێپرسینەوەش هەر خودا بەسە، خوای پاك و بێگەرد نایەڵێت کەم ئاوەزەکان تەسەڕوف لەو ماڵەدا بکەن کە خوا کردوویەتی بە مایەی گوزەرانی بۆیان، واتە ژیانیانی پێ دەبەن بەڕێوە بە بازرگانی و شتی تر، ئالێرەدا حیجر دەخرێتە سەر کەم ئاوەزان، ئەوانیش چەند بەشێکن، جاری وا دەبێ حیجر لەبەر منداڵی دەبێ، چونکە منداڵ هیچ دەسەڵاتێکی نییە و جاری وادەبێ لەبەر شێت بوونە و جاری وا دەبێ لەبەر خراپی هەڵسوکەوتێتی یان لەبەر کەم ئاوەزی و کەم

دینییە، وە جاری وایە لەبەر موفلیسییە، ئەویش ئەوەیە کاتی پیاوێك زۆر قەرزدار دەبێ ماڵی کەم دەبێ، ناتوانێ ئەو قەرزە بداتەوە کاتێ خاوەن قەرزەکان داوا لە حاکم دەکەن حیجر بخاتە سەری، حاکمیش حیجری دەخاتە سەر.

زەحاك و ئیبنو عەباس دەربارەی ﴿وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ﴾، وتوویانە: ئەوانە منداڵ و ژنەکانتانن، هەروەها ئیبنو مەسعود و حەکەمی کوڕی عویەینە و حەسەن و زەحاك وتوویانە: ئەوانە ژن و منداڵن.

سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: ئەوانە هەتیون، وە موجاهید و عەکریمە و قەتادە وتوویانە: ئەوانە ژنەکانن.

لە ئەبی ئومامەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن النساء سفهاء إلا التی اطاعة قیمها" واتە: بەراستی ژنان کەم ئاوەزن جگە لەوانەی بەرفەرمانی مێردەکەیان دەکەن.

لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە ﴿وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ﴾، وتوویەتی: ئەوانە خزمەتکارەکانتانن ئەوانە شەیتانە ئینسییەکانن.

﴿وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پەلاماری ئەو ماڵە مەدە کە خوا پێی داوی و بژێویت لەسەریەتی بیدەیت بە ژنەکەت یا بە منداڵەکانت، پاشان چاوت لە دەستی ئەوان بێت، بەڵکو دەستت بە ماڵەکەتەوە بگرە و چاکسازی تێدا بکە با تۆ ئەو کەسە بیت کە ماڵیان بۆ سەرف دەکەیت بە کڕینی جلوبەرگ و بژێوی و پێویستییان.

لە ئەبی موساوە هاتووە وتوویەتی: سێ جۆر کەس لە خوا ئەپاڕێنەوە نزایان وەرناگیرێ: پیاوێك ژنێکی ڕەوشت خراپی هەبێت و بەڕەڵای نەکات و پیاوێك ماڵی خۆی بداتە دەست کەم ئاوەز، پیاوێك قەرزی دابێت بە پیاوێك شایەتی لەسەر وەرنەگرتبێ.

ئەم ئایەتە پیرۆزە چاکە کردنی تێدایە بەرامبەر خێزان و ئەوانەی لە ژێر حیجردان بە فیعلی لە نەفەقەکێشان و جلوبەرگ و ڕۆزی و قسەی خۆش و ڕەوشتی چاك.

﴿وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ ئیبنو عەباس و موجاهید و حەسەن و سوودی و موقاتیلی کوڕی حەیان وتوویانە: واتە: تاقییان بکەنەوە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ﴾، موجاهید وتوویەتی: واتە: خەو بینین، جەماوەری زانایان وتوویانە: باڵق بوونی کوڕ جاری وا هەیە بە خەوبینین دەبێ ئەویش لە خەویا ئەوە ببینێ کە ئاوی پێ دێتەوە ئەو ئاوەی منداڵی پێ دروست دەبێت.

لە سونەنی ئەبی داودا لە عەلییەوە هاتووە وتوویەتی: لە پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لێ بێت) ئەمانەم لەبەر کردووە: "دوای خەو بینین هەتیوی نامێنێ، بێدەنگبوونیش نییە لە خۆرهەڵاتنەوە تا شەو".

لە عائیشەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "رفع القلم عن ثلاثة، عن الصبي حتى يحتلم وعن النائم حتى يستيقظ وعن المجنون حتى يفيق". واتە: پێنووس لەسەر سێ جۆر کەس هەڵگیراوە، لەسەر منداڵ هەتا خەو دەبینێ و لەسەر خەوتوو هەتا بە ئاگا دێتەوە وە لەسەر شێت هەتا چاك دەبێتەوە.

یان پانزە ساڵ تەواو بکات، ئەوەشیان لەو فەرموودە چەسپاوەوە وەرگرتووە کە لە هەردوو سازەواردا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە وتوویەتی: ڕۆژی ئوحود نیشان پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) درام چواردە ساڵ بووم، ڕێی پێنەدام، بەڵام ڕۆژی خەندەق کە پانزە ساڵ بووم نیشان پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) درام ڕێی پێدام. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێ ئەو فەرمودەیەی پێگەیشت وتی: ئەوە جیاوازی نێوان بچووك و گەورەیە.

زانایان جیاوازن لەسەر دەرهاتنی تووکی بەر، کە ئایا بەڵگەیە لەسەر باڵقبوون یان نا؟ ئەویش لەسەر سێ وتەیە: لە قسەی سێیەمدا لە نێوان منداڵانی مسوڵمانانداا جیاوازی هەیە وە نێوان منداڵانی ئەهلی زیمە کە باڵقبوونە دەرهەقیان، چونکە بەوە پەلە ناکرێت لە دانانی جزیە لەسەریان. ڕاستیی ئەوەیە تووکی بەر هاتن باڵقییە دەرهەق بە هەموو، چونکە ئەوە فەرمانێکە خەڵك تێیدا یەکسانن. پاشان سوننەت بەڵگەیە لەسەر ئەوە بەپێی ئەو فەرموودەیەی ئیمام ئەحمەد لە عەتیەی قورەزییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ڕۆژی قورەیزە نیشان پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) دراین، ئەوەی تووکەبەری هاتبوو

کوشتیان، هەر کەس توکەبەری نەهاتبوو بەرەڵایان کرد، وە من لەو کەسانە بووم کە توکەبەرم نەهاتبوو، بەرەڵایان کردم، ئەوەش لەبەر ئەوەی بوو کە سەعدی کوڕی موعاز بووە ناوبژیوان داوای کرد هەرچی جەنگاوەریان هەیە بکوژرێ و ژن و منداڵیان بە دیل بگیرێ.

ئەبو عوبێد قاسمی کوڕی سەلام لە کتێبی (الغریب) دا وتوویەتی: لە ئیبنو عەلییەوە لە ئیسماعیلی کوڕی ئومەیەوە دەگێڕێـەوە لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حیبانەوە لە عومەرەوە، کە کوڕێك بە هۆنراوە باسی کچێکی کردبوو بە خراپە، عومەر وتی: سەیری بکەن ئەگەر توکی بەری هاتبوو داری حەدی لێ بدەن کە سەیریان کرد توکەبەری نەهاتبوو داری حەدی لەسەر هەڵگرت.

ئەبوعوبێد وتوویەتی: (ابتهرها) واتە: تاوانی داوێن پیسی دابوە پاڵ، چونکە (الابتهار) مانای وایە کوڕەکە وتبووی کاری خراپم لەگەڵدا کردووە بە درۆ، بەڵام ئەگەر راست بێ پێی دەڵێن (الابتیار).

﴿فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ جا ئـەگـەر دیـتـان خـاس و خراپ لەیەك جیا دەکەنەوە ئەوەسا ماڵیان بدەنەوە. سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: واتە چاك بوون لە ئایینەکەیاندا و پارێزەر بوون بۆ ماڵەکانیان. زانایان وتوویانە: هەر کاتێك غوڵامەکە باڵقبوو، ئایینی چاك بوو، توانی ماڵی خۆی بپارێزێ، ئەوە حیجری لەسەر لائەبرێ، ئەبێ ئەو ماڵەی لە ژێر دەستی سەرپەرشتیارەکەیدایە بدرێتەوە دەستی.

وە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟﴾ خوای گەورە لەم ئایەتەدا قەدەغەی دەکات ماڵی هەیتو بخورێ بێ ئەوەی پێویست بێت ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ﴾ هەر کەس پێویستی بە ماڵی هەیتوو نەبوو ئەبێ دەست پاك بێت و هیچی لێ نەخوات.

شەعبی وتوویەتی: بۆ ئەو کەسە وەك خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو و خوێن وایە.

﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ لە عـائیشـەوە هـاتووە وتوویەتی: ئەم

ئایەتە دەربارەی ماڵی هەتیو هاتۆتە خوارەوە کە سەرپەرشتیکارەکەی بەسەری بوەستێ و چاکسازی تێدا بکات ئەگەر ئەو کەسە موحتاج بوو با لێی بخوات بە قەدەر ئەوەندەی هەڵدەستێ بە سەرپەرشتی کردنی.

زانایانی شەریعەتی ئیسلامی وتوویانە: بۆی هەیە کەمتر لەم دوو فەرمانە لێی بخوات، وەك کرێی بەرامبەری، یان ئەوەندەی پێویستی پێیەتی. وە جیاوازییان هەیە لەوەدا ئەگەر ئەو کەسە حاڵی باش بێت ئەوا ئەبێ ئەوەی خواردوویەتی بیگێڕێتەوە بۆ هەتیوەکە، ئەوەش لەسەر دوو قەولە: یەکەمیان، نەخێر، چونکە بۆ کرێی کردەوەکەی لێی خواردووە کە هەژار بووە، ئەوەش لای هاوەڵەکانی شافیعی ڕاستە، چونکە ئایەتەکە لێ لە خواردنی بەبێ لە جیاتی ڕەوا کردووە.

ئەحمەد لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە پێغەمبەری (دروودی خوای لێ بێت) پرسی وتی: من هیچ سامان و ماڵێکم نییە، بەڵام سەرپەشتیکاری ماڵی هەتیووم، فەرمووی: (كل من مال يتيمك غير مسرف ولا مبذر ولا متأثل مالا ومن غير أن تفي مالك او قال يفدي مالك بماله). واتە: لە ماڵی هەتیوەکەت بخۆ بێ فیڕۆدانی یان ماڵی خۆت بە ماڵی ئەو بپارێزی، هەر لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرییەوە هاتووە، وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: من سەرپەرشتیکاری ماڵی هەتیوم، ماڵی هەیە، بەڵام من هیچم نییە، لە ماڵەکەی بخۆم؟ فەرمووی: "بالمعروف غير مسرف" واتە: بە چاکە بێ ئەوەی بە فیڕۆی بدەی.

لە جابیرەوە هاتووە پیاوێك وتی: ئەی نێردراوی خوا لەسەر چی لە هەیتوەکەم بدەم؟ فەرمووی: "ما كنت ضارباً منه ولدك غير واق مالك بماله ولا متأثل منه مالاً"، واتە: لەسەرچی لە منداڵەکەی خۆت دەدەیت، بێ پاراستنی ماڵەکەت بە ماڵی ئەو وە ماڵی لێ مەسێنە.

ئیبنو جەریر لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای ئیبنو عەباس وتی: من چەند هەیتو بەخێو دەکەم وشتریان هەیە و خۆشم وشترم هەیە، من شیری وشترەکانی خۆم ئەبەخشم ئیتر شیرمان بۆ نامێنێتەوە، لەشیری وشترەکانی ئەوان چی بۆ من حەڵاڵە؟ وتی: ئەگەر تۆ بە

شوێن ونبووەکانیدا دەگەڕێی وە نەخۆشەکانیان تەداوی دەکەیت، وە دولاویان بۆ دروست دەکەیت و ئاویان دەدەیت لە شیرەکەیان بخۆرەوە ئەوەندەی زیان بە بەچکەکانیان نەگەیەنی و گوانەکانیان بنەبڕنەکەی.

وتەی دووەمیان: بەڵێ، چونکە ماڵی هەتیو قەدەغەیە خواردنی، بەڵکو تەنها بۆ پێویستی ڕەواکەر ئەبێ چەندی لێخواردووە بدرێتەوە وەك خواردنی ماڵی کەسێکی تر لە لایەن ناچارەوە.

لە حارسی کوڕی میزرەبەوە هاتووە وتوویەتی: عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: من دەربارەی ئەم ماڵە وەك سەرپەرشتی کاری هەتیوم ئەگەر پێویستم پێی نەبێ دەست پاك دەبم ئەگەر پێویستم پێی هەبێ لێی قەرز دەکەم کاتێ حاڵم باش بوو ئەیدەمەوە.

ئیبنو عەباس دەربارەی ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ وتوویەتی: ئەوە قەرزە، هەر ئیبنو عەباس دەربارەی: ﴿فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ وتوویەتی: واتە: بە سێ پەنجە لێی بخوات.

هەر لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە دەربارەی ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ وتوویەتی: لە ماڵی خۆی بخوات و ڕۆزی لەسەری بێت بۆ ئەوەی پێویستی بە ماڵی هەتیو نەبێت.

عامیری شەعبی وتوویەتی: نابێ لێی بخوات هەتا ناچار دەبێت وەك چۆن بۆ گۆشتی مردارەوەبوو ناچار دەبیت، ئەو کاتە ئەگەر لێی خوارد ئەبێ بیداتەوە.

﴿فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ واتە: کاتێ ماڵەکانتان دانەوە دەستیان دوای باڵقبوونیان و زانیتان خاس و خراپ لەیەك جیادەکەنەوە، جا کاتێ ماڵەکانتان دایەوە دەستیان ﴿فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ﴾ واتە: شایەتیان لەسەر بگرن، ئەوە فەرمانێکە لە خواوە بۆ سەرپەشتیکارانی هەتیوو کە باڵقبوون ماڵەکانیان بدەنەوە دەست بە شایەتی چەند کەس بۆ ئەوەی نەك ئینکاری وەرگرتنەوەی لێ بکات، پاشان ئەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾ واتە: بەسە کە خوا لێپرسەرەوەیە و شایەتە و چاودێرە بەسەر سەرپەرشتیکارانی هەتیوانەوە لە حاڵی چاودێریکردنی هەتیوەکان و کاتی پێدانەوەی ماڵەکانیان کە ئایا تەواوە یان کەموکوڕە، چونکە هەر خوا بە حاڵیان دەزانێ.

لەبەر ئەوە لە سازەواری موسلیمدا چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە ئەبو زەڕی وتووە: من بە لاوازت دەزانم چیم بۆ خۆم پێخۆشە بۆ تۆشم پێ خۆشە نەیبە بە سەرکاری دوو کەس و سەرپەرشتی ماڵی هەتیوو مەکە.

﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُو الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾

واتە: کەلەپوری داری و باب و خزمی نزیك کەم بێ یا زۆر نێرینە بەشی خۆی هەیە و مێینەش تیایدا بەشدارە و بەشیان بۆ بڕیاردراوە گەر لە وەختی دابەشینی کەلەپوردا، کەس و کاری هەتیوان و بێنەوایان لەوێ هەبوون لەو ماڵە شتێکیان بدەنێ و بە ڕووی خۆشەوە بیاندوێنن، ئەو کەسانەی لە پاش خۆیان منداڵانی سەروپێچکەی بێ دەسەڵات بەجێ دێڵن، با لەوەسێت کردنیدا ترسی خوایان لە دڵدا بێ و شتێکی وا لە پاش خۆیان ڕاسپێرن، هیچ ناهەقی تێدا نییە ئەو کەسانەی بە ناڕەوا دارایی هەتیوان دەخۆن با بزانن کە ئاگرێ دەخەنە هەناویانەوە و تووشی ئاگرێکی بە هەڵپە و گڕ دەبن.

سەعیدی کوڕی جوبەیر و قەتادە وتوویانە: هاوبەشدانەرەکان دارایی و ماڵەکانیان دادەنا بۆ پیاوە گەورەکان و میراتیان نە ئەدا بە ژن و منداڵەکانیان، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نادرەوە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ﴾ واتە: هەموان لە حوکمی خوادا یەکسانن و یەکسان دەبن لە میراتدا، هەرچەندە جیاوازن لەوەدا کە خوای بۆی داناون بەپێی نزیکی لە مردووەکەیانەوە بەپێی هاوسەرێتی یان بەپێی وەلا، چونکە ئەمانیش وەك پشت وان.

لە جابیرەوە هاتووە وتوویەتی: ئوم کوجە هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێرراوی خوا من دوو کچم هەیە باوکیان مردووە و هیچیان نییە، ئیتر خوا ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ﴾ وتراوە کاتێ ئامادەی دابەشکردنی میرات بوون خزمان ئەوانەی میراتگر نین ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ﴾ هەتیوان و هەژاران با لەو میراتییە بەشیان بدەن، ئەوە لە سەرەتای ئیسلامەوە واجب بوو و وتراوە پەسەند بووە.

زانایان جیاوازییان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایا ئەوە سڕاوەتەوە یان نا لەسەر دوو قەولە: بوخاری لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە ئەو ئایەتە ئیشی پێ ئەکرێ و نەسڕراوەتەوە، موجاهید وتوویەتی: ئەوە پێویستە لەسەر کەس و کاری مردوو بە دڵی صافەوە.

ئیبنو سیرین و سەعیدی کوڕی جوبەیر و مەکحول و ئیبراهیمی نەخەعی و عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح و زوهری و ئەبی عالیە و شەعبی و حەسەن کە ئەوە واجبە، لە ئیبنو سیرینەوە هاتووە کە وتوویەتی: لای من وەستێکی عوبیدەم فەرمانی کردبوو کە مەڕێك سەرببڕن دەرخواردی خاوەنی ئەو ئایەتە بدەن و وتی: ئەگەر ئایەتە نەبوایە ئەبوا لە ماڵی من بدرایە.

وە لە زوهرییەوە هاتووە کە عوروە لە میراتەکەی بەشی درا کاتێ ماڵەکەیان دابەش کرد.

زوهری وتوویەتی: ئەوە ئایەتێکی مەحکەمە و کاری پێ دەکرێت.

مالیك لە عەبدولکەریمەوە لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەوە هەقە و واجبە هەتا بە دڵی صافەوە بێت.

## باسی ئەو کەسەی بۆ ئەوە چووە ئەوە فەرمانە بۆ وەسێت کردن بۆیان

عەبدوڕەزاق وتوویەتی: ئیبنو جورەیج لە ئیبنو ئەبی مەلیکەوە بۆی گێڕاینەوە کە ئەسمای کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری سدیق و قاسمی

کوڕی موحەممەد پێیان ڕاگەیاندووە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر میراتی عەبدوڕەحمانی باوکیان دابەش کرد کاتێ عائیشە مابوو، وتوویانە: هەژار و خزم نەما لە میراتەکە بەشی نەدەن، وتوویانە: ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ﴾ ئەو ئایەتەی دوای ئەو دێت سڕیویەتییەوە کە دەفەرمووێت: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوْلَٰدِكُمْۖ﴾.
عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئایەتی: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ﴾ پێش ئەوەی دانانی بەشەکان بێنە خوارەوە بووە، دوای ئەوە خوای گەورە بەشە دانراوەکانی (الفرائض)ی ناردە خوارەوە و هەر کەس مافی خۆی بۆ دیاری کرد. ئیتر ئەوانەی مردووە کە ناوی لێ نابوو کرانە سەدەقە. هەر لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە وتویەتی: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ﴾ ئایەتی میرات سڕیویەتییەوە بۆ هەر مرۆڤێك بەشی خۆی دانا لەوانەدا کا باوك و دایك و خزمان بەجێی دێڵن کەم بێت یان زۆر.

هەروەها سەعیدی کوڕی موسەیب وتوویەتی: ئەو ئایەتە سڕراوەتەوە و ئایەتی میرات و وەسێت سڕیویەتییەوە.

هەروەها عەکریمە و ئەبی شەعسا و قاسمی کوڕی موحەممەد و ئەبی ساڵح و ئەبی مالیك و زەیدی کوڕی ئەسلەم و عەتای خۆراسانی و موقاتیلی کوڕی حیبان و ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕەحمان وتوویانە: ئەو ئایەتە سڕراوەتەوە (منسوخە).

ئەوەش بۆچوونی جەماوەری زانایانی ئایینی و هەر چوار پێشەواکە و هاوەڵەکانیانە، عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ﴾ وتوویەتی: ئەوە دابەشکردنی میراتە، واتاکەشی بەپێی ئەوانەی ئەوەیە ئەگەر ئەو هەژارانە لە خزمان کە میراتگر نین و هەیتوان و کەم دەستان ئامادەی دابەشکردنی ماڵێکی زۆر بوون ئەگەر حەزیان کرد شتێکیان پێ بدرێ کاتێ ئەبینن یەکێکیان ئەوە وەردەگرێ و ئەویان ئەوە وەردەگرێ ئەوانیش هیوا بڕاو هیچیان نەدرێتی، خوای گەورە خاوەن بەزەیی فەرمانی داوە شتێکیان بدەنێ بۆ چاکە کردن بەرامبەریان و سەدەقە کردن پێیان وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦۖ﴾ [الأنعام:

[١٤١] واتە: هەرکە میوەیان پێدەگات لێی بخۆن و لە ڕۆژی میوەچنینا بەشی خوداش جیا بکەنەوە بۆ هەژاران وە زەمی ئەوانە دەکات کە بەربوومەکانیان بەشەو دەگوێزنەوە لەترسی ئەوەی نەك هەژاران و کەم دەستان پێی بزانن وەك دەربارەی خاوەن باخەکان هەواڵی داوە: ﴿إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ﴾ [القلم: ١٧] سوێندیان خوارد کە بە شەو باخەکەیان دەڕنن و وتوویەتی: ﴿فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾﴾ [القلم: ٢٣ ـ ٢٤] واتە: ڕێوەچوون پێکەوە چپەیان دەکرد کە نابێ ئەمڕۆ چ هەژار بێتە ناو باخەکەی ئێوە، وە فەرموویەتی: ﴿دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ۖ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا﴾ [محمد: ١٠] واتە: خودا تەفروتونای کردن، بۆ لە دین لادەرەکانیش هەر شتێکی ئاوا هەیە.

هەر کەس ئینکاری مافی خوای کرد بەسەریەوە سزای ئەدا لە خۆشەویسترین ئەو ماڵەی هەیەتی. لەبەر ئەوە لە فەرموودەدا هاتووە: "ما خالطت الصدقة مالا الا أفسدته"، خێر و سەدەقە تێکەڵ بەهەر ماڵێك نەبێت گەندەڵی دەکات.

﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەوە دەربارەی پیاوێکە کە لەسەرە مەرگدایە پیاوێك گوێی لێ دەبێ وەستێك دەکات زیان بە میراتگرەکانی دەگەیەنێ، خوای گەورە فەرمان دەدات بەو کەسەی گوێبیستی کە لە خوا بترسێ و ڕێی لێ بگرێ و هەڵەکانی بۆ ڕاست بکاتەوە، ئاگای لە میراتگرانی ئەو کابرایە بێت وەك ئاگای لە میراتگرەکانی خۆیەتی، موجاهید و چەند کەسێکی تر وتوویانە.

لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کاتێ چوو بۆ لای سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص سەردانی کرد، وتی: ئەی نێردراوی خوا من ماڵێکی زۆرم هەیە، کچێکم هەیە، میراتگر، ئایا دوو سێیەکی ماڵەکەم بکەم بەخێر؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەك باشە، هەرچەندە سێیەك زۆرە. پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "إنك أن تذر ورثتك أغنيا و خير من ان تذرهم عالة يتكففون الناس" واتە: ئەگەر تۆ میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی

بەجێ بهێڵی خێرترە بۆ تۆ لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵی هەژار بن و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە.

زانایانی ئایینی وتوویانە: ئەگەر میراتگرانی مردووەکە دەوڵەمەند بن پەسەندە بۆ مردووەکە لە وەسیەتەکەیدا سێیەك بنوسێ، وە ئەگەر هەژاربوون پەسەندە کە لە سێیەك کەمتر بنووسێ وە وتراوە مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە لە خوابترسین لە دەست بەسەرماڵی هەتیودا و نەیخۆن و بەفیڕۆی نەدەن.

پاشان ئاگاداریان ئەکاتەوە کە خواردنی ماڵی هەتیو بە ستەم، ئەو کەسە ئاگر دەکاتە زکییەوە، لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾، واتە: کاتێ ماڵی هەتیویان خوار بەبێ هۆ ئەوە ئاگر دەکەنە زکیان لە ڕۆژی قیامەت لەناو سکیاندا بڵێسە دەبەستێ.

لە ئەبی هورەیەرووە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (اجتنبوا السبع الموبقات، قيل: يا رسول الله، وما هنّ؟ قال: الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التى حرّم الله إلا بالحق، واكل الرّبا، وأكل مال اليتيم، والتولى يوم الزحف وقذف المحصنات المؤمنات الغافلات) واتە: دوورکەونەوە لە حەوت ماڵ وێرانکارەکە، وتیان: ئەی نێردراوی خوا حەوتە چین؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان، سیحر کردن، کوشتنی کەسێکە خوا حەرامی کردووە بە هەقی خۆی نەبێ، وە خواردنی سوو، خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵاتن لە ڕۆژی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە، تاوان گرتنە ئافرەتی باوەڕداری بێ ئاگا لە تاوان.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: وتمان: ئەی نێردراوی خوا ئەو شەوەی شەوڕەویت پێکرا چیت بینی؟ فەرمووی: بردمیان بۆ ناو خەڵکێکی زۆر لە خەڵکی خوا، پیاو بوون، هەر پیاوێکیان دوو لغاوی کرابووە دەم وەك لغاوی وشتر، دابونیانە دەست چەند پیاوێك کە دەمی هەریەکەیان دەکردەوە پاشان گابەردێکیان لە ئاگر دەهێنا ئەیانخستە ناوی دەمی هەتا ژێرەرەوەی دەردەچوو وەك مانگا دەیانبۆڕان و هاواریان دەکرد، وتم: ئەی جوبرەئیل ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە ئەو کەسانەن

لە دونیادا ماڵی هەتیویان دەخوارد بە ستەم، بە ڕاستی ئەوانە ئاگر دەکەنە ناو زکیان و بە ئاگری توندوتیژ سزا دەدرێن.

سوودی وتوویەتی: ئەوانەی ماڵی هەتیو دەخۆن، ڕۆژی قیامەت زیندوو دەکرێنەوە گڕی ئاگر لەدەم و گوێ و لوتییەوە دەردەچێ، هەر کەس بینی ئەزانی ئەوە ماڵی هەتیوی خواردووە.

لە ئەبی بەرزەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "يبعث يوم القيامة القوم من قبورهم تأجج افواههم ناراً"، واتە: ڕۆژی دوایی کۆمەڵێك لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە ئاگر لە دەمیانەوە بڵێسە دەکات، وتیان ئەی نێردراوی خوا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەی نابینن کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ﴿١٠﴾﴾.

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "أحرج مال الضعيفين المرأة واليتيم" واتە: وەسێتتان بۆ ئەکەم دوورکەونەوە لە ماڵی ئافرەت و هەتیو.

لە سورەتی (البقرة)دا لە ڕێگای عەتای کوڕی سائیبنەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتوویەتی: کاتێ ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ﴿١٠﴾﴾ ئەوانەی هەتیویان لابوو هەڵسان خواردنەکەیانی لە خواردنی خۆیان جیاکردەوە و خواردنەکەیان لە خواردنەوەیان وای لێ هات شتەکانیان زۆر بوو وا باش بوو بیخوات یا خراپ ببێت، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) گێڕایەوە، خوای گەورە ئایەتی: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ﴾ [البقرة: ٢٢٠] وتوویەتی: دوایی خواردنەکانیان تێکەڵ خواردنەکانیان کردەوە و خواردنەکانیان تێکەڵ بە خواردنەکانیان کردەوە.

﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ

يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

واتە: خودا پێت ڕادەگەیەنێ کەلەپورتان با بۆ نێرینە دوو بەش و بۆ مێینە نیوەی بەشی نێرینە بێ، گەر ژمارەی مێینە لە دوان پتر بوو دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە دەبەن، ئەگەر مێینەیەك بوو، نیوەی کەلەپور بۆ ئەمە، ئەگەر مردوو ئەولادی لەپاش بەجێما دایك و باوکی هەر کامێکیان شەش یەکیان لەو ماڵە هەیە ئەگەر هیچ فەرزەندی نەبوو دایك و باوکی دەبێ میراتەکەی بگرن، لە سێ کوت کوتێك بۆ دایکە ئەگەر مردوو براو خوشکی بەجێهێشتبوو، پاش دانەوەی قەرز و قۆڵە و پێکهێنانی وەسێتەکە، دایك شەش یەکی پێ دەبڕێ، ئێوە نازانن لە بابان و فەرزەندان و کامیان بۆ بەهرەپێدان و نزیکترین، بڕیارێکە لە خواوە بۆت دانراوە خودا زانای کارزانە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئەوەی دوای ئەمە هاتووە و ئەو ئایەتەی کۆتایی ئەم سورەتە پێیان دەوترێت (علم الفرائض) زانستی بەشە دانراوەکان کەی لەم سێ ئایەتە هەڵنجراوە و لەو فەرموودانەوە لەو بارەیەوە هاتوون ئەوانەی وەك لێکدەرەوەن بۆیان باس لەوانەیە بکەین کە پەیوەستن یە لێکدانەوەی ئەوانە، بەڵام بڕیاردانی کێشەکان و جیاوازییەکان و بەڵگەکان و حوججەی نێوان پێشەوەکان جێگاکەی کتێبەکانی ئەحکامە، ئیتر خوا یارمەتیدەرە.

دەربارەی فێربوونی بەشە دانراوەکان پاڵنان هاتووە و ئەم بەشەر بۆ دانراوە تایبەتە لە گرنگترین بەشیانە، لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "العلم ثلاثة وما سوى ذلك فهو فضل: بآية محكمة أو سنة قائمة أو فريضة عادلة" واتە: زانست سێ جۆرە، جگە لەوانە زیادەیە، ئایەتێکی موحکەم یان سوننەتێکی جێگیر یان بەشە دانراوەی دادپەروەرانە.

ئەبو هورەیرە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "یا أبا

هريرة تعلموا الفرائض وعلموه فانه نصف العلم وهو ينسى وهو اول شى و ينزع من امتي". واتە: ئەی ئەبو هوڕیرە خۆتان فێری بەشە دانراوەکان بکەن و خەڵکیش فێر بکەن، چونکە ئەوە نیوەی زانستییە یەکەم زانستییە لەم ئومەتەم دائەماڵرێ ئەوەیە. (رواه ابن ماجة وفى اسناده ضعف) ئیبنو عویەینە وتوویەتی: بۆیە ناونراوە نیوەی زانست، چونکە هەموو کەس تووشی دەبێ.

لە جابیرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) و ئەبو بەکر بە پیادەیی هاتنە سەردانم لە بەنی سەلەمە، پێغەمبەر سەیری کردم هیچ هۆشم نەماوە، داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی پێ گرت، پاشان ڕشاندی بە سەرما هۆشم هاتەوە و وتم: چ فەرمانێکم پێ دەکەی، کە چی لە ماڵەکەم بکەم ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئایەتی: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾. نێردراوەتە خوارەوە.

فەرموودەیەکی تر دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوە ئایەتەکە، ئەحمەد وتوویەتی: لە جابیرەوە هاتووە وتوویەتی: ژنەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا ئەو دوانە کچی سەعدی کوڕی رەبیعن باوکیان لە جەنگی ئوحوددا شەهید کرا، مامەکەیان هەموو ماڵەکەیانی بردووەو هیچی نەهێشتووەتەوە و کەسیش مارەیان ناکات هەتا ماڵیان نەبێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "يقضى الله فى ذلك" واتە: خوا حوکمی خۆی لەوبارەیەوە دەدات، ئیتر ئایەتی میرات هاتە خوارەوە. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ناردی بە دوای مامەکەیاندا پێی وت: لە سێ بەش دوو بەشی ماڵەکەیان بدەرەوە و هەشت یەك بدە بە دایکیان، هەرچی مایەوە بۆ خۆت، ڕواڵەت ئەوەیە کە حەدیسەکەی جابیر بەهۆی ئایەتەکەی کۆتایی ئەو سورەتە هاتۆتە خوارەوە وەك لە دواییدا باسی دەکەین، چونکە ئەو ئەوکاتە چەند خوشکێکی هەبوو، بەڵام کچی نەبوو، لەبەرئەوە کەلالە میراتگری بوو، بەڵام ئێمە کە باسی حەدیسەکەیمان کردووە لەبەرئەوە بووە کە بوخاری لێرەدا باسی کردووە و حەدیسەکەی دووەم لە هاتنەخوارەوە ئەو ئایەتە دەچێ، ئیتر خوا ئەزانێ.

﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾ واتە: فەرمان بە دادپەروەری دەکات دەربارەیان، چونکە خەڵکی سەردەمی نەفامی هەموو

میراتیان بۆ نێرینەکان دائەنا بێ ئەوەی بەشی مێینەکان بدەن، ئیتر خوای گەورە فەرمانی دا کە لە ئەصڵی میراتدا یەکسانی بکرێت لە نێوانیاندا و لە نێوان ئەو دوو جۆرەدا جیاوازی کردووە بۆ هەر نێرێك بەشی دوو مێی داناوە، ئەوەش لەبەر ئەوە بووە پیاو پێویستی بە سامان و ماڵ هەیە بۆ نەفەقە و گیروگرفتەکانی بازرگانی و کاسبی کردن و هەڵگرتنی ناخۆشییەکان، لەبەر ئەوە گونجاوە دوو ئەوەندەی ئافرەتی پێبدرێت هەندێ لە ئاوەزدارەکان لە ئایەتی: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِيٓ أَوْلَٰدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾ ئەوەیان دەرهێناوە کە خوا بە بەزەییترە بەرامبەر دروستکراوەکانی لە دایك بە منداڵەکەی. بەو شێوەیە دایك و باوکی ڕاسپاردووە بەرامبەر منداڵەکانیان، چونکە دەزانێ کە ئەو بە بەزەییترە بەوان لێیان... وەك لە حەدیسێکدا هاتووە کە بینیوێتی ژنێك لەناو دیلەکاندا منداڵەکەیان لێ جیاکردەوە، ژنەکە ئەگەڕا بە دوای منداڵەکەیدا، کاتێ دۆزییەوە باوەشی پێدا کرد و نووساندی بە سنگییەوە و مەمکەکانی خستە دەم. پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە هاوەڵەکانی وت: "اترون هذه طارحة ولدها فی النار وهی تقدر علی ذلك، قلوا: لا یا رسول الله، قال: فوالله لله ارحم بعبادهِ من هذهِ بولدها". واتە: ڕاتان وایە ئەو ژنە ئەو منداڵەی خۆی فڕێ بداتە ناو ئاگر کاتێ ئەتوانێ ئەوە بکات، وتیان: نە و ئەی نێردراوی خوا، فەرمووی: دە بە خوا خوا بە بەزەییترە بە بەندەکانی لەو ژنە بە منداڵەکەی.

بوخاری لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: لەوەوپێش ماڵ بۆ کوڕ بوو، وە ڕاسپاردە بۆ دایك و باوك بوو خوای گەورە چەندی حەز کرد لێی سڕییەوە، بەشی کوڕی کرد بە دوو ئەوەندەی مێ، وە بۆ باوك و دایك بەشی دانا هەریەکەیان شەش یەکو سێ یەکی دانا وە بۆ ژن هەشت یەکو چواریەکی دانا وە بۆ مێرد نیوە و چارەکی دانا.

عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِيٓ أَوْلَٰدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾ وتوویەتی: ئەوەش کاتی بەشە دانراوەکان نێردرا خوارەوە کە خوا بەشی نێرو مێ و باوك و دایکی داها، هەندێ خەڵك لایان ناخۆش بوو ئەیانوت: ژن چواریەکو هەشتیەکی بۆ داناوە وە بۆ کچ نیوە وە بەشی منداڵی بچووکی داناوە کەس لەوانە جەنگاوەر نییە غەنیمەتی پێ

نادرێ بێدەنگ بن لەو حەدیسە لەوانەیە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لەبیری چوو بێتەوە یان کە پێی بڵێن ئەی گۆڕی، هەندێکیان وتیان: ئەی نێردراوی خوا بەشی جاریە یەك نیوە بێت لەوەدا باوکی بەجێیهێشتووە نە سواری ئەسپ دەبێ نە ئەجەنگێ دژی بێ باوەڕەکان وە بەشی منداڵ لە میرات دەدرێ کە جێی هیچ ناگرێ لە سەردەمی نەفامیدا میراتیان تەنها بەوانە دەدا کە جەنگاوەر بوو بەپێی گەورەیی و بچوکی بەشیان دەدان.

﴿وَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ﴾ هەندێ کەس وتوویانە ﴿فَوۡقَ﴾ زیادەیە بەوە تەقدیر دەکرێ ئەگەر دوو ژن بوون وەك لە ئایەتی: ﴿فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ﴾ [الأنفال: ١٢] ئەوەش ڕاست نییە نە لێرەو نە لەوێ، چونکە لە قورئاندا شتێك نییە زیادە بێ سوودی تێدا نەبێت، پاشان کە دەفەرموێت: ﴿فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ﴾ ئەگەر مەبەست ئەوە بوایە کە ئەوان وتوویانە ئەیفەرموو: ﴿فَلَهُمَا ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ﴾، بەڵکو سوودی ئەوەی هەیە کە دوو سێیەك بۆ دوو کچە بەپێی حوکمی دوو خوشکی ناو ئایەتەکەی کۆتایی، چونکی خوا حوکمی داوە تێیدا بۆ دوو خوشك دوو سێیەك، ئەگەر دوو خوشك دووسێیەك بەشیان بێت دوو کچ لەپێشترن دووسێیەك وەربگرن، لەپێشەوە باسی حەدیسەکەی جابر کرا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بۆ دوو کچەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع دووسێیەکی بۆ دانان، کیتاب و سوننەت بەڵگەن لەسەر ئەوە. هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ﴾ ئەگەر بۆ دوو کچ نیوە دانرا بێ ئەوەی بە دەق هاتووە، جا کاتێ حوکمی داوە بۆ تاقە کچێك بە تەنها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دوو کچ لە حوکمی سێیەکەکاندایە ئیتر خوا دەزانێ.

﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾ هەتا کۆتایی دایك و باوك لە گرتنی میراتدا چەند بارودۆخیان هەیە:

یەکەمیان: کاتێ لەگەڵ منداڵدا بوون بۆ هەریەکەیان شەش یەك دانراوە، جا ئەگەر مردووەکە لە یەك کچ زیاتری نەبوو نیوەی بۆ دائەنرێ، وە دایك و باوکی بۆ هەریەکەیان شەش یەك، وە باوکەکە بە پشت شەش یەکەکەی تر وەردەگرێ بەسەریەکەوە دەیدرێتێ ئەو حاڵەتە لەنێوان فەرزو پشت دایە.

دووەم: کە دایك و باوك بە تەنها بن بۆ دایکەکە لەم حاڵەتەدا سێ یەکی بۆ دائەنرێ باوکەکە بە پشتییەتی ماوەکە دەبات بەو پێیە دوو ئەوەندەی دایکەکە دەبات کە ئەویش دوو سێ یەکە، ئەگەر لەو حاڵەتەدا مێرد یا ژن هەبوو پیاوەکە نیوەی دەبات و ژنەکە چارەك.

پاشان زانایان جیاوازن لەوەدا کە دایك چی وەردەگرێ کە بەشی پیاو و ژنەکە دانرا، ئەوەش لەسەر سێ وتەیە:

یەکەم: دایکەکە سێیەکە ماوەکە وەردەگرێ لە هەردوو کێشەکەدا، چونکە ماوەکە وەك هەموو میراتەکە وایە بە گوێرەی ئەو دوانە خوای گەورە نیوەی بۆ داناوە وە بۆ باوکی داناوە، ئیتر دایکەکە سێ یەکی ماوەکە وەردەگرێ و باوکەکەش دوو سێ یەکی، ئەوەش قسەی عومەر و عوسمان و ڕاست ترین ڕیوایەتە لە عەلییەوە، وە ئیبنو مەسعود و زەیدی کوڕی سابیتیش ئەوە دەڵێن، ئەوەش قسەی حەوت زاناکەی ئیسلام و چوار پێشەواکە و جەماوەری زانایانە.

دووەمیان: دایك سێ یەکی هەموو ماڵەکە وەردەگرێ بەپێی فەرمایشی: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾، چونکە ئایەتەکە گشتی ترە لەوەی کە مێرد و ژنی لەگەڵدا بێت یان نا، ئەوەش قسەی ئیبنو عەباسە، وە لە عەلی و موعازی کوڕی جەبەلەوە شێوەی ئەوە دەگێڕنەوە، شورەیح و داودی زاهیری ئەوە دەڵێن، وە ئەبو حەسەین موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا و ئیبنو لەبانی بەسری لە کتێبی (الایجاز فی علم الفرائض)دا هەڵیانبژاردووە، ئەوەش چاو پیاخشاندنەوەی دەوێ، بەڵکو زەعیفە، چونکە ڕواڵەتی ئایەتەکە بۆ ئەوانەیە هەموو ماڵە بەجێماوەکە داگیر بکەن، بەڵام لێرەدا ژن یا مێرد بەشە دانراوەکە ئەبەن ئەوەی ئەمێنێتەوە وەك هەموو بەجێماوەکە وایە سێ یەکی وەردەگرێ وەك لە پێشەوا باسکرا.

سێیەمیان: دایك سێ یەکی هەموو ماڵەکە ئەگرێ لە مەسئەلەی ژنی تایبەتدا وە چواریەك وەردەگرێ ئەویش لە سێ لە دوانزەیە وە دایك سێ یەك وەردەگرێ کە چوارە پێنج دەمێنێتەوە بۆ باوك، بەڵام لە مەسئەلەی مێردا سێ یەکی ماوە وەردەگرێ بۆ ئەوەی لە باوك زیاتر وەرنەگرێ ئەگەر سێ یەکی ماڵەکە وەربگرێ ئەو کاتە مەسئەلەکە لە شەش دەبێت: بۆ مێرد نیوەی سیان وە بۆ

دایك سێ یەكی ماوەكە دوای ئەوە ئەوە پشكە، وە بۆ باوك دوای ئەوە ماوەكە دەبێ كە ئەویش دوو پشكە ئەوە لە ئیبنو سیرینەوە دەگێڕنەوە، بەڵام ڕاست یەكەم ئیتر خوا دەزانێ.

حاڵەتی سێیەم: لە بارودۆخەكانی دایك و باوك ئەوەیە كە لەگەڵ برادا بن، برای دایك و باوك بن، یان برای باوكی بن وەك یەكە، ئەوانە لەگەڵ باوكدا هیچ لە میرات نابەن، بەڵام بەر لە دایك دەگرن لە كەسێكەوە دەیكەن بە شەش یەك لەگەڵ بوونی ئەوانەدا شەش یەكی بۆ دادەنرێ، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ﴾ برا ئەوانە نین بە زمانی قەومەكەت برا بن، عوسمان وتوویەتی: ناتوانم ئەوەی پێش خۆم بگۆڕم كە لە شارەكاندا بەڕێوەچووەو خەڵك بەوە میراتیان گرتبێ، دەربارەی ئەو بۆ ماوەیە چاو پیاخشاندنەوەی دەوێ، ئەوەی لەوانە گێڕاوەتەوە پێچەوانەی ئەوەیە، بێ سۆ عەبدوڕەحمانی ئەبی زەناد لە خاریجەی كوڕی زەیدەوە لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە كە وتوویەتی: بە دوو براش دەوترێ براكان بۆ ئەم كێشەیە بەشێك بە تەنها جیاكراوتەوە.

وە لە قەتادە دەگێڕنەوە كە وتوویەتی: ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ﴾ ئەوانە زیان بە دایك دەگەیەنن بۆ ئەوەی میرات بگرن، بەڵام یەك برا بەر لە دایك ناگرێ بۆ سێ یەك، بەڵام لەوە زیاتر بەر لە دایك دەگرن، چونكە باوكیان سەرپەرشتی ژن هێنانیان دەكات و نەفەقەی لەسەر ئەوانە بێ دایكیان ئەوەش قسەیەكی چاكە.

بەڵام لە ئیبنو عەباسەوە ئەگێڕنەوە بە ئیسنادی ساز كە ڕای وابووە ئەو شەش یەكەی كە لە دایكیان گرتووە ئەبێ بە بەشی ئەوان ئەوەش قسەیەكی شازە كە ئیبنو جەریر لە تەفسیرەكەیدا هێناویێتی، پاشان وتوویەتی ئەوە قسەیەكە پێچەوانەی قسەی هەموو نەتەوەكەیە، چونكە بۆی گێڕامەوە لە سوفیانەوە لە عەمرەوە لە حەسەنی كوڕی موحەممەدەوە لە ئیبنو عەباسەوە كە وتوویەتی: كەلالە كەسێكە نەكوڕی هەبێت نە باوك.

﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ﴾ زانایان كۆن لەسەر ئەوەی قەرز ئەخرێتە پێش وەسێتەوە ئەوەش كاتێ باش سەرنج بدرێ لە ناوەڕۆكی ئایەتەكە

تێ دەگەیت. لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە وتوویەتی: ئێوە ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾ دەخوێننەوە، بەڵام پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) قەرزدانەوەی پێش وەسیّتەکە خستووە. وە کوڕانی دایك میرات دەگرن بەبێ کوڕانی نەنك، پیاو میراتی برای باوکی و برای دایکی دەگرێ بێ ئەو برایەی لە باوکێتی، پاشان تیرمزی وتوویەتی هەندێ لە زانایان قسەیان دەربارە کردووە، منیش دەڵێم ئەو پیاوە زانا بووە بە بەشە دانراوەکان و گوێی داوە بە حیساب. ئیتر خوا دەزانێ.

﴿ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ﴾ واتە: ئێمە بەشی باوکان و کوڕەکانمان داناوە بە یەکسانی لە ئەصلی میراتەکەدا بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە سەردەمی نەفامیدا هەبووە، وە بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لەسەرەتای ئیسلامدا هەبووە، وە بۆ ئەوانە بەپێی بەشەکانیان، چونکە مرۆڤ جاری وایە کەڵك و سوودی دونیایی یان قیامەتی بۆ دێ یان هەردووکیان لە باوکییەوە کە لە کوڕەکەیەوە بۆی نایەت جاری وائەبێ بە پێچەوانەوە دەبێ، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ﴾ واتە: سوود و کەڵك چاوەڕوان کراوەو ئومێد پێی هەیە لەوەی تریان لەبەر ئەوە بەشی ئەو و ئەومان داناوە، وە یەکسانیمان کردووە لە نێوان هەردوو بەشەکەدا لە ئەصلی میراتەکەدا. ئیتر خوا ئەزانێ.

﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ واتە: ئا ئەوەی باسمان کرد دەربارەی درێژەدان بە میرات و دانانی بەشی زۆر بۆ میرات گرەکان لە هەندێکیان ئەوە دانراوێکە لە لایەن خواوە و حوکمی پێ داوە کە بکرێ خوای گەورە زانا و دانایە شتەکان لە شوێنی خۆیدا دادەنێ و هەر کەس ئەوەی ئەداتێ کە شایستەی بێت لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾.

﴿وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ

بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿١٢﴾

واتە: ئەو میراتەی لە ژنانەوە بەجێدەمێنێ ئەگەر هیچ فەرزەندیان نەبوو لە دوو بەش بەشێکیان هەیە، ئەگەر ئەولادیشیان هەبوو ئێوە چوار یەك و پێ دەدرێت پاش دانەوەی قەرز و قۆڵەو وەسیەتێ کە کردوویانە ئەگەر ئێوە مردن و ئەولاد نەبوو ژنەکان و چواریەکی میرات و دەگرن ئەگەر ئەولادیشیان هەبوو ژنتان هەشت یەکیان پێ دەبڕێ پاش پێکهێنانی وەسیەتتان و دانەوەی قەرز و قۆڵە ئەگەر پیاوێ یا ژنێ مرد و باب و فەرزەندی لێ بەجێ نەما و برایەك یا خوشکێکی بوو هەریەك لەوان شەش یەکی کەلەپوری هەس ئەگەر لە یەکێك پتر بوون بە هەموویان سێ یەکی کەلەپوور دەگا پاش پێکهێنانی وەسیەت و دانەوەی قەرز، ناشێ وەسیەت بە جۆرێك بێت کە بە ئانقەست بەزەرەری کەلەپور گران تەواوبێ ئەم بڕیارە لە خواوەیە و خوداش بۆ خۆی ئاگادار و لەسەرخۆیە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی پیاوەکان ئەگەر ژنەکانتان مرد وماڵی بەجێهێشت و کوڕی نەبوو، نیوەی ئەوەی بەجێی هێشتووە بە میرات وەردەگرن، ئەگەر فەرزەندیان هەبوو چواریەکی ئەوەتان بەردەکەوێ کە بەجێیهێشتووە، دوای جێبەجێکردنی وەسیەتێکەی و دانەوەی قەرزەکانی.

لە پێشەوە باسمان کرد کە دانەوەی قەرز پێش جێبەجێکردنی وەسێت ئەخرێ دوای قەرز وەسێت، پاشان میرات، ئەوەش فەرمانێکە زانایان لەسەری کۆن، وە حوکمی نێرینە هەرچەندە لە خوارەوە بن حوکمی نێرینەی پشتی بۆ دەکرێ.

پاشان فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً﴾ کەلالە لە

ئیکلیلەوە وەرگیراوە، ئەویش ئەوەیە لە هەر چوار سەرەوە دەوری سەری داوە، لێرەدا مەبەست لە کەسێکە کە چوار دەورەکەی میراتەکەی دەبەن نە لە ئەصلێتی نە لە فەرع وەك شەعبی گێڕاویەتییەوە لە ئەبو بەکری صدیقەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێ دەربارەی کەلالە پرسیاریان لێکرد، وتی: بەڕای خۆم قسەی دەربارە دەکەم، ئەگەر پێکابووم ئەوە لە خواوەیە وە ئەگەر هەڵە بوو لە منەوەیە و لە شەیتانەوەیە، خوا و پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بەرین لێی، ﴿كَلَٰلَةً﴾ کەسێکە نەکوڕی هەبێ و نە باوك. کاتێ عومەر بوو بە خەلیفە وتی: من شەرم دەکەم پێچەوانەی ئەو ڕایەی ئەبو بەکر بجولێمەوە کە ڕای لێ بووە. (رواه ابن جرير وغيره).

ئیبنو ئەبی حاتەم لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: من دوا کەس بووم کە پەیمانم دا بە عومەر، گوێم لێ بوو دەیوت: کەلالە کەسێکە نە منداڵی هەبێ نە باوك، وە عەلی و ئیبنو مەسعودیش ئەوەیان وتووە، وە شەعبی و نەخەعی و حەسەن و قەتادە و جابیری کوڕی زەید و حەکەم ئەوەیان وتووە، وە ئەهلی مەدینە و کوفە و بەسرە ئەوە دەڵێن، ئەوەش قسەی حەوت زاناکەی ئیسلام و چوار پێشەواکە و جەماوەری پێشینان و پاشینانە، وە فەرموودەیەکی مەرفوع دەربارەی هاتووە، ئەبو حوسەینی کوڕی لەبان وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە شتێك دەگێڕێتەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە وتوویەتی: ئەوە کەسێکە کە کوڕی نەبێت، ڕاستی لەوە وە ئەوەی یەکەمێتی، لەوانەیە گێڕەرەوەکە تێنەگەیشتبێ لە مەبەستەکەی.

﴿وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ﴾ واتە: لە دایکەوە برا و خوشکی نەبێت وەك لە خوێندنەوەی هەندێ لە پێشیناندا هاتووە. لەوانە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هەروایش ئەبو بەکری سدیق تەفسیری کردووە بەپێی ئەوەی قەتادە گێڕاویەتییەوە ﴿فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾ براکانی دایکی پێچەوانەی وەرەسەکانی ترن لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەمیان: ئەوانە میرات دەگرن لەگەڵ ئەوەی بەپێی ئەو بوونە میراتگر ئەویش دایکە.

دووەم: نێر و مێیان لە میراتگرتندا وەك یەکن.

سێیەم: ئەوانە میراتیان بەر ناکەوێ ئەگەر مردووەکەیان کەلالە نەبێت، هەروەها لەگەڵ باوك و باپیرە و کوڕو کوڕی کوڕدا میراتیان بەرناکەوێ.

چوارەم: ئەوانە لە سێ یەك زیاتریان نادرێتێ هەرچەند و نێرو مێیان زۆر بێت.

ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە کە عومەر حوکمی دا میراتی براکان لە دایکەوە لە نێوانیاندا نێرینە ئەوەندەی مێینەی بەردەکەوێ، زوهری وتوویەتی: من ڕام وا نییە عومەر لە خۆیەوە ئەو حوکمەی دابێ، بەڵکو لە پێغەمبەرەوە فێربووە بەپێی ئەم ئایەتە کە خوای گەورە تێیدا فەرموویەتی: ﴿فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾.

زانایان دەربارەی کێشەی هاوبەشی جیاوازییان هەیە کە ئەوانیش مێرد و دایك و نەنك و کوڕی دایك و یەکێك و زیاتر لە منداڵی دایك و باوك، لە قسەی جەماوەر بۆ مێرد نیوە، وە دایك یان نەنك شەش یەك، وە بۆ منداڵی دایکی سێ یەك، وە هاوبەشیان دەکەن تێیدا منداڵی باوك و دایکی بەوەی لە نێوانیاندایە لە دانراوە هاوبەشەکە ئەویش براکانی دایکە، وە منداڵانی دایك باوکی، وتیان: ئەی پێشەوای باوەڕداران وا دابنێ باوکمان گوێ درێژبووە، ئەی ئێمە لەیەك دایك نین؟ ئیشتر هاوبەشی کردن، ئەو هاوبەشی کردنەش ڕاست بوو لە عومەرەوەو لە عوسمانەوە، ئەوەش یەکێ لە دوو ڕیوایەتەکەی ئیبنو مەسعود و زەیدی کوڕی سابیت و ئیبنو عەباسە (ڕەزای خوایان لێ بێت)، سەعیدی کوڕی موسەیب و شورەیحی قازی و مەسروق و تاووس و موحەممەدی کوڕی سیرین و ئیبراهیمی نەخەعی و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و سەوری و شورەیك ئەوەیان وتووە، ئەوەش بۆچوونی مالیك و شافیعی و ئیسحاقی کوڕی ڕاهویەیە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تالیب هاوبەشی نەکردن، بەڵکو سێ یەکی دائەنا بۆ منداڵی دایك وە هیچی دانەئەنا بۆ منداڵی دایك و باوکی، ئەو حاڵەتەش لەبەر ئەوەیە پشتن. وەکیعی کوڕی جەڕاح وتوویەتی: لەوەدا لێی تێك نەچووە، ئەوەش قسەی ئوبەی کوڕی کەعب و ئەبو موسای ئەشعەرییە، ئەوەش بەناوبانگە لە ئیبنو عەباسەوە، وە ئەوە بۆچوونی شەعبی و

ئیبنو ئەبی لەیلا و ئەبی حەنیفە و ئەبی یوسف و موحەممەدی کوڕی حەسەن و حەسەنی کوڕی ئەبی زیاد و زوفری کوڕی هوزەیل و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی ئادەم و نوعەیمی کوڕی حەمادو ئەبی سەور و داودی کوڕی عەلی زاهیریە، وە ئەبو حوسەینی کوڕی لەبانی قەرەزی بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێ ئەوەی هەڵبژاردووە لە کتێبەکەیدا بەناوی (الایجاز). ﴿وصية من الله والله عليم حليم﴾.

﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرٍّ﴾ واتە: بۆ ئەوەی وەسێتەکەی لەسەر دادپەروەری بێت نەك لەسەر زیان و ستەم بێت بەوەی هەندێ لە میراتگرەکان بێ بەش بکات یان بەشی کەمی بۆ دابنێ یان زیاتر بێت لەوەی خوا بۆی داناوە هەر کەس هەوڵی ئەوانە بدات وەك ئەوە وایە دژی خوا وەستابێت لە حوکمەکانیدا وە لە دابەشکردنەکانیدا لەبەر ئەوە ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الأضرار في الوصية من الكبائر" واتە: زیانگەیاندن لەوەسێتدا لە تاوانە گەورەکانە.

لەبەر ئەوە زانایان جیاوازن دەربارەی بڕیاردان بۆ میراتگر، ئایا دروستە یان نا؟ لەسەر دوو قەولە:

یەکەمیان: دروست نییە، چونکە جێگەی تۆمەتە کاتێ وەسێتی کردبێ بو سیفەی بڕیار (الاقرار)، وە لە فەرموودەی سازدا چەسپاوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الله قد اعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث"، واتە: بەڕاستی خوای هەر خاوەن مافێك مافی خۆی داوەتێ، ئیتر وەسیەت بۆ میراتگر نییە، ئەوەش مەزهەبی مالیك و ئەحمەد و ئەبی حەنیفەیە، وە قسەی کۆنی شافیعییە، وە لە قەولی تازەیدا وتوویەتی: دروستە بڕیار بۆ دانی، ئەوەش بۆچوونی تاووس و عەتاو حەسەن و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە، هەروەها هەڵبژاردەی بوخاریە لە سازەوارەکەیدا وە حوجەش ئەوەیە کە رافیعی کوڕی خەدیج وەسێتی کرد قەرزاییەکە دەرنەکەوێ لەسەر ئەوەی دەرگاکەی لەسەر داخستبوو، وە هەندێ وتوویانە دروست نییە بڕیاردانی لەبەر ئەوەی میراتگرەکانی گومانی خراپی پێ دەبەن، وە پێغەمبەر (درودی خوای

لێ بێت) فەرموویەتی: "إياكم والظن فان الظن أكذب الحديث"، واتە: دوور بکەونەوە لە گومان، چونکە گومان بردن درۆترین بێژەیە، وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا﴾ [النساء: ٥٨] واتە: خوا فەرمانتان پێ ئەدات کە ڕاسپاردەکان بدەنەوە بە خاوەنەکانیان، هیچ میراتگرێکی تایبەت نەکردووە هەر کاتێ بڕیارەکە دروست بێت وەك فەرمانەکە بێت، ئەو خیلافەی پێدا تێدەپەڕێ هەر کاتێ فێڵ و تەڵەکە بێت و هۆیەك بێت بۆ زیادەدان بە هەندێ لە میراتگران و بەشی هەندێکیان کەم بێت ئەوە حەرامە بە کۆی زانایان و بە دەقی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿غَيْرَ مُضَآرٍّۢ ۚ وَصِيَّةًۭ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌۭ﴾.

﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍۢ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَـٰلِدًۭا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌۭ مُّهِينٌۭ ﴿١٤﴾﴾

پاشان خوای بەرز فەرموویەتی: واتە: ئەم دەستوورانە سنوورن، خوا دایناوە، هەرکە سێك بەرفەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت دەینێرێتە ناو باغاتێك ڕووباریان بە بەردا دەڕواو هەتا سەر هەر تیا دەبن و لەوپەڕی بەختەوەریدان. هەرکەسێکیش لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەرچێ و سنووری خوا بە هیچ بگرێ، دەیخاتە دوزەخەوە هەتا سەر هەر لەوێ دەبێ و بەوپەڕی سوکایەتییەوە ئازار دەدرێ. واتە: ئەم بەشە دانراوانە چەندێتیان کە خوا دایناوە بۆ میراتگر بەپێی دوور و نزیکییان لە مردووەکەوە و پێویستییان پێی و لەدەستچوونیان کاتی نەبوونی سنووری خوان پەلاماریان مەدەن و لێیان تێمەپەڕن لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ واتە: لەوەدا بەرفەرمانی خوا و پێغەمبەر بێت نە بەشی هەندێ لە میراتگرەکان زیاد بکات، نە بەشی هەندێکیان کەم بە فێڵ و تەڵەکە و وەسیلەوە، بەڵکو وازیان لێ بێنێ لەسەر حوکمی خوا و ئەو بەشانەی ئەو داینانون و بەشی کردوون ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍۢ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ

ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾﴾، لەبەر ئەوە ئەو حوکمەی نەداوە کە خوا دایناوە، بەڵکو دژایەتی خوای کردووە لە حوکمەکەیدا، ئەوەش لەوەوە دەردەچێ کە ئەو کەسە ڕازی نییە بەوەی خودا دابەشی کردووە و حوکمی پێ کردووە، لەبەر ئەوە ئیهانە دەکات و سزای توندوتیژی ئەدات.

ئیمام ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ان الرجل ليعمل بعمل أهل الخير سبعين سنة فاذا أوصى وحاف فى وصيته فيختم بشر عمله فيدخل النار، وان الرجل ليعمل بعمل أهل الشر سبعبن خريفاً فيعدل فى وصيته فيختم له بخير عمله فيدخل الجنة". واتە: پیاوی وا ئەبێ حەفتا ساڵ کاری خێر و چاکە دەکات کاتێ وەسێت دەکات ستەم لە وەسێتەکەیدا دەکات کارەکانی بە شەڕ کۆتاییان دێت ئەچێتە دۆزەخەوە، وە پیاوی وا ئەبێ حەفتا ساڵ کردەوەی ئەهلی شەڕ و خراپە دەکات، لە وەسێتەکەیدا دادپەروەری دەکات، کردەوەکانی بە خێر کۆتایی دێت ئەچێتە بەهەشتەوە".

پاشان ئەبوهورەیرە وتوویەتی: ئەگەر حەز دەکەن ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ هەتا ﴿عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ بخوێننەوە.

﴿وَٱلَّٰتِى يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾﴾

واتە: هەر ژنێکتان کە هەستتان کرد نامۆ یان بەخۆ فێر دەکەن چوار کەسی خاوەن باوەڕیان بەرنەسەرێ - لەو عانەدا کە لێك جووت بوون - وەختێ ئەوان هاتن شایەتییان لەسەر دان هەر لە ماڵدا قەتیسیان کەن تا بە مردن لەناو دەچن، یان تا خودا دەرەتانیان نیشان دەدات. ئەو جوتەی لە ئێوە ئاو کارە دەکەن ئازاریان دەن ئەگەر پەشیمان بوونەوە و دەستیان هەڵگرت و ڕێی

چاکەیان گرتەبەر ئێوە دەستیان لێ هەڵگرن خوا لە پەژیویان دەبوورێ و دلۆڤانە.

حوکم لە سەرەتای ئیسلامدا کاتێ ژنێك بە شاهیدی دادپەروەر بچەسپایە کە زینای کردووە بەند ئەکرا لە ماڵدا بێ ئەوەی بتوانێ بچێتە دەر هەتا دەمرد، لەبەر ئەوە خوا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّتِي يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ﴾ ئەوانەی زینا دەکەن ﴿مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ ئەو ڕێگایەی خوا بۆی داناون سەرەوەی ئەوەیە.

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: حوکم بەو شێوەیە بوو هەتا خوا سورەتی (النور)ی نارده خوارەوە، کە بە داری حەد لێدان یان ڕەجم نەسخ کرایەوە.

بەو شێوەیە لە عەکریمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەن و عەتای خۆراسانی و ئەبی ساڵح و قەتادە و زەیدی کوڕی ئەسلەم و زەحاك وتوویانە ئەو بەندکردنە نەسخ بووەتەوە. ئەوەش فەرمانێکە هەمووی لەسەری ڕێکن.

ئیمام ئەحمەد لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وەحی بۆ ئەهاتە خوارەوە کاری تێ دەکرد و غەم و پەژارە دای دەگرت و ڕەنگی تێك دەچوو، خوای گەورە ڕۆژێك وەحی بۆ نارد، کاتێ هاتەوە سەرخۆی فەرمووی: "خذوا عنی قد جعل الله لهن سبیلا الثیب بالثیب والبکر بالبکر الثیب جلد مائة ورجم بالحجارة والبکر جلد مائة ثم نفی سنة"، واتە: لێم وەرگرن، خوا ڕێگای بۆ ئافرەتان کردەوە، ژن بە پیاو کوڕ بە کچ، ژن و پیاوی زیناکار سەد داری لێ ئەدرێ و بەردەباران دەکرێن، وە کوڕ بە کچ سەد داری حەد لێدان، پاشان ساڵێك دوور دەخرێتەوە. (قال الترمذی: هذا حدیث حسن صحیح).

وە لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: کاتێ سورەتی (النساء) هاتە خوارەوە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "لا حبس بعد سورة النساء" واتە دوای هاتنەخوارەوەی سورەتی (النساء) بەندکردنی ئافرەتانی زیناکار نەما.

ئیمام ئەحمەد بەپێی ئەو حەدیسەی کاری کردووە کە دار لێدان و ڕەجمی

دەرهەقی ژن و پیاوی زیناکەری داناوە، بەڵام جەماوەر بۆ ئەوە چووە کە ژن و پیاوی زیناکار تەنها ڕەجم دەکرێ بێ ئەوەی جەڵدی لێ بدرێ، وتوویانە: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) تەنها ماعیز و ژنە غامیدییەکەی ڕەجم کرد، هەروەها دوو جولەکەکە پێش ڕەجمەکە جەڵدی لێنەدان ئەوەش دەبێتە بەڵگە کە جەڵدکردن حەتمی نییە، بەڵکو نەسخ بووەتەوە لەسەر قسەی ئەوان. ئیتر خوا دەزانێ.

﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا﴾ واتە: ئەو کوڕ و کچەی زینا دەکەن سزایان بدەن.

ئیبنو عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویانە واتە: بە جوێن و عەیبارکردن و لێدان بە نەعل حوکم بەو شێوە بووە، هەتا خوا نەسخی کردەوە بە جەڵدکردن یا ڕەجمکردن.

عەکریمە و عەتا و حەسەن و عەبدوڵڵای کوڕی کەسیر وتوویانە: دەربارەی پیاو و ژنی زیناکار هاتووەتە خوارەوە.

وە سوودی وتوویەتی: دەربارەی گەنجان هاتووەتە خوارەوە پێش هاوسەرگیری کردن.

وە موجاهید وتوویەتی: دەربارەی دوو پیاو هاتووەتە خوارەوە کە ناوەکەی ناهێنرێ واتە سوار یەك بووین. ئیتر خوا دەزانێ.

لە سوننەندا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من رأيتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به"، واتە: هەر کەستان بینی کاری قەومی لوتی دەکرد کارکەر و کار لەسەرکراو بکوژن.

﴿فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا﴾ واتە: بە تەواوی وازیان لەو کارە هێنا کە لەسەری بوون و کردەوەی چاکیان کرد ﴿فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمَآ﴾ واتە: وازیان لێ بهێنن قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێن، چونکە کەسێك تۆبە بکات لە تاوان و وازی لێ بهێنێ وەك کەسێکە بێ تاوان بێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾.

لە هەردوو سازەواردا هاتووە (غذا زنت أمة أحدكم فليجلدها الحد ولا

يثرب عليها) واتە: کاتێ ئافرەتی یەکێ لە ئێوە زینای کرد جەڵدی لێدا، ئیتر سەرزەنشتی نەکات، چونکە ئەو حەد بەسەرا جێبەجێ کردنە کەفارەتە بۆ ئەو کارەی کردوویەتی.

﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن
قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾
وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ
ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ
أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾﴾

واتە: خودا تۆبە هەر لەوانە قبوڵ دەکا کە لە ڕووی نەزانینەوە خراپەیان لێ ڕوودەدات و گورجێ پەشیمان دەبنەوە، خودا زانای لە کارزانە، ئیتر پەشیمانبوونەوەی ئەوانە هیچ بەهرەی نییە کە لەوەختی گیانەڵادا دەڵێن: ئێمە پەشیمانین. پەشیمانی ئەمانەش قبوڵ نییە کە بە خوانەناسی دەمرن ئێمە بۆ ئەوان ئازارێکی زۆر بە ژانمان سازکردووە.

خوای گەورە پاك و بێگەرد دەفەرمووێت: بەڕاستی خوا تۆبە لەو کەسانە قبوڵ دەکات کە کارێکی خراپ دەکەن بەنەزانی، پاشان پەشیمان دەبنەوە پێش ئەوەی فریشتەی گیانکێشان گیانی دەربهێنێ پێش غەر غەرە.

موجاهید و غەیری ئەویش وتوویانە: هەموو ئەوانەی سەرپێچی دەکەن بە هەڵە یان بە قەستی ئەوە نەزانە هەتا واز لە تاوانەکە دێنێ.

قەتادە لە ئەبی عالیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەیانووت: هەر تاوانێك بەندە دەیکات نەزانییە، وە قەتادە وتوویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کۆبوون و ڕایان وابووە هەر شتێ سەرپێچی خوای پێ بکرێت بە قەستی بێت یان بە شتی تر هەر نەزانییە.

﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ﴾ ئیبنو عەباس وتوویەتی: لە نێوان تاوانەکە و بینینی فریشتەی گیانکێشان تۆبە بکەن.

زەحاك وتوویەتی: ئەو تۆبەیەی پێش مردن بێت ئەو نزیکە.

قەتادە و سوودی وتوویانە: هەتا تەندروست بێت، ئەوەش لە ئیبنو عەباسەوە گێڕراوەتەوە.

حەسەنی بەصری وتوویەتی: ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ هەتا نەکەوتووەتە غەرغەرەوە، عەکریمە وتوویەتی: دونیا هەموو نزیکە.

## باسی ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئیبنو عومەر لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: "إن الله يقبل التوبه العبد مالم يغرغر" واتە: خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ هەتا دەکەوێتە غەرغەرەوە.

فەرموودەیەکی تر: ئیبنو مەردویە وتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و توویەتی: گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووم دەیفەرموو: "ما من عبد مؤمن يتوب قبل الموت بشهر الا قبل الله منه وادنى من ذلك وقبل موته بيوم وساعة يعلم الله منه التوبة والاخلاص الى الا قبل منه". واتە: بەندەی باوەڕی نییە پێش مردنی بە مانگێك تۆبە بکات خوا لێی وەرنەگرێ لەوەش کەمتر بێت یان پێش مردنی بە ڕۆژێك یان بە ساتێك خوا بزانێ کە ئەو تۆبە و ئیخلاصەی لەبەر ئەوە هەر لێی وەرنەگرێ.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو داودی تەیالیسی وتوویەتی: پیاوێکی مەیلمان کە پێیان دەوت ئەیوب وتوویەتی: گوێبیستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بووم دەیوت: هەر کەس ساڵێك پێش مردنی تۆبەی کرد خوا تۆبەی وەردەگرێ، وە هەر کەس پێش مردنی بە مانگێك تۆبە بکات، تۆبەکەی وەردەگیرێ، وە هەر کەس پێش مردنی بە هەفتەیەك تۆبە بکات خوا تۆبەکەی وەردەگرێ وە هەرکەس پێش مردنی بە ڕۆژێك تۆبە بکات تۆبەکەی وەردەگیرێ وە هەر کەسێ پێش مردنی بە سەعاتێك تۆبە بکات تۆبەکەی وەردەگیرێ، منیش وتم: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ وتی: من ئەوەت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە

فەرموودەیەکی دیکە: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: عەبدوڕەحمانی بەیلەمانی وتوویەتی: چوار لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کۆبوونەوە یەکێکیان وتی: گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووم دەیفەرموو: "إن الله يقبل توبة العبد قبل أن يموت بيوم" واتە خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ پێش ئەوەی بمرێ بەر ڕۆژێك، ئەویتریان وتی: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام من لێم بیستووە دەیفەرموو: "إن الله يقبل توبة العبد قبل أن يموت بنصف يوم" واتە: خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەرئەگرێ پێش ئەوەی بمرێ بە نیوەڕۆژێك، سێیەم وتی: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە؟ وتی: بەڵێ، وتی: دە من لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە فەرموویەتی: "ان الله يقبل توبة العبد قبل أن يموت بضحوة"، واتە: خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ پێش ئەوەی بمرێ بە بەیانییەك، چوارەم وتی: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام من لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە فەرموویەتی: "ان الله يقبل توبة العبد مالم يغرغر بنفسه"، واتە: خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ هەتا ئەو کاتەی ئەکەوێتە غەر غەرە.

فەرموودەیەکی تر: ئەبو بەکری کوڕی مەردویە وتوویەتی: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الله يقبل توبة عبده مالم يغر يغر"، واتە: خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ پێش ئەوەی غەرغەرە بکات.

## ئەو فەرموودە مورسەلانەی لەوبارەوە هاتوون

ئیبنو جەریر وتوویەتی: حەسەن وتوویەتی: پێمگەیشتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الله يقبل توبة العبد ما لم يغريغر" (هذا مرسل حسن عن الحسن البصرى رحمه الله).

هەر ئیبنو جەریر وتوویەتی: ئەبو ئەیوب بەشیری کوڕی کەعب وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن يقبل توبة العبد مالم يغرغر".

فەرموودەیەکی تر: ئیبنو جەریر وتوویەتی: قەتادە وتوویەتی: لای ئەنەسی

کوڕی مالیکم بووین پاشان ئەبو قەلابە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: خوای پەروەردگار کاتێ شەیتانی لە بەزەیی خۆی دوورخستەوە داوای کرد مۆڵەتێکی بداتێ، کاتێ مۆڵەتەکەی پێ درا وتی: بە عیزەت و شکۆمەندیت لە دڵی هیچ مرۆڤێکدا هەتا گیانی تێدا بێت دەرناچم، خوای گەورەش فەرمووی: بە عیزەتی خۆم ڕێی تۆبەی لێ ناگرم هەتا گیانی تێدا بێت.

وە لە ئەبی سەعیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "قال إبليس: وعزتك لا أزال أغوينهم ما دامت أرواحهم في أجسادهم، فقال الله عزّ وجل: وعزتي وجلالي لا أزال اغفر لهم ما استغفروني" واتە: ئیبلیس وتوویەتی: بە عیزەتی تۆ بەردەوام هەوڵی لادانیان دەدەم لە ڕێگەی ڕاست هەتا گیان لە لاشەیاندا بێت، خوای گەورە فەرمووی: بە عیزەت و شکۆمەندیم بەردەوام لێیان ئەبوورم ئەگەر داوای لێبوردنم لێ بکەن .

ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەر کەس بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و تۆبە بکات ئەو کەسە ئومێدی بە ژیان هەیە، چونکە تۆبەکەی وەرگیراو دەبێت، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، بەڵام کاتێ نائومێدی لە ژیاندا ڕووی داو چاوی بە فریشتەی گیانکێشان کەوت، گیان قەتیس ما لە قوڕگدا و سنگی پێی تەسك بوویەوە کەوتە غەرغەرە تۆبەی ئەو کاتەی لێ وەرناگیرێ، کاتی ڕزگاربوون بەسەردەچێت، لەبەر ئەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ﴾. ئەمەش وەك ئەوە وایە کە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ﴾ [غافر: ٨٤]، وەك چۆن خوای گەورە دایناوە بۆ ئەهلی زەوی تۆبە نییە کاتێ بینییان ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ لە فەرمایشی: ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ﴾ [الأنعام: ١٥٨]، هەروەها فەرمایشی: ﴿وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ﴾ واتە: خوانەناس کاتێ لەسەر خوانەناسی و هاوبەشدانان مرد پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوەی بۆ لای خوا بێ سوودە، وە بریتی لێوەرناگیرێ ئەگەر پڕ بە زەویش بێت.

ئیبنو عەبباس و ئەبو عالیەو ڕوبەیعی کوڕی ئەنەس دەربارەی: ﴿وَلَا الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ﴾ وتوویانە: دەربارەی هاوبەشدانەرەکان هاتۆتە خوارەوە.

ئیمام ئەحمەد لە ئەبازەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الله يقبل توبة عبده أو يغفر لعبده ما لم يقع الحجاب"، واتە: خوا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ یان لە بەندەی خۆی دەبورێ هەتا حیجاب دانەدرێتەوە. وترا: دادرانەوەی حیجاب چییە؟ فەرمووی: کە گیان دەرچوو بە خوانەناسی. لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿أُولَٰئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ واتە: پڕ ئازار.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا (١٩) وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا ۚ أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا (٢٠) وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا (٢١) وَلَا تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلًا (٢٢)﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان بۆتان ڕەوا نییە ژنان بە زۆرداری بکەنە ماڵی میرات، نابێ زۆریشیان بۆ بێنن بڕێك لەوەی پێتان داون دیسان لێیان بستێننەوە، جا مەگین هەر بە ئاشکرا کاری بێ ناموسی بکەن، بە تەرزێکی جوان و ڕەوا لەگەڵیان بجوڵێنەوە، ئەگەر خۆشتان نەهات لێیان شتی وا هەن ئێوە حەزی لێ نەکەن و چاکەی زۆری لە خواوە بۆ ئێوە تێدایە، ئەگەر ویستت ژنی خۆتان بە ژنێکی تر بگۆڕن ئەگەر بە ژنەکەی پێشووتان کلۆرێك دراوتان دابێ نابێ لێیان بستێننەوە گەرەکتانە بوختان و بەخۆ تووشی گوناحی ئاشکرا

کردن بستێننەوە، جا چۆنیان لێ دەستێننەوە کە ئێوە بەیەکەوە بوون و هەر لە جێ و بانێکدا خەوتوون، خۆشیتان لە یەکتر دیوە و ئەوان پەیمانی پتەویان لەگەڵ ئێوەدا بەستووە، ژنانێك مەخوازن کە باوانی ئێوە خواستوویانن مەگەر ئەوەی کە بوریوە، چونکە سەرجێی ئەمانە بە داوێن پیسی دادەنرێت و زۆر شوورەییە و ڕێبازێکی زۆر خراپە.

بوخاری لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا﴾ وتوویەتی: لەوەوپێش ئەگەر پیاوێك بمردایە، سەرپەرشتیکارانی شایستەتر بوون بە ژنەکەی، یەکێکیان ئەگەر بیویستایە مارەی دەکرد، ئەگەر بیانویستایە ئەیاندا بە مێرد، وە ئەگەر حەزیان بکردایە دایان دەنا و نەیان دەدا بە شوو، ئەوان شایستەتر بوون بەو ژنە لە کەس کاری، ئیتر ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا﴾.

ئەبو داود لە عەکریمە و ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویانە: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کاتێ پیاوێك ئافرەتێکی خزمی خۆی بە میراتی بۆ ئەمایەوە دایئەنا هەتا دەمرد، یا مارەییەکەی بۆ دەگێڕایەوە، خوای گەورە لەو بارەیەوە حوکمی خۆی داوە واتە ئەوەی قەدەغە کردووە (تفرد بە ابوداود).

هەروەها لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: ژنی سەردەمی نەفامی ئەگەر مێردەکەی بمردایە پیاوێك ئەهات کراسێکی ئەدا بەسەریدا، ئیتر ئەو ژنە ئەبووە شایستەی ئەو پیاوە.

ئیبنو عەباس وتوویەتی: پیاوی سەردەمی نەفامی ئەگەر بمردایە و کچێکی بەجێ بهێشتایە، خزمێکی دەهات کراسێکی ئەدا بەسەر ئەو کچەدا نەیدەهێشت کەس بچێ بە لایا، ئەگەر جوان بوایە مارەی دەکرد، ئەگەر ناشیرین بوایە بەندی دەکرد لە ماڵەکەیدا هەتا دەمرد و میراتییەکەی دەبرد.

هەروەها عەوفی لێوەی دەگێڕێتەوە لە سەردەمی نەفامیدا ئەگەر پیاوێکی مەدینەیی بمردایە خزمێکی دەهات کراسەکەی دەدا بەسەر ژنەکەیدا مارەکردنی

بە میراتی بۆ دەمایەوە، جگە لەو کەسی تر بۆی نەبوو مارەی بکات، وە لای خۆی ئەیهێشتەوە هەتا شتێکیان لە جیاتی ئەدا، ئیتر خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە.

زەیدی کوڕی ئەسلەم وتوویەتی: خەڵکی یەسریب کاتێ پیاوێکیان لێ بمردایە لەسەردەمی نەفامیدا هەر کەسماڵەکەی بە میرات بگرتایە ژنەکەشی بە میرات دەگرت، وە جیای دەکردەوە بۆ ئەوەی میراتییەکەی بگرێ، یان هەر کەسیان بیانویستایە مارەی دەکرد، وە ئەهلی توهامە ڕقیان لەو پیاوە بوو لەگەڵ ئەو ژنەدا هەتا تەڵاقی نەدایە، وە بە مەرجی دائەنا لەسەری کە نابێ شوو بکات بەوەی ویستی هەتا هەندێ لەوەی نەداتێ کە پیاوەکە دەیداتێ، ئیتر خوا موسڵمانانی لەوە قەدەغە کرد (رواه ابن أبی حاتم).

ئەبو بەکری کوڕی مەردەویە لە موحەممەدی کوڕی ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حەنیفەوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: کاتێ ئەبو قەیسی کوڕی سەڵت مرد کوڕەکەی ویستی ژنەکەی مارە بکات، چونکە لە سەردەمی نەزانییدا ئەوەیان بۆ هەبوو، خوای گەورە ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا﴾ ناردە خوارەوە.

وە ئیبنو جەریر لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: عەتا بۆی گێڕاینەوە کە خەڵکی سەردەمی نەفامی ئەگەر پیاوێکیان لێ بمردایە و ژنێکی بەجێ بهێشتایە کەس و کاری ئەگەر منداڵێکیان بوایە ئەو ژنەیان دەهێشتەوە هەتا ئەو کوڕە گەورە دەبوو لێیان مارە دەکرد، ئیتر خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە.

هەروەها ئیبنو جورەیج وتوویەتی: موجاهید وتوویەتی: ئەگەر پیاوێك لە سەردەمی نەفامیدا بمردایە کوڕەکەی لە هەموو کەس زیاتر شایستە بوو کە ژنەکەی مارە بکات ئەگەر بیویستایە، ئەگەر کوڕە ئەو ژنە نەبوایە، یان برای پیاوەکە، یان برازاکەی ئەگەر بیانویستایە مارەیان دەکرد.

وە هەر ئیبنو جورەیج وتوویەتی: عەکریمە وتوویەتی: ئەو ئایەتە دەربارەی کەبیشەی کچی مەعنی کوڕی عاصم لە بەنی ئەوس کاتێ ئەبو قەیسی کوڕی

ئەسڵەت مێردی مرد کوڕەکەی باڵی بەسەردا گرت، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا من نەمیراتیم لە مێردەکەمەوە وەرگرتووەو وە من وازم لێ نەهێناوە هەتا شوو بکەمەوە، ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە.

موجاهید دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: پیاوێك ئەگەر هەیتوو لە ماڵەکەیدا بوایە و بەخێوی بکردایە بەندی دەکرد بە ئومێدی ئەوەی ژنەکەی خۆی بمرێ و ئەو کچە هەتیوە مارە بکات، یان مارەی بکات لە کوڕەکەی. منیش دەڵێم: ئەو ئایەتە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە سەردەمی نەفامیدا دەکران و ئەوەی موجاهید وتوویەتی.

وە فەرمایشی: ﴿وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ﴾ واتە: کە لەگەڵیاندا ژیان زیانیان پێ مەگەیەنن بۆ ئەوەی هەندێ لەوەی کە کراوەتە مارەیی وازی لێ بهێنێ یان هەمووی، مافی لە مافەکان کە لەسەرتە، بە زۆرو چەوسانەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ﴿وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ﴾، واتە: زۆریان لێ مەکەن ﴿لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ﴾، واتە: پیاوێك ژنێکی هەبێ پێی ناخۆش بێت لەگەڵیدا بژی، مارەیی هەبێ لەسەری، ئەویش زۆری لێ بکات کە وازی لێ بهێنێ.

ئیبنو موبارەك و عەبدوڕەزاق وتوویانە: موعەممەر بۆمانی گێڕایەوە لە سەمماکی کوڕی فەزڵەوە لە ئیبنو سەلمانییەوە وتوویەتی: ئەم دوو ئایەتە یەکێکیان دەربارەی فەرمانی سەردەمی نەفامی هاتۆتە خوارەوەئەویتریان دەربارەی فەرمانی سەردەمی ئیسلام.

عەبدوڵلای کوڕی موبارەك وتوویەتی: واتە: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ﴾ بۆ سەردەمی نەفامی، ﴿وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ﴾ بۆ سەردەمی ئیسلام.

وە فەرمایشی ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ﴾ ئیبنو مەسعود و ئیبنو عەباس و سەعیدی کوڕی موسەیب و شەعبی و حەسەنی بەسری و موحەممەدی کوڕی سیرین و سەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهید و عەکریمە و

عەتای خۆراسانی و زەحاك و ئەبو قەلابە و ئەبو سالح و زەیدی کوڕی ئەسلەم و سەعیدی کوڕی ئەبی هیلال وتوویانە: مەبەستی بەوانەیە زینایە، واتە: کاتێ زینای کرد بۆت هەیە ئەو مارەییەی پێت داوە لێی بسەنیتەوە، سەرزەنشتی بکەیت هەتا وازی لێ بهێنێ، وەك خوای گەورە لە سورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٢٢٩].

ئیبنو عەباس و عەکریمە و زەحاك وتوویانە: ﴿بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ نەویستن و سەرپێچی کردنە، وە ئیبنو جەریر ئەوەی هەڵبژاردووە کە گشتییە و زینا و سەرپێچی کردنە و نەویستن و زمان پیسییە، وە جگە لەوانەش واتە ئەوانە هەموو سەرزەنشتکردنی ئافرەت ڕەوا دەکات هەتا واز لە هەقەکەی دەهێنێ یان لە هەندێکی و لێی جیادەبێتەوە ئەوە چاکە ـ ئیتر خوا دەزانێ ـ.

لە پێشەوە باسی ئەوە کرا کە عەکریمە و ئیبنو عەباس دەربارەی فەرمایشی: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾، وتوویانە: ئەوەش ئەوەبوو کە پیاو ژنی خزمی نزیکی بە میرات دەگرێ، بەندی دەکرد هەتا دەمرد، یان مارەییەکەی بۆ دەگێڕایەوە، خوای گەورە ئەوەی قەدەغە کرد، وە عەکریمە و حەسەنی بەسری وتوویانە: ئەوە، ئەوە پێویست دەکات سیاقەکە هەموو دەربارەی فەرمانی سەردەمی نەفامی بووە، بەڵام خوا قەدەغەی لە موسڵمانان کردووە ئەو کارە بکەن .

عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید وتوویەتی: ئەو بەندکردنە لەناو قوڕەیش دا بوو لە مەککە، پیاوێك ئافرەتێکی شەریفی دەهێنا، کە دەیزانی لەگەڵیا ڕێك ناکەوێ لێی جیادەبووەوە بە مەرجێ شوو نەکاتەوە هەتا ئەو پیاوە ڕێی پێنەدا، شایەتی دەهێنا و دەیان نووسی و واژوویان دەکرد، ئەگەر کەسێك داوای بکردایە ئەویش شتێکی بدایە بەو پیاوەو ڕازی بکردایە ڕێی پێ ئەدا، ئەگینا عەزلی دەکرد، ئەوەش فەرمایشی: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾، موجاهید دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ئەوە وەك ئەو عەزلە وایە کە لە سورەتی (البقرة)د هاتووە.

﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ واتە: قسەکانتان خۆش بکەن لەگەڵیاندا و کردەوە و شێوەتان چاك بکەن بەپێی تواناتان وەك ئەوان پێیان خۆشە، تۆش ئەوە داوا لەو بکە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ﴾ [البقرة: ٢٢٨]، وە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "خيركم خيركم لاهله وأنا خيركم لأهلي"، واتە: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ خێزانەکەیدا چاك بێت، وە من بە هەمووتان چاکترم بۆ خێزانەکەم. وە لە ڕەوشتەکانی (دروودی خوای لێ بێت) تێکەڵ بوونی جوانی هەبوو هەمیشە ڕووخۆش بوو یاری لەگەڵ خێزانەکەی دەکرد، وە نەرمونیان بوو لەگەڵیاندا و نەفەقەی فراوانی دەکێشان، وە ژنەکانی دەخستە پێکەنین، وە پێشبڕکێی لەگەڵ عائیشەی دایکی موسڵماناندا دەکرد خوای لێی ڕازی بێت بەوە سۆز و خۆشەویستی بۆ دەردەخست.

عائیشە وتوویەتی: پێشبڕکێم لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەکرد، پێشکەوتم کە هێشتا گۆشتم نەگرتبوو، پاشان کە گۆشتم گرت پێشبڕکێم لەگەڵدا کردەوە ئەو (دروودی خوای لێ بێت) پێشم کەوت، فەرمووی: ئەم پێشکەوتنە بەوەی پێشوو کە تۆ پێشم کەوتی. وە هەموو ژنەکانی هەموو شەوێك لەو ماڵەدا کۆدەکردەوە کە سەرەی مانەوەی بوایە تێیدا لەگەڵیان نانی شێوانی دەخوارد هەندێ جار، پاشان هەریەکەیان دەچووەوە ماڵەکەی خۆی، لەناو یەك پێخەفدا لەگەڵ ژنەکەی دەخەوت، کراسەکەی لەسەر شانی دائەکەند و بە ئیزارەوە دەخەوت و کاتێ نوێژی عیشای بکردایە ئەچووە ماڵەوە و هەندێ لەگەڵ خێزانەکەیدا قسەی دەکرد پێش ئەوەی بخەوێ بەوە ڕامیان دەبوو (دروودی خوای لێ بێت)، وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾ [الأحزاب: ٢١]. حوکمەکانی تێکەڵی لەگەڵ ژنان و ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە بە درێژی جێگەکەی کتێبەکانی (الأحكام)ە، سوپاس بۆ خوا.

﴿فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾
واتە: لەوانەیە کە ئارامگرتنتان لەگەڵ مانەوەتان لەگەڵیان هەرچەندە بێزار بن دەربارەیان خێرێکی گەورەی هەیە بۆتان لە دونیا و ئاخیرەتدا وەك ئیبنو عەباس دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ئەویش ئەوەیە سۆزی هەبێ بەرامبەری خوا

ڕێکیان پێ دا وە لەو کورەدا خێرێکی زۆریان دەست بکەوێت، لە فەرموودەی سازدا هاتووە "لا یفرك مؤمن مؤمنة ان سخط منها خلقا رضی منها آخرا" واتە: نابێ باوەڕدار ڕقی لە ژنی باوەڕداری خۆی بێت ئەگەر ڕەوشتێکی بەدڵ نەبوو ڕەوشتێکی تری بە دڵە.

﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾﴾، واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە ویستی لە ژنەکەی جیا بێتەوە ژنێکی دیکە بهێنێ هەرچی مارەیەکی داوەتێ نابێ هیچی لێ بسەنێتەوە ئەگەر باری چەند وشتر ماڵی بووە، لە سورەتی (آل عمران) دا قسەمان لەسەر (قنطار) کرد بەپێی پێویست، ئێستا پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

لەم ئایەتەدا بەڵگەی ئەوە هەیە دروستە ماڵی زۆر بە مارەیی بدرێت بە ژن، عومەری کوڕی خەتتاب قەدەغەی کرد لە مارەیی زۆر، پاشان لەوە پەشیمان بووەوە وەك ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ئەیفەرموو: زیادەڕەوی مەکەن لە مارەیی دان بە ژنان، چونکە ئەگەر ئەوە مەکرەمە بوایە لە دونیادا یا تەقوا بوایە لای خوا، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە ئێوە لە پێشتر بوو ئەو کارە بکات، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە دوانزە مسقال لە زێڕ زیاتری نەکردۆتە مارەیی ژنەکانی و کچەکانی، چونکە ئەگەر پیاو بە مارەیی ژنەکەیەوە تووش بوو دژایەتی ژنەکەی ئەکات لە دڵی خۆیدا هەتا دەڵێ پڕ بە مەشکەیەك پارەم بە خەرج کردی (ترمزی وتوویەتی ئەوە چاك و راستە).

ڕێگایەکی دیکە لە عومەرەوە: فەرموودەڕەوان ئەبو یەعلی وتوویەتی: لە شەعبی و مەسروقەوە هاتووە کە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) چووە سەر دوانگەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، پاشان وتی: ئەی خەڵکینە! ئەوە چییە ئەو مارەییە زۆردانەتان بە ژنان، پێغەمبەر و هاوەڵەکانی مارەیی نێوانیان چوار سەد درهەم بوو، یان لەوە کەمتر بووە، ئەگەر ئەو مارەییە زۆردانەتان تەقوا بوایە لای خوا یان کەرامەت بوایە بۆیان ئێوە پێش ئەوان نەدەکەوتن.

ژنان پیاوێك نازانن کە لە چوار سەد درهەمی دابێ بە مارەیی ژندا،

ئەڵێ: پاشان هاتە خوارەوە، ژنێکی قوڕەیشی ڕێی پێ گرت، وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران قەدەغەت کرد خەڵك مارەیی زۆر بدەن بە ژن لە چوار سەد درهەم، وتی: بەڵێ ژنەکە وتی: ئەی نەتبیستووە خوا دەربارەی چی ناردووەتە خوارەوە، وتی: چی ناردۆتە خوارەوە؟ ژنەکە وتی: نەتبیستووە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾ الآية، عومەر وتی: خوایە لێم ببورە هەموو خەڵك لە عومەر زاناترن، پاشان گەڕایەوە بۆ سەر دوانەگەو وتی: من لەوەوپێش قەدەغەم کرد لێتان لە چوار سەد درهەم زیاتر بدەنە مارەیی بۆ ژنان، ئێستا هەر کەس حەز بکات هەموو ماڵەکەی بدات بە مارەیی. (اسناده جید).

ڕێگایەکی تری ئیبنو مونزیر وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتاب وتوویەتی: زیادەڕەوی مەکەن لە مارەیی دان بە ژنان، ژنێك وتی: ئەوە بۆ تۆ نییە ئەی عومەر، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾ لە زێڕ، عومەر وتی: ژنێك دژی عومەر وەستا و سەرکەوت بەسەریدا.

ڕێگایەکی تر لە عومەرەوە پچڕاندنی تێدایە زوبێری کوڕی بەکار وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتاب وتوویەتی: زیادەڕەوی مەکەن لە دانی مارەیی بە ژنان ئەگەریش کچی زی غوصە بووە ـ مەبەستی یەزیدی کوڕی حوصەینی حارسی بووە ـ هەر کەس زیادی دا زیادەکە ئەخەمە خانەی داراییەوە (بیت المال)، ژنێك هەڵسا وتی: ئەوە بۆ تۆ نییە عومەر، عومەر وتی: بۆچی؟ ژنەکە وتی: لەبەرئەوەی خودا فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا﴾ عومەر وتی: ژنێك ڕاستی پێکاو پیاوێك هەڵەی کرد.

لەبەر ئەوە خوای گەورە بە ئینکارییەوە دەفەرموویێت: ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾. واتە: ئەی چۆن مارەیی لە ژنەکانتان دەسێننەوە کاتێ لەناو یەك جێگەدا بەیەکەوە خەوتوون؟

ئیبنو عەباس و موجاهید و سوودی و چەند کەسی تر وتوویانە: مەبەستی لەوە جیماعە.

لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بەو

دوانەی تەلاعونیان کرد دوای لێبوونەوەکەیان لە لیعان کردنەکە فەرمووی: "الله یعلم أن أحدکما کاذب، فهل منکما تائب؟ قالها ثلاث، فقال الرجل یارسول الله مالی؟ یعنی ما اصدقها؟ قال: "لا مال لك ان کنت صدقت علیها فهو بما استحللت فرجها وان کنت کذبت علیها فهو ابعد لك منها". واتە: خوا دەزانێ یەکێ لە ئێوە درۆی کردووە، ئایا کەسێکتان تۆبە دەکەن؟ سێ جار ئەوەی فەرموو، پیاوەکە وتی: ئەی نێردراوی خوا ماڵەکەم؟ واتە ئەوەی کردوومەتە مارەیی، فەرمووی: ماڵت بۆ نییە، ئەگەر کردبێتە مارەیی ئەوە بەوە بووە کە عەورەتیت پێ حەڵاڵ کردووە، وە ئەگەر درۆت لەسەر کردبێ لە تۆ دوورترە لەو.

لە سونەنی ئەبید داوددا هاتووە لە بوصرەی کوڕی ئەکتەمەوە هاتووە کە کچێکی مارە کردووە لە خدرەکەیدا سەیر دەکا دووگیانە بە زینا، دێت بۆ لای پێغەمبەر ئەوەی بۆ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر حوکمی دا بەوەی کە مارەیی بداتێ و لەیەکی جیا کردنەوە، وە فەرمانی دا جەڵدیان لێ دا، وە فەرمووی: "الولد عبد لك فالصداق فی مقابلة البضع"، واتە: منداڵەکە ئەبێتە بەندەی تۆ وە مارەییەکە بەرامبەر چوونە لایەتی. لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾.

خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾، لە ئیبنو عەباس و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویانە: مەبەست لەوە پەیمانی هاوسەرگیرییە، سوفیانی سەوری لە حەبیبی کوڕی ئەبی سابیتەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عەباس دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: بە چاکڕاگرتن یان جیابوونەوە بە چاکی. ئەبو جەعفەری ڕازی لە رویەیعی کوڕی ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ئەوە ئەو قسەیەی پێغەمبەرە کە فەرموویەتی: "اخذتموهن بأمانة الله واستحللتم فروجهن بکلمة الله" واتە: بە ڕاسپاردەی خوا هێناوتانن و فەرجیانتان ڕەوا کردووە بۆ خۆتان بە وشەی خوا، وە وتوویەتی: لەوانەی دراون بە پێغەمبەر ئەو شەوەی شەوڕەوی پێ کراوە پێی وتووە: "جعلت أمتك لا تجوز لهم خطبة حتی تشهدوا انك عبدی ورسولي"، واتە: نەتەوەکەتم وا لێ کردووە کە دروست

نەبێ بۆیان ژن مارە بکەن هەتا شایەتی نەدەن کە تۆ بەندە و نێردراوی منی.

لە سازەواری موسلیمدا هاتووە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا فەرموویەتی: "واستوصوا بالنسا و خیراً، فانکم اخذتموهن بأمانة الله واستحللتم فروجهن بکلمة الله).

هەر خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ خوای گەورە ژنەکانی باوکی لەسەر کوڕەکانی حەرام کردووە لەبەر ڕێزلێنان و بە گەورەدانان کە دوای خۆی کوڕەکانی نەچنە لای ژنەکانی. هەتا لەسەر کوڕ حەرامە کە باوکی عەقدی زەواجیشی کردبێ لەگەڵ ژنێکدا دوای ئەو مارەی بکات، ئەوەش فەرمانێکە زانایان لەسەری کۆن.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: عەدی کوڕی سابیت لە پیاوێکی ئەنسارییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: کاتێ ئەبو قەیس مرد ـ واتە ئیبنو ئەسلەت ـ کە پیاوێکی چاك بوو لە ئەنصار، قەیسی کوڕی داوای ژنەکەی کرد، ژنەکە وتی: تۆ وەك کوڕی خۆم وایت، کە تۆ لە پیاوچاکی قەومەکەتی، بەڵام ئەچم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) داوای فەرمانی لێدەکەم، هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وتی: باوکی قەیس کردووە، ئەویش (درودی خوای لێ بێت) قسەی خێری بۆ کرد، پاشان ژنەکە وتی: قەیسی کوڕی داوام دەکات، کە لە پیاوچاکانی قەومەکەیەتی، بەڵام من بە کوڕی خۆمم داناوە، تۆ ڕات چییە؟ فەرمووی: "ارجعی الی بیتك" ئێستا بگەڕێوە بۆ ماڵەکەت، ئەڵێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: عەکریمە دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ وتوویەتی: دەربارەی ئەبی قەیسی کوڕی ئەسلەت هاتۆتە خوارەوە کە ئوم عەبدوڵلای کچی صەفر ژنی باوکی بوو، وە دەربارەی ئەسوەدی کوڕی خەلەف، وە خەلەف مێردی کچی ئەبی تەڵحەی کوڕی عەبدولعیزای کوڕی عوسمانی کوڕی عەبدودار بوو، وە لای خەلەفی باوکی بوو، وە دەربارەی فاخیتەی کچی ئەسوەدی کوڕی موتەلیبی کوڕی ئەسەد کە لای ئومەیەی کوڕی خەڵەف بوو، کە دوای ئەو صەفوانی کوڕی ئومەیەی بووە هاوسەر.

سوهەیلی وتوویەتی: مارەکردنی ژنی باوك لە سەردەمی نەفامیدا كاری پێکراوە، لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ وەك فەرموویەتی: ﴿وَأَن تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾، وە وتوویەتی: کینانەی کوڕی خوزەیمەش ئەوەی کردووە، ژنی باوکی خۆی هێناوە، نەچری کورشی کینانەی لێ بووە، وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووە: (ولدت من نکاح لا من سفاح) واتە: بە نیکاح لە دایك بوی نەك لە تاوان. وتوویەتی: ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوەیان بۆ بووە ئەو کاتە ئەگەر مەبەستی ئەوە بوویێ لە نێوان خۆیاندا بە نیکاحیان داناوە.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: خەڵکی سەردەمی نەفامی هەموو ئەوانەیان بە حەرام دەزانی کە خوا حەرامی کردووە جگە لە مارە کردنی ژنی باوك و دوو خوشك هێنان بەسەریەکەوە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَلَا تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاءِ﴾، ﴿وَأَن تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ﴾ [النساء: ٢٣] عەتا و قەتادەش ئەوەیان وتووە، بەڵام ئەوەی سوهەیلی دەربارەی بەسەرهاتی کەنانە چاو پیاخشاندنەوەی دەوێ. ئیتر خوا دەزانێ.

لەسەر هەموو شێوەیەك ئەو کارە حەرامە لەم ئایەتەدا و ناشیرینترین کارە بەوپەڕی ناشیرینی، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلًا﴾.

وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ [الأنعام: ١٥١]، ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾ [الإسراء: ٣٢] واتە: بە ئاشکرا و بە نهێنی خۆتان تووشی داوێنپیسی مەکەن، لێرەدا وشەی ﴿وَمَقْتًا﴾ی زیادکردووە واتە: بوغز، واتە: ئەوە کارێکی گەورەیە لە خۆیدا ئەبێتە هۆی ڕق و کینەی باوك بۆ کوڕەکەی دوای ئەوەی ژنەکەی هێنا، چونکە بەشی زۆری ئەوانەی کە ژنەکەیان هێناوەتەوە بووەتە هۆی ڕق لێبوون لەلایەن مێردی پێشوویەوە، لەبەر ئەوە دایکەکانی باوەڕداران حەرامکراون لەسەر نەتەوەی ئیسلام، لەبەر ئەوەی ژنی کەسێك بوون وەك باوك وابوو بۆ نەتەوەکەی، بەڵکو مافی ئەو (دروودی خوای لێ بێت) گەورەترە لە مافی باوکەکان

بە کۆی زانایان، بەڵکو خۆش ویستنی پێش خۆش ویستنی خۆ خراوە (درودی خوای لێ بێت).

عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح دەربارەی ﴿وَمَقْتًا﴾ وتوویەتی: خوا ڕقی لێ هەڵدەگرێ و ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ واتە: خراپترین ڕێگەیە هەر کەس لەسەری بڕوا هەرکەس ئەوە بکات دوای ئەوە ئەو کەس هەڵگەڕایەوە لە باوەڕ ئەبێ بکوژرێ و ماڵەکەی بکرێتە فەری بۆ خانەی دارایی وەك ئیمام ئەحمەد و ئەهلی سونەنەکانی گێڕاویانەتەوە لە ڕێگای بەڕای کوڕی عازیبەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) ناردوویەتی بۆ پیاوێك ژنی باوکی خۆی هێنابوو دوای مردنی فەرمانی پێدا کە بیکوژێ و ماڵەکەی بیات.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: بەڕای کوڕی عازیب وتوویەتی: حاریسی مامم بە لامدا تێپەڕی ئاڵایەکی بەدەستەوە بوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بۆ بەستبوو پێموت: مامە ئەوە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بۆ کوێی ناردووی؟ وتی: بۆ سەر پیاوێك ژنی باوکی خۆی هێناوە و فەرمانی پێکردووم بدەم لە ملی.

کێشەیەك: زانایان هەموو کۆن لەسەر ئەوەی کە حەرامە هێنانی ژنێك لەلایەن کەسێکەوە باوکی چوویێتە لای، یان بە موڵکی یەمین یان بە شوبهە، بەڵام جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی کە باوکی ئەو کەسە دەستی لێدابێت بە ئارەزووەوە بێ ئەوەی جیماعی لەگەڵدا بکات یان سەیری ئەو شوێنەی بکات کە حەرام بێت سەیرکردنی ئەگەر بێگانەش بێت، لە ئیمام ئەحمەدەوە گێڕراوەتەوە کە بەوەش حەرام دەبێت.

ئیبنو عەساکیر لە ژیاننامەی خەدیجی حەمسی دا کە مەولای موعاویە بووە، وتوویەتی: کەنیزەکێکی سپی جوانم کڕی بۆ موعاویە و ئافرەتەکەی بە ڕووتی بۆ دەباتە ژوورەوە کە قەضیبەکەی بەدەستەوە دەبێ حەز لە عەورەتەکەی دەکات و دەڵێت: ئا ئەوە ماڵە ئەگەر ماڵی هەبێت بۆ من نابێ بیبە بۆ یەزیدی کوڕم، پاشان وتی: نەء، ڕەبیعەی کوڕی عەمر جورسیم بۆ بانگ بکە کە زانای شەریعەت بوو کاتێ هات بۆ لای وتی: ئا ئەوەم بە ڕووتی بینیوە و ئەوە و ئەوەم لێ بینیوە ئەمەوێ بینێرم بۆ یەزیدی کوڕم، وتی: کاری وا مەکە ئەی پێشەوای موسڵمانان، چونکە پێی ناشێ، پاشان وتی: ڕایەکی چاکت دا،

پاشان عەبدوڵلای کوڕی مەسعەدەی فەزاریم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کرد سەیرم کرد زۆر بۆر بوو، وتی: ئەوە بۆ تۆ هێلکەیەکە کوڕی تۆی تێدایە. وتوویەتی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعەدە پێغەمبەر بەخشیووی بە فاتیمەی کچی، ئەویش پەروەردەی کرد، پاشان ئازادی کرد، پاشان چووە پاڵ موعاویە دژی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت).

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ
وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ
ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن
نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا
جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن
تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا
رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ
عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ
مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ
عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا
﴿٢٤﴾﴾

واتە: ئەو ژنانەی پێوناشێن و لەسەرتان حەرام کراون بریتین لە: دایك و کچ و خوشك و پلك و خوشکی دایك و کچی براو کچی خوشك و ئەو ژنانەی بە ساوایی شیری ئەمانت خواردووە و ئەو کچەی هاوشیرتان بووە و خەسوتان و ئەو کچانەی خۆتان بەخێوتان کردوون و لەو ژنانەی کە ئێوە لەگەڵیاندا خەوتوون ئەگەر لەگەڵیاندا نەخەوتوون قەیدی نییە، هەروەها ژنی کوڕیشتان کە بەڕاستی ئەو کوڕە هەر لە خۆتان بێ، دوو خوشکیش هێنان پێکەوە ڕەوا نییە، جا مەگین لە پێشوودا ئەم کارە و بەسەرهاتبێ کە خوا لە هەڵە دەبووری و دلۆڤانە.

ژنی بەشووتان پێ ناشێ مەگین ئەوانەی بوونەتە ماڵی خۆتان لە خوداوە ئەم بڕیارەتان بۆ نووسراوە جیا لەمە ڕێ دراوە بە دراوی خۆتان ژن بهێنن، بەڵام بە پاکی بێت نە بە داوێنپیسی لە بەرامبەر ئەو لەزەتەی لە ژنەکانی دەبینن ئەو ماڵەی خودا بۆیانی بڕیارداوە و کرێی خۆیانە لەسەرتان ئێوە بیدەن، ئەگەر لە پاش دیاری کردنی مارەیی لە نێو خۆتاندا پێك هاتن هیچ گوناهێك و ناگاتێ و خودا زانای لەکارزانە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئایەتە حەرام کردنی مەحرەمەکانە لە پشت و ئەوانەی شوێن ئەوە دەکەون لە شیر خواردن و مەحرەمەکان بە ژن و هاوسەرگیری. وەك ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: حەوت پشت و حەوتان لێ حەرام کراوە بە ژن و ژنخوازی و ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ﴾، ئەوان لە پشتن.

جەماوەری زانایان گشتێتی ئەو ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە لە ئاوی زینا دروست دەبێت حەرامە، ﴿وَبَنَاتُكُمْ﴾ کە ئەوە کچە ئەوەش دەچێتە ناو گشتێتی ئایەتەکە وەك ئەوە مەزهەبی ئەبو حەنیفە و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە.

بێ سۆ شتێك لە شافیعییەوە دەگێڕنەوە دەربارەی ڕەوایی، چونکە کچی شەرعی نییە وەك چۆن ناچێتە ناو ئایەتی: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ [النساء: ١١] ئەو کچە میرات ناگرێ بە کۆی زانایان وە بەو شێوەیەش ناچێتە ناو ئەو ئایەتەوە، ئیتر خوا دەزانێ.

﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾ واتە: وەك چۆن ئەو دایکەت لەسەر حەرامە کە بویتی، بەو شێوەیەش ئەو دایکەت لەسەر حەرامە کە شیری پێداوی، لەبەر ئەوە لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە عائیشەی دایکی موسڵمانانەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الرضاعة تحرم ما تحرم الولادة" وە لە زاراوەکەی موسلیمدا هاتووە: "يحرم من الرضاعة من يحرم من النسب" واتە: بە شیردان حەرام دەبن ئەوانەی بە نەسەب حەرامن.

هەندێ لە زانایان وتوویانە: هەرچی بە پشت حەرام بێت بە شیردانیش

حەرام دەبن جگە لە چوار جۆر، هەندێکیان وتوویانە جگە لە شەش جۆر، کە لە کتێبەکانی لقەکاندا باس کراوە، بەڵام لە ڕاستییدا هیچیان لێ جیاناکرێتەوە، چونکە وەك هەندێك هەن لە پشت داو هەندێکی حەرام کراوە لە رووی ژن و ژنخوازییەوەو هیچ لە حەدیسەکەی هەرگیز رەد ناکرێتەوە.

پاشان زانایان جیاوازن لەسەر ژمارەی ئەو شیر پێدانەی ئەبێتە هۆی حەرام کردن، کۆمەڵێك بۆ ئەوە چوون هەر شیرپێدانی پەتی ئەبێتە هۆی حەرام بوون بەپێی گشتێتی ئایەتەکە، ئەوەش قسەی مالیکە، وە لە ئیبنو عومەریشەوە دەگێڕرێتەوە و سەعیدی کوڕی موسەیب و عەروە و ئیبنو زوبێر و زوهری بۆ ئەوە چوون، بەڵام هەندێ لە زانایان وتوویانە لە سێ جار شیرپێدان کەمتر نابێتە حەرام کردن. بەپێی ئەوە چەسپاوە لە سازەواری موسلیمدا لە ڕێگەی هیشامی کوڕی عوروەوە لە باوکییەوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تحرم المصة ولا المصتان" واتە: مژو دوو مژ نابێتە حەرام بوون.

قەتادە وتوویەتی: لە ئەبی خەلیلەوە لە عەبدوڵلای کوڕی حاریسەوە لە ئەم فەزڵەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تحرم رضعة ولا الرضعتان والمصة والمصتان"، وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە: "لا ترحم الأملاجة ولا الأملاجتان" (رواه مسلم) واتە: جارێك شیرپێدان و دوو جار و مژێك و دوو مژ نابێتە هۆی حەرامی.

ئەوانەی بۆ ئەوە چوون: ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە و ئەبو عوبێد و ئەبو سەورن، ئەوەش لە عەلی و عائیشە و ئوم فەزڵ و ئیبنو زوبێر و سولەیمانی کوڕی یەسار و سەعیدی کوڕی جوبێرەوە دەگێڕنەوە ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ.

هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: لە پێنج شیرپێدان کەمتر نابێتە هۆی حەرام بوون. بەپێی ئەوەی لە سازەواری موسلیمدا هاتووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: ئەوەی کە هاتووەتە خوارەوە لە قورئان ئەوەیە " دە شیرپێدانی دیاری ئەبێتە هۆی حەرامی"، پاشان سڕراوەتەوە بووە بە پێنج شیرپێدان. وە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە کۆچی دوایی کرد ئەوانە لەوانە بوون لە قورئاندا دەخوێنرانەوە.

لە حەدیسی سەهلەی کچی سوهەیل دا هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمانی پێداوە کە شیر بدات بە سالم مەولای ئەبو حوزەیفە پێنج جار.

عائیشە فەرمانی دەکرد بەو کەسەی ئەیویست بچێتە ماڵەکەی کە پێنج شیرەکەی بداتێ. شافیعی هاوەڵەکانی ئەوە دەڵێن.

پاشان با بزانرێ کە ئەبێ شیرپێدانەکە لە تەمەنی منداڵییدا بێت و نەگەشتبێتە دوو ساڵ لەسەر قسەی جەماوەر وەك لە پێشەوە لە سورەتی (البقرة) دا لەسەر دواین لای ئایەتی: ﴿يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ [البقرة: ٢٣٣]. پاشان زانایان جیاوازییان هەیە دەربارەی ئەوەی شیردان بە گەورە دەبێتە هۆی حەرام بوون وەك ئەوە قسەی جەماوەری چوار پێشەواکەیە و غەیری ئەوانیش، یان شیرپێدان تایبەتە بە دایکەوە تەنها، وە ئەوە لایەنی باوك ناگرێتەوە وەك قسەی هەندێ لە پێشینان، ئەوەش لەسەر دوو قەولە کە لە کتێبی (الأحكام الكبير)دا باسی لێوەکراوە.

﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾، بەڵام دایکی ژن واتە خەسوو حەرام دەبێت بەوەی پەیمانی هاوسەرێتی لەگەڵ کچەکەیدا ببەسترێ بیگوێزیتەوە یان نا، بەڵام ڕەبیبە کە کچی ژنەکەیە بە پەیمانی پەتییەکە حەرام نابێت هەتا نەی گوێزیتەوە، ئەگەر دایکەکە تەڵاق درا پێش چوونە لای دروستە بۆ پیاو کە کچەکەی بخوازێ لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ تاوانبار نابن لە هێنانیان ئەوەش تایبەتە بە ڕەبیبەوە بە تەنها، هەندێ وا تێگەیشتوون کە (ضمیر)ەکە دەگەڕێتەوە بۆ دایکەکان و ڕەبیبەکان، وتوویانە نە دایك نە کچ حەرام نابن بە پەیمانی پەتی هەتا نەچێتە لای بەپێی فەرمایشی: ﴿فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾. ئەگەر نەچوبیتە لایان تاوان نییە بۆتان دایکەکە یان کچەکە بهێنن.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عەلییان پرسیوە دەربارەی پیاوێك ژنێك مارە

بکات پێش ئەوەی بچێتە لای تەڵاقی بدات، ئایا ئەتوانێ ئەو پیاوە دایکی ئەو ژنە مارە بکات؟ وتوویەتی: وەك ڕەبیبە وایە.

وە لە زەیدی کوڕی سابیتەوە هاتووە وتوویەتی: ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، خراپ نییە دایکی مارە بکات.

هەر لە زەیدی کوڕی سابیتەوە وتوویەتی: ئەگەر ئەو ژنە لای ئەو پیاوە مرد و پیاوەکە میراتەکەی وەرگرت کەراهەتی هەیە کە دایکی بهێنێ، جا ئەگەر تەلاقی دا پێش ئەوەی بچێتە لای ئەگەر حەز بکات ئەو کارە دەکات.

ئیسحاق بۆی گێڕاینەوە کە بەکری کوڕی کەنانە وتوویەتی: باوکی لە تائیف ژنێکی بۆ مارە کرد، بەڵام نەچوومە لای هەتا مامم مرد کە مێردی دایکی بوو، دایکیشی ماڵێکی زۆری هەبوو، باوکم وتی: ئەتەوێ دایکی بهێنی؟ ئەڵێ: منیش لە ئیبنو عەباسم پرسی و بۆم باس کرد وتی: دایکی مارە بکە، ئەڵێ: پاشان لە ئیبنو عومەرم پرسی، وتی: مارەی مەکە، منیش ئەوەی ئەوان وتیان بۆ باوکم گێڕایەوە، ئەویش نامەیەکی بۆ موعاویە نووسی هەواڵی ئەوەی پێدا کە وتوویویان، موعاویە بۆی نووسییەوە: من ئەوە حەلاڵ ناکەم کە خوا حەرامی کردووەو ئەوە حەرام ناکەم کە خوا حەلاڵی کردووە، ژنی تر زۆرە واز لەوە بهێنە، موعاویە نە لێی قەدەغە کرد نە ڕێی پێدا، ئەڵێ ئیتر باوکم وازی لە دایکی هێناو مارەی نەکرد.

هەر لە پیاوێکەوە هاتووە کە عەبدوڵلای کوڕی زوبێر وتوویەتی: ڕەبیبەکە و دایکی وەك یەکن مارەکردنی خراپ نییە ئەگەر نەچووبێتە لای ژنەکە (لە ئیسنادەکەیدا پیاوێکی نادیار هەیە ناوی نەبردووە).

ئیبنو جورەیج وتوویەتی: عەکریمەی کوڕی خالید پێی ڕاگەیاندم کە بە موجاهیدیان وت: ﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم﴾ ئەگەر بیەوێ بچێتە لای هەموویان ئەو قسەیەش وەك دەبینی گێڕراوەتەوە لە عەلی و زەیدی کوڕی سابیت و عەبدوڵلای کوڕی زوبێر و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبێر و ئیبنو عەباس، بەڵام موعاویە لەسەری وەستاوە، وە لە شافیعییەکان ئەبو حەسەن ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی صابونی بۆ ئەوە چوون وەك ڕافیعی نەقڵی کردووە لە عەبادییەوە.

لە ئیبنو مەسعودیشەوە دەگێڕنەوە وەك ئەوەی وتووە، بەڵام لێی پەشیمان بۆتەوە، ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی دەبری لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕێتەوە: کە پیاوێك لە بەنی کەفح لە فەزارە ژنێکی مارە کرد کە دایکی بینی حەزی لێ کرد، لە ئیبنو مەسعودی پرسی؟ ئەویش فەرمانی پێدا لێی جیابێتەوە، پاشان دایکی بهێنێ، ئەویش مارەی کرد و چەند منداڵی لێی بوو، پاشان چوو بۆ لای ئیبنو مەسعود لە مەدینە لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد ئەویش پێی وت: حەڵاڵ نییە بۆت کاتێ گەڕایەوە بۆ کوفە بە پیاوەکەی وت: ئەوە حەرامە بۆت لێی جیابەرەوە.

جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە ڕەبیبە حەرام نابێت بە پەیمان لەسەر بەستن بە پێچەوانەی دایکەوە کە حەرام دەبێت بە پەیمانی پەتی.

لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەگەر پیاوێك ژنێکی تەڵاق دا پێش ئەوەی بچێتە لای یا بمرێ، دایکی حەڵاڵ نییە بۆ ئەو پیاوە مارەی بکات، وە ئەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئەوە موبهەمە بە خراپی دائەنا. پاشان وتوویەتی: لە ئیبنو مەسعود و عیمرانی کوڕی حوسەین و مەسروق و تاووس و عەکریمە و حەسەن و مەکحول و ئیبنو سیرین و قەتادە و زوهری وەك ئەوە دەڵێن. ئەوەش بۆچوونی چوار پێشەواکە و حەوت فەقیهەکەیە و جەماوەری زانایانی کۆن و نوێ (سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە).

ئیبنو جەریر وتوویەتی: ڕاستی قسەی ئەوانەیە کە وتوویانە: کێشەی دایك ئاڵۆزە، چونکە خوای گەورە چوونە لای نەکردووە بە مەرج وەك کردوویەتی بە مەرج لەسەر دایکی ڕەبیبە لەگەڵ ئەوانەشدا ئیجماع لەو بەڵگانەیە پێچەوانە کارکردنی دروست نییە لەوانەدا هاتوون کە زانایان لەسەری ڕێکن.

لەو بارەیەوە حەدیسێك ئەگێڕرێتەوە کە بە ئیسنادەکەیدا چاوخشاندنەوە پێویستە ئەویش ئەوەیە موسەننا لە حیبانی کوڕی موساوە لە ئیبنو موبارەکەوە لە موسەننای کوڕی سەباحەوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرییەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (إذا نكح الرجل امرأة فلا يحل له أن يتزوج أمها دخل بالبنت أو لم يدخل وأذا تزوج بالأم فلم يدخل بها ثم طلقها فإن شا و تزوج الإبنة" واتە: ئەگەر پیاوێك

ژنێکی کردە هاوسەری حەڵاڵ نییە بۆی دایکی بکاتە هاوسەری دوای ئەوەی چوویێتە لای کچەکە یان نەچوویێتە لای، بەڵام ئەگەر دایکەکەی کردە هاوسەری نەچوویێتە لای، پاشان تەڵاقی دابێ ئەگەر بیەوێ کچەکەی مارە بکات'. ئەم هەواڵە هەر چەندە ئیسنادەکەی قسەی لەسەرە لە ئیجماعدا بەڵگە هەیە لەسەر راستی قسەکە ئیتر پێویستی بە شاهید نییە لەسەر راستێتی بە جگە لە خۆی.

﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم﴾ جەماوەر لەسەر ئەوەن کە رەبیبە حەرامە لە ماڵی پیاودا بێت لە ماڵیا پەروەردە نەبووبێت، وتوویانە ئەو خیطابە بە زۆری هاتووە کەس لێی تێناگات. وەك فەرمایشی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ [النور: ٣٣].

لە هەردوو سازەواردا هاتووە لە ئوم حەبیبەوە وتوویەتی: ئەی نێردراوی خوا کچەکەی ئەبی سوفیانی خوشکم مارە بکە، فەرمووی: ئەوەت پێ خۆشە، وتی: بەڵێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی ئەوە بۆ من حەڵاڵ نییە. وتی: ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە بە تەمای مارەکردنی کچەکەی ئەبی سەلەمە بهێنی، فەرمووی: 'کچی ئوم سەلەمە'، وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر لە ماڵی مندا پەروەردە نەبوایە هەر بۆم حەڵاڵ نەبوو، ئەوە کچی برای شیریمە، سوەیبە شیری داوە بە من و ئەبا سەلەمە نە کچەکانتان نە خوشکەکانتانم نیشان مەدەن.

لە ریوایەتی بوخاریدا هاتووە فەرموویەتی: ئەگەریش ئوم سەلەمەمە نەهێنایە هەر بۆم حەڵاڵ نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نیشانەی حەرام بوونەکەی بە مارەکردنی ئوم سەلەمە دەرخستووە، لەبەر ئەوە حوکمی حەرامی داوە تا ئەوەش بۆچوونی چوار پێشەواکەو حەوت فەقیهەکە و جەماوەری پێشینان و دواییە.

وتراوە: رەبیبە حەرام نابێت ئەگەر لە ماڵی پیاوەکەدا پەروەردە نەبووبێ، ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە مالیکی کوڕی ئەوسی کوحەتانەوە هاتووە وتوویەتی: ژنێکم هەبوو مرد، منداڵێکم هەبوو لێی، زۆرم خەفەت بۆ خوارد، عەلی کوڕی ئەبی تالیبم پێگەیشت، وتی: ئەوە چیتە؟ وتم: ژنەکەم مردووە،

عەلی وتی: کچی هەیە لە پیاوێکی تر؟ وتم: بەڵێ لە تائیفە، وتی: تۆ پەروەردەت کردووە لەوەوپێش؟ وتم: نە و لە تائیف بووە، وتی: مارەی بکە، وتم: ئەی ئایەتی: ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم﴾، لەکوێ؟ وتی: ئەوە لە ماڵی تۆدا پەروەردە نەبووە ئەوە بۆ ئەوانەیە کە لە ماڵەکەتدا پەروەردە بووبێ. ئەوە ئیسنادێکی بەهێزە و چەسپاوە لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە لەسەر مەرجی موسلیم، ئەوەش قسەیەکی زۆر غەریبە، وە ئەبو قاسمی رافیعی لە مالیکەوە گێڕاویەتییەوە ئیبنو حەزم هەڵیبژاردووە ئیبنو موندیر وتوویەتی: عەلی کوڕی عەبدولعەزیز لە ئەسرەمەوە لە ئەبی عوبێدەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی ﴿ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم﴾ وتوویەتی: دەربارەی ئەوانەیە لە ماڵەکانتاندا پەروەردە کراون، بەڵام رەبیبەی موڵکی یەمین ئیمام مالیك وتوویەتی: کە عومەری کوڕی خەتتاب دەربارەی ژنێك و کچەکەی لە موڵکی یەمین ئایا چوونە لایان یەك لە دوای یەك دروستە؟ وتی: من حەز ناکەم هەواڵیان پێ بدەم کە بیەوێ بچێتە لای هەردووکیان، ئەوەش پچڕاندنی تێدایە.

سونەیدینی کوڕی داود لە تەفسیرەکەیدا وتوویەتی: ئەبو ئەوەش بۆی گێڕاینەوە لە تاریقی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە لە قەیسەوە کە وتوویەتی: بە ئیبنو عەباسم وت: پیاو بۆی هەیە بچێتە لای ژن و کچەکەی کە موڵکی یەمین بن؟ وتی: ئایەتێك حەڵاڵی کردووون و ئایەتێك حەرامی کردوون، من ئەوە ناکەم.

شێخ ئەعمەری کوڕی عەبدولبەڕ بەڕەحمەتی خوا بکەوێت وتوویەتی: لە نێوان زانایان جیاوازی نییە لەسەر ئەوەی کە حەڵاڵ نییە بۆ کەس بچێتە لای دایك و کچی موڵکی یەمین، چونکە خوای گەورە ئەوەی حەرام کردووە لە نیکاحدا.

﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ﴾ وە موڵکی یەمین لای ئەوان تابیعی نیکاحە جگە لەوەی لە عومەر و ئیبنو عەباسەوە گێڕاوەتەوە. ئیتر کەسی تر لە پێشەواکان و ئەوانەی شوێنیان کەوتوون فەتوایان لەسەر ئەوە نەداوە.

وە لە قەتادەوە هاتووە وتوویەتی: کچی رەبیبە و کچی کچەکەی ناشێن مارە بکرێن بەرەو خواریش هەتا درێژ دەبێتەوە. قەتادە لە ئەبی عالیەوە ئەوە دەگێڕێتەوە.

واتای فەرمایشی: ﴿ٱلَّـٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ﴾ کردبێتتانە هاوسەرتان، ئیبنو عەباس و چەند کەسی تر ئەوەیان وتووە، ئیبنو جورەیج لە عەتاوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەویش ئەوەیە کە لە نێوان ڕانەکانیدا دانیشتبێ.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: زانایان هەموو کۆن لەسەر ئەوەی مانەوە بە تەنها لەگەڵ ژندا کچەکەی حەرام ناکات کاتێ تەڵاقی بدات پێش ئەوەی دەستی لێ بدات و بچێتە لای، یان پێش ئەوەی بەشەهوەتەوە سەیری فەرجی بکات بەشێوەیەك بەڵگە بێت لەسەر واتای گەیشتنی بە جیماع لەگەڵ کردنی.

﴿وَحَلَـٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَـٰبِكُمۡ﴾ واتە: حەرام کراوە لەسەرتان ژنی ئەو کوڕانەتان کە لە خۆتان بووە پشتتان. بەوە خۆ ئەپارێزرێ لەوانەی تەبەنی دەکران لەسەردەمی نەفامیدا وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٌ مِّنۡهَا وَطَرًا زَوَّجۡنَـٰكَهَا لِكَيۡ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزۡوَٰجِ أَدۡعِيَآئِهِمۡ﴾. [الأحزاب: ٣٧]، ئیبنو جورەیج وتوویەتی: لە عەتام پرسی دەربارەی ئایەتی: ﴿وَحَلَـٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَـٰبِكُمۡ﴾، وتی: ئێمە باسی ئەوەمان کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) کاتێ ژنە کۆنەکەی زەیدی مارە کرد کە هاوبەشدانەرەکانی مەککە لەوبارەیەوە قسەیان دەکرد، ئیتر ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَحَلَـٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَـٰبِكُمۡ﴾وە ئایەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدۡعِيَآءَكُمۡ أَبۡنَآءَكُمۡ﴾ [الأحزاب: ٤]، هاتە خوارەوە، وە ئایەتی: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ﴾ [الأحزاب: ٤٠].

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئەبو زەرعەوە لە موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری مەقدەمییەوە لە جەرحی کوڕی حاریسەوە لە ئەشعەسەوە لە حەسەنی کوڕی موحەممەدەوە کە وتوویەتی: ئایەتی: ﴿وَحَلَـٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ﴾ ﴿وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمۡ﴾. موبهەمن، پاشان وتوویەتی: وە لە تاووس و ئیبراهیم و زوهری و مەکحولەوە ئەوە دەگێڕنەوە. منیش وتومە: واتای موبهەم ئەوەیە کە گەیشتن دەربارەی ئەوانەی چوونە لایان و ئەوانەی نەچوونە لایان، کە حەرام دەبن بە پەیمانی پەتی ئەوەش زانایان ڕێکن لەسەری. ئەگەر وترا ئەی لە کوێوە ژنی

کوڕی شیری حەرام دەبێت وەك جەماوەر دەڵێن لەناو خەڵکدا ئیجماعی لەسەر دەگێڕێتەوە کە ئەو کوڕە لە پشتی نەبێ وەڵامەکەی لەم فەرموودەدایە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "یحرم الرضاع ما یحرم من النسب".

﴿وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَۗ﴾، واتە: لەسەرتان حەرام کراوە دوو خوشك بەسەریەکەوە بهێنن، هەروەها موڵکی یەمینیش جگە لەوانەتان کە لەسەردەمی نەفامیدا کردوتانە، ئێمە لەوانە خۆش بووین.

ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆ پاشەڕۆژ دوو خوشك بەسەریەکەوە هێنان دروست نییەو هەڵوێردنیش نییە بۆ بەسەرچوو وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰۖ﴾ [الدخان: ٥٦]، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیتر ئەوانە چەژی مردن ناکەنەوە، بێ سۆ زانایان لە سەحابە و تابیعین و پێشەواکانی کۆن و نوێ لەسەر ئەوەن حەرامە هەر کەس دوو خوشك بەسەریەکەوە بهێنێ، هەر کەس موسڵمان بێت و دوو خوشك ژنی بێت، ئەبێ یەکێکیان هەڵبژێرێ و ئەویتریان تەڵاق بدات.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە زەحاکی کوڕی فەیروزەوە هاتووە کە باوکی وتوویەتی: کاتێ موسڵمان بووم دوو ژنم هەبوو هەردووکیان خوشك بوون، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمانی پێدام کە یەکێکیان تەڵاق بدەم و بە ئارەزووی خۆم یەکێکیان هەڵبژێرم.

ئیبنو مەردەویە دەگێڕێتەوە کە دەیلەمی وتوویەتی: وتم ئەی نێردراوی خوا من دوو ژنم هەیە خوشکی یەکن، فەرمووی: بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان تەڵاق بدە.

هێنانی خوشکی موڵکی یەمینیش هەر حەرامە بەپێی گشتێتی ئایەتەکە، ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی عوتبە لە ئیبنو مەسعودی پرسی دروستە پیاوێك دوو خوشك لەیەك کاتدا بهێنێ؟ ئەویش بە خراپی دانا، کابرا پێی وت: ئەی خوای گەورە نافەرمووێ: ﴿إِلَّا مَا مَلَكَتۡ

﴿أَيْمَٰنُكُمْ﴾ ئیبنو مەسعود پێی وت: وشتەرەکەشت موڵکی یەمینتە. ئەوەش بەناوبانگە لەناو جەماوەری زانایان و چوار پێشەواکە و جگە لەوانیش. هەر چەندە هەندێ لە پێشینان لەسەر ئەوە هەڵوێستە دەکەن، ئیمام مالیك وتوویەتی: لە ئیبنو شەهابەوە لە قەبیصەی کوڕی زوئەیبەوە هاتووە کە پیاوێك دەربارەی هێنانی خوشکی موڵکی یەمین لە عوسمانی پرسی؟ عوسمان ئایەتێك حەڵاڵی کردوون و ئایەتێکیش حەرام، وە من خۆم شتی وا ناکەم، کابرا لای عوسمان هەڵسا لە ڕێگا گەیشت بە یەکێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لەو بارەوە لێی پرسی: ئەگەر شتێکم بە دەست بێت ئەگەر کەسێکت دۆزیەوە ئەو کارەی کردبێ ئەمکرد بە عیبرەت، لە ئییاسی کوڕی عامیرەوە هاتووە وتوویەتی: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبم پرسی وتم: من دوو خوشکی کە موڵکی یەمنمە لامە، یەکێکیانم بە نهێنی هێناوە و چەند منداڵیشم لێی بووە ئێستا ڕەغبەتم لەویتریانە کە بیهێنم چی بکەم؟ عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئەوەیان چویتە لای ئازاد بکە، پاشان بچۆ لای ئەویتریان، وتم: خەڵك دەڵێن، بەڵکو مارەی بکە لە یەکێکی تر، پاشان بچۆ لای ئەویتریان، عەلی وتی: ئەی ئەگەر پیاوەکەی تەڵاقی دا یان مرد ئایا ناگەڕێتەوە بۆ لای تۆ؟ ئەگەر ئازادی بکەی بۆ تۆ سەلامەترە، پاشان عەلی دەستی گرتم پێی وتم: ئەوانەی موڵکی یەمینی تۆن لەسەرت حەرامن وەك ئەوانەی لەسەرت حەرام کراون بە کتێبەکەی خوا لە ئازادەکان جگە لە ژمارەیان، وتی: جگە لە چوار، وە لە سەرت حەرام کراوە بە شیر، وەك ئەوانەی حەرام کراون لەسەرت بەپێی کتێبەکەی خوا بە پشت.

ئەبو بەکری کوڕی مەردویە وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی وتووم: ئایەتێك دوو خوشکی موڵکی یەمینی حەرام کردووە و ئایەتێکیش حەڵاڵی کردوون ئیبنو عەباس وتی: نزیکیان لەمنەوە حەرامی کردوون لەسەرم، بەڵام خزمایەتیان بۆ یەك لەسەریەکی حەرام نەکردوون، واتە کەنیزەکەکان، چونکە سەردەمی نەفامی ئەوانەیان لەسەر خۆیان حەرام کردبوو کە ئێوە لەسەرتان

حەرامە جگە لە ژنی باوك و دوو خوشك بەسەریەکەوە هێنان، کاتێ ئیسلام هات خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ [النساء: ٢٢] ﴿وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ واته لەوەو پێش.

ئەبو عومەر وتوویەتی: لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە وتوویەتی: لە کەنیزەکەکان حەرامە وەك ئازادەکان جگە لە ژمارە، وە کۆمەڵێك لە زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە حەڵاڵ نییە دوو خوشك بەسەریەکەوە هێنان کە موڵکی یەمین بن بە چوونە لایان بە نیکاح، وە مسوڵمانەکان لەسەر ئەوەن کە واتای ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ﴾ ئەوەیە نیکاح و موڵکی یەمین لەوانەدا وەك یەکە.

﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ واتە: حەرامکراوە لەسەرتان ژنی خاوەن مێرد ﴿إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، واتە: جگە لەوانەی بە دیل گرتووتانن، ئەوانە حەڵاڵە چوونە لایان، ئەگەر دووگیان نەبوون، چونکە ئایەتەکە لەو بارەیەوە هاتووەتە خوارەوە. ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە هاتووەو توویەتی: چەند ئافرەتێکمان بەرکەوت لە دیلەکانی ئەوطاس و مێردیان هەبوو، لامان ناخۆش بوو بچینە لایان لە کاتێکدا مێردیان هەبوو، دەربارەیان لە پێغەمبەرمان (درووودی خوای لێ بێت) پرسی؟ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، بەوە چوونە لایانمان بۆ حەڵاڵ بوو .

تەبەرانی لە زەحاکەوە دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عەباس وتوویەتی: ئەو ئایەتە دەربارەی دیلەکانی خەیبەر هاتووەتە خوارەوە، وە کۆمەڵێك لە پێشینان بۆ ئەوە چوون کە فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاقدانێتی لە مێردەکەی بەپێی گشتێتی ئایەتەکە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئیبراهیمان پرسی دەربارەی کەنیزەك کە بفرۆشرێ و مێردی هەبێ؟ وتی: عەبدوڵڵا دەیوت: فرۆشتنی تەڵاقدانێتی، وە

ئەم ئایەتەشی دەخوێندەوە کە دەفەرموویێت: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، بەو شێوەیە سوفیان لە مەیفور و موغیرە و ئەعمەشەوە لە ئیبراهیمەوە لە ئیبنو مەسعودەوە گێڕاویانەتەوە وتوویەتی: فرۆشتنی، تەڵاقدانێتی (منقطع)، وە هەر لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەگەر کەنیزەك مێردی هەبوو فرۆشرا، گەورەکەی شایستەترە کە بچێتە لای.

سەعید لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئوبەی کوڕی کەعب و جابیری کوڕی عەبدوڵلاو ئیبنو عەباس وتوویانە: فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاقدانێتی.

ئیبنو جەریر لە عەکریمە، وە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: تەڵاقدانی کەنیزەك شەشە: فرۆشتنی تەڵاقدانێتی، وە ئازادکردنی تەڵاقدانێتی، وە تەڵاقدانی لە لایەن مێردەکەیەوە هەر تەڵاقدانێتی، وە بەخشینی تەڵاقدانێتی، وە بەری کردنی تەڵاقدانێتی.

عەبدوڕەزاق وتوویەتی: موعەممەر لە زوهرییەوە لە ئیبنو موسەییبەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ وتوویەتی: ئەوانە ئەوانەن کە مێردیان هەیە خوا حەرامی کردووە نیکاح کردنیان جگە لەوانەی موڵکی یەمینن. فرۆشتنی تەڵاقدانێتی، وە لە حەسەنەوە هاتووە کە ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، وتوویەتی: ئەگەر مێردی هەبوو فرۆشتنی تەقەڵادانێتی.

وە عەوفی لە حەسەنەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاقدانێتی، وە فرۆشتنی مێردەکەشی تەڵاقدانێتی، ئەوە قسەی ئەو پێشینانەیە، بەڵام جەماوەری کۆن و نوێ پێچەوانەیانن، ڕایان وایە کە فرۆشتنی تەڵاقدانی نییە، چونکە کڕیاری جێگری فرۆشیارەکەیەتی، فرۆشیار ئەو کەڵك و سوودەی لە ژێر دەستی خۆی دەرهێناوە و فرۆشتوویەتی و لێی سەندووە، پشتیشیان بۆ ئەوە بەستووە بە حەدیسەکەی بەریرە کە لە هەردوو سازەواردا دەریان هێناوە، کە عائیشەی دایکی باوەڕداران کڕیوێتی و ئازادی کردووە، بەڵام نیکاحەکەی هەڵنەوەشاوەتەوە لە مێردەکەی کە ناوی موغیث

بووە، بەڵکو پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمانەکەی دایە دەستێ خۆی کە هەڵیوەشێنێتەوە یان دەیهێڵێتەوە، ئەویش هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژارد، کە بەسەرهاتەکەی بەناوبانگە، جا ئەگەر فرۆشتنی تەڵاقدانی بوایە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کاری خۆی ئەدایە دەستی خۆی، کاتێ دایە دەستی خۆی بەڵگەیە لەسەر مانەوەی نیکاحەکەی، وە مەبەستی ئایەتەکە ئەوانەن لە جەنگدا دەگیرێن، ئیتر خوا دەزانێ.

وە وتراوە مەبەست لە فەرمایشی ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ واتە داوێن پاکەکان حەرامن لەسەرتان هەتا نەیانکەنە موڵکی خۆتان بە نیکاح و شایەت و مارەیی و وەلییەوە نەبێ، یەکێ، یان دوان، یان سیان، یان چوار، وە عومەر و عوبێد وتوویانە: (المحصنات من النساء) جگە لە چوار، حەرامە لەسەرتان ئەوانە نەبن کە موڵکی یەمینتانن.

﴿كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ واتە: ئەو حەرامکردنە نووسراوێکە خوا نووسیویەتی لەسەرتان ئێوەش دەست بگرن بە نووسراوەکەیەوە لە سنوورەکەی دەرمەچن و دەست بگرن بە یاساکەیەوەو ئەوەی لەسەری فەرز کردوون، وە عوبێد و عەتا و سوودی دەربارەی ﴿كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ وتوویانە: واتە چوار، وە ئیبراهیم وتوویەتی: ﴿كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ واتە ئەوەی حەرام کراوە لەسەرتان .

﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ﴾ واتە: جگە لەوانەی باسمان کردن لە مەحرەمەکان ئەوانە بۆتان حەڵاڵە. عەتا و غەیری ئەویش ئەوەیان وتووە.

عوبێد و سوودی وتوویانە: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ﴾ لە خوار چوارەوە، ئەوەش شتێکی دوورە، ڕاستی قسەکەی عەتایە وەك باسکرا، وە قەتادە وتوویەتی: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ﴾ واتە ئەوانەی موڵکی یەمینتانن واتە خاوەنیانن.

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوانەیە کە کردوویانەتە بەڵگە لەسەر دوو خوشك هێنان، وە قسەی ئەوانەی وتوویانە ئایەتێك حەڵاڵی کردوون و ئایەتێك حەرامی کردووە.

﴿أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ﴾ واتە: بە سامان و ماڵی خۆتان چوار ژنتان دەستکەوێت، یان ئەوانەی لە جەنگدا گیراون بە ئارەزووی خۆتان بە ڕێگای شەرعی، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ﴾.

﴿فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ﴾ وەك چۆن خۆشییان لێوەردەگرن مارەییەکانیان بدەنێ بەرامبەر بەوە وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَكَيۡفَ تَأۡخُذُونَهُۥ وَقَدۡ أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ﴾ [النساء: ٢١]، وە فەرمایشتی: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ﴾ [النساء: ٤]، هەروەها وەك فەرمایشتی: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا﴾ [البقرة: ٢٢٩]. گشتێتی ئەم ئایەتانە کراوەتە بەڵگە لەسەر نیکاحی موتعە، بێگومان ئەوە حەڵاڵ بووە لەسەرەتای ئیسلامدا، پاشان دوای ئەوە سڕراوەتەوە، شافیعی و کۆمەڵێك لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە لەسەرەتاوە ڕەوا کرابوو، پاشان دووجار نەسخ کراوەتەوە. کۆمەڵێکی دیکە وتوویانە: لەوە زیاتریش، وە کۆمەڵێك دیکە وتوویانە: لەسەرەتاوە ڕەوا بووە یەك جار، پاشان سڕراوەتەوە، دوای ئەوە ڕەوانەکراوەتەوە.

لە ئیبنو عەباس و کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە هاتووە وتوویانە: بۆ کاتی پێویستی ڕەوایە، ئەوە ڕیوایەتێکیشە لە ئیمام ئەحمەدەوە. ئیبنو عەباس و ئوبەی کوڕی کەعب و سەعیدی کوڕی جوبەیر و سوودی بەم شێوەیە دەیانخوێندەوە: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ﴾ واتە: ئەوانەی بۆ خۆشی لێوەرگرتن مارەتان کردوون بۆ ماوەیەکی دیاری کراو کرێکەیان بدەنێ بە فەرز.

موجاهید وتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی موتعە هاتۆتە خوارەوە، بەڵام جەماوەر لەسەر پێچەوانەی ئەوەن، پاڵپشتیشیان ئەوەیە چەسپاوە لەهەردوو سازەواردا لە پێشەوای باوەڕدارانەوە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کە وتوویەتی: پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) نیکاحی موتعەی قەدەغەکرد لەگەڵ خواردنی گۆشتی کەری ماڵی لە جەنگی خەیبەردا.

ئەو فەرموودەیە چەندەها زاراوەی بڕیار لەسەر دراوی هەیە لەناو کتێبەکانی ئەحکامدا.

له سازەواری موسلیمدا هاتووه له ڕەبیعی کوڕی سەبرەی کوڕی موعبەدی جوهەنی له باوکییەوه کە وتوویەتی: ڕۆژی کردنەوەی مەککە هاوبەش بووم پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "یا أیها الناس إنی قد کنت أذنت لکم فی الاستمتاع من النسا و وإن الله قد حرم ذلك إلی یوم القیامة فمن کان عنده منهن شی و فلیخل سبیله ولا تأخذوا مما آتیتموهن شیئًا". واته: ئەی خەڵکینه من لەوەو پێش ڕێمدابوو خۆشی له ژنان وەربگرن، بەڵام خوا ئەوەی حەرام کردووه، له ئەمڕۆوه هەتا ڕۆژی دوایی، جا هەر کەس شتێکی لەوانە لایە با ڕێگەی بدات بڕوات، وه هەرچیتان داوەتێ هیچی لێوەرمەگرنەوه، وه له ریوایەتێکی موسلیمدا هاتووه له حەجیماڵئاواییدا بووه کە چەند زاراوەیەکی هەیە له کتێبەکانی ئەحکامدا نووسراون.

﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾ هەر کەس ئەم ئایەتەی لەسەر نیکاحی موتعە داناوه بۆماوەیی دیاری کراوه وتوویەتی: تاوان نییە لەسەرتان کاتێ ماوەکە تەواو بوو درێژی بکەنەوه و مارەییەکەش زیاد بکەن، سوودی وتوویەتی: ئەگەر پیاوەکە بیەوێ دوای فەرزەکە ڕازی دەکات واته ئەو کرێیەت پێداوه لەسەر خۆشی وەرگرتن لێی پێش کۆتایی هاتنی ماوەکەی نێوانیان پێی دەڵێت دووباره لام بمێنەرەوه بۆ ماوەی ئەوەندە بەوەندە، بۆی زیاد دەکات پێش ئەوەی ڕەحمی بە پاك دابنێ پێش تەواوبوونی ماوەکە ئەویش فەرمایشی: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾ سوودی وتوویەتی: کاتێ ماوەکە تەواو بوو ئیتر ڕێگای دەست بەسەراگرتنیا نامێنێ ئەویش بەری دەبێ لەو پیاوە، وه لەسەریێتی ڕەحم پاکی خۆی بۆ دەربخات کە میراتیان له نێوانیاندا نەبێت. ئەو کاتە هەریەکەیان میراتی ئەویتریان ناگرێت. وه هەر کەس وتەی یەکەم ئەکاتە بەڵگە واتاکەی وەك ئەم ئایەتە لێ دەکات: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً﴾، واته کاتێ مارەییەکت بۆ دانا ئەگەر گەردنی ئازاد کردی لێیان له شتێك لێی، تاوان نییە بۆت یان بۆی لەو کارەدا.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحه له ئیبنو عەباسەوه دەگێڕێتەوه کە فەرمایشی: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾ ڕازیبوونەکە ئەوەیە کە

مارەییەکەی بداتێ، پاشان ئارەزووی بداتە دەستی خۆی واتە لە مانەوەو جیابوونەوەدا، وە فەرمایشی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ گونجاوە باسکردنی ئەو دوو وەسفە دوای دانانی ئەو حەرامانە.

﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾﴾

واتە: کێش دەستتەنگە و ئەوماڵەی بۆ هەڵناسووڕێ کە ژن خاوەن باوەڕی ئازاد بێنێ با لەو کیژە باوەڕدارانە بوونەتە هۆی خۆتان مارە بکات، خوداش لە هەر کەس زیاتر لە بڕواتان ئاگادارە هەمووتان ئێرەیی یەکترن بە دەستووری خاوەنیان مارەیان بکەن چۆن باوە لەناو خۆتاندا مارەییان بۆ ببڕنەوە ئەوانیش با کەنیزانی داوێن پاك بن نە داوێن تەڕ لە ژێرەوە دوستی نێرینە یان نەبێ، بەڵام ئەگەر لە پاش ئەوەی هاتنەبەر ڕکێفی ئێوە دەستیان لەگەڵ پیاوی نا مەحرەم تێکەڵ کردنی ئازاردانیان نیوەی ئەو ژنانە دەبێ کە شوویان هەیە و ئازادن، ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە ڕەبەنی ئازاریان دەدات، ئەگەر ئێوە خۆڕاگر بن بێگومان بۆتان باشترە خودا لە هەڵە دەبورێ و دلۆڤانە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿طَوْلًا﴾ واتە: ماڵ و توانای ﴿أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ واتە: ئازادەکان و داوێن پاکەکان و باوەڕدارەکان.

ئیبنو وەهەب وتوویەتی: عبدالجبار لە ڕەبیعەوە بۆی گێڕامەوە ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ﴾، ڕەبیعە وتوویەتی: درێژی ئارەزوو، واتە کەنیزەك مارە بکات ئەگەر ئارەزووەکەی لەسەر ئەوە بوو، ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو جەریر گێڕاویانەتەوە، پاشان هێرش دەکاتە سەر ئەو قسەیە ڕەدی دەکاتەوە ﴿فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ واتە لە کەنیزەکە

باوەڕدارەکان بهێنن ئەوانە موڵکی خۆتانن و باوەڕدارن، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ﴾ ئیبنو عەباس و جگە لە ئەویش وتوویانە: با کەنیزەکە باوەڕدارەکان مارە بکات. سوودی و موقاتیل و ئیبنو حیبان هەر ئەوەیان وتووە.

پاشان ڕێی گرتووە بە فەرمایشی ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِكُم بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ﴾ واتە: خوا زانایە بە ڕاستی کارەکان و نهێنییەکانی بە ڕاستی ئەی خەڵکینە ڕواڵەت لە فەرمانەکانیدا بۆ ئێوەیە، پاشان ﴿فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ﴾ ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گەورە وەلی کەنیزەکەکەیەتی بە فەرمانی ئەو نەبێت مارە ناکرێت، هەروەها گەورە وەلی بەندەکەیەتی بۆی نییە ژن بهێنێ بە فەرمانی ئەو نەبێت وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "لا تزوج المرأة ولا المرأة نفسها فان الزانية هي التي تزوج نفسها" واتە: ژن نابێ ژن بدات بە مێرد، وە ژن نابێ خۆی مارە بکات، ئەو ئافرەتەی خۆی مارە بکات زیناکارە، وە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ واتە: مارەییەکەیان بدەنێ بەشێوەیەکی چاك واتە بە دڵی فراوانەوە هیچیان لێ کەم مەکەنەوە کە ئیهانە بێت بۆیان، لەبەر ئەوەی کەنیزەکن، وە کە دەفەرمووێت: ﴿مُحْصَنَـٰتٍ﴾ واتە: داوێن پاك و دوور لە خراپەکاری، لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿غَيْرَ مُسَـٰفِحَـٰتٍ﴾ ئەوانەش کە هەر کەس بیەوێ خراپەیان لەگەڵدا بکات ڕێی لێناگرن، وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾، واتە: دۆستگر نەبن و دۆستیان نەبێ، کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە مارەکردنی ئەوانە هەتا لەسەر ئەو بارودۆخە بن.

﴿فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَـٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَـٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ﴾ خوێنەرانی قورئان جیاوازییان هەیە لەسەر وشەی (احصن) هەندێکیان بۆ هەمزەکە بۆر دادەنێن و صادەکە ژێر، وە سەر دانان بۆ هەمزەکە و صادەکە، پاشان واتراوە: هەردوو خوێندنەوەکە یەکن.

لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەربارەی ﴿فَإِذَآ أُحْصِنَّ﴾ فەرموویەتی: (احصانها اسلامها وعفافها) واتە: داوێن پاکییەکەی موسڵمان بوونێتی و داوێن پاکی. مەبەستی لێرەدا هاوسەرگیریی کردنە.

قاسم و سالم وتوویانە: داوێن پاکییان موسڵمانبوونیانە، وە وتراوە لێرە مەبەست هاوسەرگیرییانە، ئەوەش قسەی ئیبنو عەباس و موجاهید و عەکریمە و تاووس و سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەن و قەتادە و غەیری ئەوانیشە.

ئەبو عەلی تەبەری لە کتێبی (الإیضاح) دا لە شافیعییەوە نەقڵی دەکات.

موجاهید وتوویەتی: داوێن پاکی کەنیزەك مارە کردنێتی لەلایەن پیاوێکی ئازادەوە و داوێن پاکی بەندە ئەوەیە کە ئافرەتێکی ئازاد مارە بکات.

ئەوەی ڕاستی بێت وشەی (احصان) داوێن پاکی هاوسەرگیرییانە، چونکە سیاقی ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەری، خوای پاك و بێگەرد دەفەرمووێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، ئیتر خوا زاناترینە.

ئایەتە پیرۆزەکە هەمووی سیاقەکەی دەربارەی کەنیزەکە باوەڕدارەکانە، ئەوە دیاری دەکات کە مەبەست لە فەرمایشتی: ﴿فَإِذَآ أُحْصِنَّ﴾ واتە: کە مێردەکەیان کرد، وەك ئیبنو عەباس و شوێنکەوتوانی ڕاڤەیان کردووە.

لەسەر هەموو دوو قەولەکە ئیشکال هەیە لەسەر بۆچوونی جەماوەر، لەبەر ئەوەی ئەوان دەڵێن: ئەگەر کەنیزەك زینای کرد ئەبێ پەنجا جەڵدی لێ بدرێ، موسڵمان بێت یان بێ باوەڕ، شووی کردبێت، یان کچ بێت. لەگەڵ ئەوەی چەمکی ئایەتەکە ئەوە پێویست دەکات کە موحصن نەبێت حەدی شەرعی لەسەر نییە کاتێ زینا بکات، وە وەڵامەکانیان لەسەر ئەوە جیاوازە. جەماوەر وتوویانە: مەنطوق پێش مەفهوم دەخرێت، چەندەها فەرموودەش هاتووە دەربارەی جێبەجێکردنی حەددی شەرعی بەسەر کەنیزەکدا.

لەوانە ئەوەیە کە موسلیم لە سازەوارەکەیدا لە عەلییەوە دەگێڕێتەوە کە لە وتارێکیدا وتوویەتی: ئەی خەڵکینە حەددی شەرعی بەسەر بەندەکانتاندا جێبەجێ بکەن ئەوانەی هاوسەرگیرییان کردووە یان نا، چونکە کەنیزەکێکی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) زینای کرد، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمانی پێ کردم جەڵدی لێ بدەم، سەیرم کرد تازە منداڵی بووە، ترسام ئەگەر جەڵدی لێ بدەم بمرێ، ئەوەم بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)

گێڕایەوە، فەرمووی: چاکت کرد، وازی لێ بهێنە هەتا چاك دەبێتەوە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە فەرموویەتی: ئەگەر هەڵساوە لە زەیستانی یەکەمی پەنجا داری لێ بدە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إذا زنت أمة أحدكم فتبين زناها، فليجلدها الحد ولا يثرب عليها، ثم إن زنت الثانية فليجلدها الحد ولا يثرب عليها، ثم إن زنت الثالثة فتبين زناها، فليبعها ولو بحبل من شعر"، ولمسلم "إذا زنت ثلاثا فليبعها في الرابعة". واتە: ئەگەر کەنیزەکی یەکێ لە ئێوە زینای کرد و زیناکەی ئاشکرا بوو با داری حەدی لێ بدات و سەرزەنشتی نەکات، ئەگەر بۆ جاری دووەم زینای کردەوە با داری حەدی لێ بدات و سەرزەنشتی نەکات، وە ئەگەر بۆ جاری سێیەم زینای کردەوەو زیناکەی ئاشکرا بوو با بیفرۆشێ ئەگەر بە گوریسێکی موو بووە، وە لای موسلیم هاتووە ئەگەر بۆ جاری سێیەم زینای کردەوە با لە چوارەم جاردا بیفرۆشێ. لە ئەبی ڕەبیعەی مەخزومییەوە هاتووە وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب فەرمانی پێکردم کە دووجار بەندەیەك جەڵد بکەم لەسەر دوو جار زیناکردن بە داری ئیمارە پەنجا پەنجا.

وەڵامی دووەم: وەڵامی کەسێك بۆ ئەوە چووە کە کەنیزەك کاتێ زینای کرد و هاوسەری نەبوو حەددی لەسەر نییە، بەڵکو بۆ ڕەوشت چاك کردنی لێی دەدرێ ئەوەش لە ئیبنو عەباسەوە گێڕراوەتەوە.

تاووس و سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەبو عوبێد قاسمی کوڕی سەلام و داودی کوڕی عەلی زاهیری لە ڕیوایەتێکدا بۆ ئەوە چوون و پشتیشیان بە مەفهومی ئایەتەکە بەستووە کە ئەویش لە مەفهومەکانی مەرجە. ئەوەش حوججەیە لای زۆر لە زانایان پێش گشتێتی ئەخرێ لای ئەوان، وە حەدیسەکەی ئەبی هورەیرە و زەیدی کوڕی خالید (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویانە: دەربارەی کەنیزەکێ بێ هاوسەر کاتێ زینا بکات لە پێغەمبەریان (درودی خوای لێ بێت) پرسی، فەرمووی: "إن زنت فحدوها ثم إذا زنت فاجلدوها ثم بيعوها ولو بضفير"، واتە: ئەگەر زینای کرد داری حەددی لێ بدەن، پاشان ئەگەر زینای کرد جەڵدی بکەن و پاشان بیفرۆشن ئەگەر بە پەتێك بووە، وە لە ئیبنو

عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لیس علی أمة حد حتی تحصن ـ أو حتی تزوج ـ فاذا أحصنت بزوج فعلیها نصف ما علی المحصنات"، واتە: کەنیزەك حەدی لەسەر جێبەجێ ناکرێ هەتا مێرد نەکات ئەگەر مێردی کرد نیوەی ئەو حەددەی لەسەر کە لەسەر خاوەن مێردێکی ئازاد هەیە.

فەرمایشی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ﴾ واتە: بەمەرجی پێشوەخت مارەکردنی کەنیزەك ڕەوایە بۆ ئەو کەسانەی لە خۆیان دەترسن تووشی زیناکردن ببن، وە لەسەری گران بێت خۆی بگرێ داوێن پیسی نەکات و تووشی تاوان ببێت بە هۆی ئەوانەوە، ئیتر ئەو کاتە بۆی هەیە کەنیزەك مارە بکات، وە ئەگەر لە هێنانی ئەوە هێناو خۆی گرت لە زینا کردنەوە خێرە بۆی، چونکە ئەگەر مارەی بکات منداڵەکانی کۆیلە دەبن بۆ گەورەکەی مەگەر مێردەکە عەرەب بێت منداڵەکانی ئەو کاتە کۆیلە نابن لە قسەی کۆنی شافیعیدا لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾.

